

بەرهەم و نووسراوەکانی مامۆستا ئەحمەد کاکە مەحموود (٥)

# وەڵامی گومان و چەواشەکاریی

## ناحەزانی ئیسلام

نووسینی: ئەحمەد کاکە مەحموود

کۆکردنەوە و لێکۆڵینەوەی:
عیرفان ئەحمەد کاکە مەحموود





زنجیرەی بەرهەم و نووسراوەکانی مامۆستا ئەحمەد کاکە مەحموود (٥)

# وەڵامی گومان و چەواشەکاریی ناحەزانی ئیسلام

وەڵامدانەوەی:
**مامۆستا ئەحمەد کاکە مەحموود**
"ڕەحمەتی خوای لێبێت"

کۆکردنەوەو خوێندنەوەو لێکۆڵینەوەی:
**عیرفان ئەحمەد کاکە مەحموود**

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

## پێناسی ئەم کتێبە


**ناوی کتێب: وەڵامی گومان و چەواشەکاری ناحەزانی ئیسلام.**

**نووسینی: مامۆستا مەلا ئەحمەد کاکە مەحموود (ڕەحمەتی خودای لێبێت).**

**کۆکردنەوەو خوێندنەوەو لێکۆڵینەوەی: عیرفان ئەحمەد کاکە مەحموود.**

**نۆرەی چاپ و ساڵی چاپ: چاپی یەکەم/ ١٤٣٩ی کۆچیی – ٢٠١٨ی زایینی.**

**تیراژ: ١٠٠٠ دانە**

**دیزاینی بەرگ: ناوەندی ڕێنوێن**

**نوخشەسازی ناوەوە: مەهرین دیزاین**

**ژمارەی سپاردن (٢٠٠)ی کتێبخانە گشتییەکانی ساڵی ٢٠١٧ی پێدراوە.**

**چاپخانە: ناوەندی ڕێنوێن.**

## لە بڵاوکراوەکانی پرۆژە بانگەوازییەکانی مامۆستا ئەحمەد کاکە مەحموود

| | | | |
|---|---|---|---|
| -١ | تەفسیری ڕامان لە ماناو مەبەستی قورئان | ئەحمەد کاکە مەحموود | چاپی پێنجەم |
| -٢ | ژیان و بەرهەم و تێکۆشانی مامۆستائەحمەد کاکە مەحموود | عیرفان ئەحمەد کاکە مەحموود | چاپی یەکەم |
| -٣ | کێشە کۆمەڵایەتیەکان و چارەسەریان لە ئیسلامدا | ئەحمەد کاکە مەحموود | چاپی یەکەم |
| -٤ | ژنان و کاروباری ژنان لە ئیسلامدا | ئەحمەد کاکە مەحموود | چاپی یەکەم |
| -٥ | ٧٠٠ پرسیارو وەڵامی شەرعی تایبەت بەئافرەتان | ئەحمەد کاکە مەحموود | چاپی یەکەم |
| -٦ | وەڵامی گومان و چەواشەکاری ناحەزانی ئیسلام | ئەحمەد کاکە مەحموود | چاپی یەکەم |
| -٧ | وتەی زاناکان و باوەڕ بەخوا | ئەحمەد کاکە مەحموود | چاپی یەکەم |
| -٨ | سیاسەت لە ئیسلامدا | ئەحمەد کاکە مەحموود | چاپی دووەم |
| -٩ | بۆچوون و فەتواکانی مامۆستا ئەحمەد کاکە مەحموود | ئەحمەد کاکە مەحموود | ئامادەی چاپە |
| -١٠ | التربية بالعقيدة وأثرها التربوي | عرفان أحمد كاكه محمود | الطبعة الأولى |

# پێشەکی ئەم پەرتووکە

**الحمدلله، والصلاة والسلام على من لا نبي بعده..**

خوێنەری بەڕێز: لە زنجیرەی (٥) پێنجەمی بەرهەم و نووسراوەکانی مامۆستا مەلا ئەحمەد کاکە مەحموود (ڕەحمەتی خوای لێبێت) بە خزمەتتان دەگەینەوە لە گرنگترین بابەت و نووسراوی مامۆستادا، ئەم بابەتەی بەر دەستتان لە چەند بابەت و وەڵامێکی جیا جیا پێکهاتووەو جەنابی مامۆستا ئەحمەد (بەرەحمەت بێت) بەپێی کات و پێویستی رۆژ، بۆ هەر پرسیارو وروژاندنێکی گومان و چەواشەکاریی ناحەزانی ئیسلام، وەڵامی ئەو گومانانەی داوەتەوەو بۆ سەردەم و کاتی خۆی پڕ بە پڕ دەمکوتی ناحەزانی کردووە و بەپێی سەرچاوەو دەسکەوتنەکانی ئەوکات، ساڵەکانی (١٩٨٠ بۆ ٢٠٠٠ ز) مامۆستا توانیویەتی وەك پێویست وەڵامی ئەو شوبهانە بداتەوە، ئێمەش بە پێویستمان زانی ئەو وەڵامانە کۆ بکەینەوەو دوای خوێندنەوەو وردبینی و لێکۆڵینەوەی فەرموودەکان لە دوو توێی ئەم کتێبەدا بیخەینە بەردەست خوێنەران و دڵسۆزانی ئیسلام، هەرچەند لەم سەردەمەی ئێستاماندا وەڵام گەلێکی زۆری ناحەزان و دوژمنانی ئیسلام دراوەتەوە بەشێوەیەکی ئەکادیمیی و بەڵگە گەلێکی بەهێزتر دەمکوتی ناحەزان کراوە، بەڵام وەك هەڵوێست و جوامێری مامۆستا ئەحمەد کاکە مەحموود لەو بوارەداو پاراستنی بەرهەم و نووسراوەکانی، ئەم بەرهەمە دەخەینە بەر دەستتان بەو هیوایەی گەنجان و لاوانی ئیسلامپەروەر ئەم بەرهەمەی مامۆستا بکەنە دیباجەیەك بۆ وەڵامدانەوەی ناحەزان و دوژمنانی ئیسلام و کەڵك و سوودی لێوەربگرن.. خوای گەورە بیکاتە توێشوو بۆ قیامەتی مامۆستاو دەروازەیەکیش بێت بۆ سوود وەرگرتن لە چۆنیەتی وەڵامدانەوەی ناحەزانی ئیسلام..

**عیرفان ئەحمەد کاکە مەحموود**

**سەرپەرشتیاری پرۆژەکانی مامۆستا ئەحمەد کاکە مەحموود**

**سلێمانی / ١٣ ی شەوالی ١٤٣٩ ک – ٢٧ / ٦ / ٢٠١٨ زایینی**

**www.ahmadkaka.org**

**erfankaka77@gmail.com**

**٠٧٧٠٢٤٩٣٧٥٥ / ٠٧٥٠١١١٥٩٩٠ – سلێمانی**

# لادانی گومان لەسەر
# ئازادی مرۆڤ لـــە ئیســلامــدا

- له بیرو بۆچووندا .
- له هەڵبژادرنی ئایین و مەزهەبدا .
- له نەیاریی و ڕەخنەگرتندا .
- له نیشتەجێبوون و گواستنەوەدا .

**ئەم بابەتە بۆ یەکەم کۆنگرەی زانستیی کۆلیجی خوێندنی ئـایینی کۆیە لـەژێر دروشـمی (ئـایینی ئیسـلام هـەمووی مرۆڤایەتییـە) دەربارەی (مافی مرۆڤ لە ئیسلامدا) لە لایەن بەڕێز مامۆسـتا مـەلا ئەحمەد کاکە مەحموود لە (٢٠/١٠/٢٠٠٥) زایینی ئامادە کراوە.**

﴿ وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِيٓ ءَادَمَ وَحَمَلْنَٰهُمْ فِي ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ وَرَزَقْنَٰهُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَفَضَّلْنَٰهُمْ عَلَىٰ كَثِيرٍ مِّمَّنْ خَلَقْنَا تَفْضِيلًا ﴾ (الإسراء: ٧٠ ).

## دەسپێک:

لە دیدی ئایینی پیرۆزی ئیسلامدا، مرۆڤ خاوەن رۆحێکی زۆر مەزن و گرنگە، زۆر بە رێزو بە حورمەتە، چونکە:

**یەکەم**: هەر وەکو خوای بەتوانای بالآدەست بۆخۆی بەدیهێناوە، هەرئاوا بۆخۆیشی کردوویەتی بە جێنشین و، نەوە دوای نەوە دێنێ بۆ پیادەکردنی عەدل و عەدالەت لەم دنیایەدا: ﴿ وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّي جَاعِلٌ فِي ٱلْأَرْضِ خَلِيفَةً... ﴾ (البقرة: ٣٠) .

**دووەم**: کاروباری زەویی و ئاوەدانکردنەوەی رووی زەویی - لە هەموو رۆژ گارێکدا - لە رووی پێشەسازیی و تەکنەلۆجیاو، کشتوکاڵ و، باخ و باخداریی و، مەڕو پاتاڵ و ئاژەڵداریی، بگرە سەرجەم پێداویستیەکانی ژیانی مرۆڤ - خستۆتە سەرشانی ئەو، بۆیە لە سوورەتی (هوود) دا دەفەرموێ: ﴿ ....هُوَ أَنشَأَكُم مِّنَ ٱلْأَرْضِ وَٱسْتَعْمَرَكُمْ فِيهَا .... ﴾ (هود: ٦١) واتە: ئەو خۆی ئێوەی لە زەوی بەدیهێناو، ئاوەدانکردنەوەیشی لە ئێوە ویست، دەبێ ئێوەش خۆتان بکۆشن و بزانن بژێویتان لە چیدایە، هەوڵی بۆ بدەن، وڵات و نیشتمان و رۆڵەکانی نیشتمانتان پێویستی بە چ کشتێك و، چۆن بەرووبووی زۆر دەبێ و خاوەن پیت دەبێ، ئەوە بەرهەم بێنن و بەو جۆرەش پەروەردەی بکەن، وە لە سوورەتی (مولك) دا دەفەرموێ: ﴿ هُوَ ٱلَّذِي جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَرْضَ ذَلُولًا فَٱمْشُواْ فِي مَنَاكِبِهَا وَكُلُواْ مِن رِّزْقِهِۦ وَإِلَيْهِ ٱلنُّشُورُ ﴾ (الملك:١٥). واتە: هەر خوای گەورەیە ئەم زەوییەی بۆ کەویی و رامکردون، جا ئێوەش - زۆر بە جیددی و لێبڕاوانە - کون و قوژبنی بگەڕێن و، لە رۆزیی و بژێوییەکەی بخۆن، هەستانەوەشتان - پاش مردن - هەر بۆلای ئەوە، ئەوساش لە وردوو درشتی کاروکردەتان دەپرسێ.

**سێیەم**: لەو (رۆح)ـەی خۆی نەبێ بزانێ چییە: ﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلرُّوحِ قُلِ ٱلرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّي ... ﴾ (الإسراء: ٨٥) گیانی بە بەرا کردووە و دەیژییەنێ، ئایەتی: ﴿ فَإِذَا سَوَّيْتُهُۥ وَنَفَخْتُ فِيهِ مِن رُّوحِي فَقَعُواْ لَهُۥ سَٰجِدِينَ ﴾ (ص:٧٢). ئەوەمان پێدەڵێت.

**چوارەم**: هەر بەدەستی خۆی دروستیکردووە، فەرمانی بە فریشتە نەکردووە رێکی بخەن، بەڵکو هەر خۆیی و هەر بەدەستی خۆی ئایەتی: ﴿ قَالَ يَٰٓإِبۡلِيسُ مَا مَنَعَكَ أَن تَسۡجُدَ لِمَا خَلَقۡتُ بِيَدَيَّۖ أَسۡتَكۡبَرۡتَ أَمۡ كُنتَ مِنَ ٱلۡعَالِينَ ﴾ (ص: ٧٥). ئەو راستییەمان بۆ دەخەملێنێ.

**پێنجەم**: لە رووی جێ و رێی ئەنواو حەوانەوە بۆ بەهەشتی دروستکردووە، ئایەتی: ﴿ وَقُلۡنَا يَٰٓـَٔادَمُ ٱسۡكُنۡ أَنتَ وَزَوۡجُكَ ٱلۡجَنَّةَ .... ﴾ (البقرة: ٣٥). ئەوە دەڵێت.

**شەشەم**: پاکترین جۆری درووستکراوەکانی خوا کە (فریشتە) یە، سوژدەی رێزو حورمەتیان بۆ برد: ﴿ وَإِذۡ قُلۡنَا لِلۡمَلَٰٓئِكَةِ ٱسۡجُدُواْ لِأٓدَمَ فَسَجَدُوٓاْ إِلَّآ إِبۡلِيسَ أَبَىٰ وَٱسۡتَكۡبَرَ وَكَانَ مِنَ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴾ (البقرة: ٣٤).

**حەوتەم**: خوا بۆخۆی ناوی هەمووشتێکی فێر کرد: ﴿ وَعَلَّمَ ءَادَمَ ٱلۡأَسۡمَآءَ كُلَّهَا .... ﴾ (البقرة: ٣١).

**هەشتەم**: وای دروستکردووە بتوانێ (خێر) و(شەڕ) لێك بكاتەوە و یەكێكیان بە ئارەزووی خۆی هەڵبژێرێ، وەکو دەفەرموێ: ﴿ إِنَّا هَدَيۡنَٰهُ ٱلسَّبِيلَ إِمَّا شَاكِرٗا وَإِمَّا كَفُورًا ﴾ (الإنسان: ٣).

**نۆیەم**: ئەوەندە ژیرو بە تەوانای دروستکردووە، تێڕوانین و پشکنینی ئاسمانەکانی لە ئەستۆ ناوە: ﴿ أَفَلَمۡ يَنظُرُوٓاْ إِلَى ٱلسَّمَآءِ فَوۡقَهُمۡ كَيۡفَ بَنَيۡنَٰهَا وَزَيَّنَّٰهَا .... ﴾ (ق: ٦).

یـان دەفـەرموێ: ﴿ سَنُرِيهِمۡ ءَايَٰتِنَا فِي ٱلۡأٓفَاقِ وَفِيٓ أَنفُسِهِمۡ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمۡ أَنَّهُ ٱلۡحَقُّ ... ﴾ (فصلت: ٥٣). مرۆڤ لە دیدو بۆچونی ئیسلامدا ئەوەیەو، سەد ئەوەندەی تریش، کەوابوو هەر لە بنەڕەتدا وەچاخزادەو وەچەو نەوەی پێغەمبەرەو، صالح وچاك وپاكە.. نەك وەكو مولحید و خوانەناسەکان کە پێیان وایە مەیموونزادەیە!. بێ شك هەرگیز مرۆڤێکی دروستکراوی ئاوای دەستی خوا، بێ ماف وهەق وهقوق نابێ و گشتیشیان لە مافدا یەکسانن، مرۆڤی سپی پێست و رەش پێست و گشت جۆرەکانی تری وەکو یەکن، مرۆڤی عەرەبیی رەگەزو، کورد رەگەزو سەرجەم رەگەزەکانی تر، لەبەردەم

ئەرك و مافدا چوون یەكن، سەرۆكی وڵاتێكی ئیمپراتۆرو تاكێكی ئەو وڵاتە لەبەردەم یاسادا یەكسانن، ئەگەر مافی مرۆڤ ساڵی (١٩٤٨) لە لایەن نەتەوە یەكگرتووەكانەوە پەسەندكرابێ و راگەیەنرابێ، خۆ پێغەمبەری ئیسلام (محمد) بەر لە (١٤٢٥) ساڵ، مافی مرۆڤی ڕاگەیاندووەو فەرموویەتی: ((كل المسلم على المسلم حرام: دَمُهُ، ومالُهُ، وعِرْضُه))[١] . ڕێگایشی پێداوە كە هەر كەسێك بیەوێ ئەو مافانەی لێ زەوت بكات، جەنگی لەگەڵ بكات، ئەگەر بگاتە كوشتنیش: ((من قاتل دون ماله فهو شهيد،[٢] ومن قاتل دون دمه فهو شهيد،[٣] ومن قاتل دون عرضه فهو شهيد،[٤] ومن قتل دون مظلمته فهو شهيد[٥])) ئەم فەرموودە ئەگەرچی تایبەتە بە موسڵمانانەوە، بەڵام بێ شك كووشتنی هەر مرۆڤێكی تری غەیرە موسڵمان بە ناهەق و، خواردنی ماڵ و سامانیی و، دەستدرێژیی بۆ ناموسی، حەرام و قەدەغەیە، ئەوەیە كەخوای میهرەبان دەفەرموێ:

﴿مِنْ أَجْلِ ذَٰلِكَ كَتَبْنَا عَلَىٰ بَنِي إِسْرَائِيلَ أَنَّهُ مَن قَتَلَ نَفْسًا بِغَيْرِ نَفْسٍ أَوْ فَسَادٍ فِي الْأَرْضِ فَكَأَنَّمَا قَتَلَ النَّاسَ جَمِيعًا وَمَنْ أَحْيَاهَا فَكَأَنَّمَا أَحْيَا النَّاسَ جَمِيعًا .... ﴾ (المائدة: ٣٢).

كورتتر بڵێین: ئایینی پیرۆزی ئیسلام هەموو مافێكی مرۆڤی دابینكردووە، وە بەرگریشی لێدەكات، خودی ئینسان خۆیی و جەستەیی و تایبەتمەندییەكانی و خێزانیی و، شەرەفیی و ماڵ و سامانیی و كەرامەتیی و، هەروا رێ و شوێنیی و، لە هەر جێگایەك نیشتەجێ دەبێ... هتد.

بەڕێزان! ئەمە دەسپێكێك بوو بۆ چوونە ناو تەوەرەی باسەكەمانەوە: (مافی ئازادی مرۆڤ لە رووی:

---

(١) صحيح مسلم – كتاب البر والصلة والآداب، باب تحريم ظلم المسلم – حديث : ٤٧٥٥.

(٢) صحيح، صححه الألباني في سنن النسائي برقم: ٤٠٩١.

(٣) صحيح، صححه الألباني في سنن النسائي برقم: ٤٠٩٤.

(٤) بەم لەفزە "دون عرضه" نەهاتووە، بەڵام بە لەفزی "دون أهله" هاتووە، تیرمیزی ریوایەتی كردووەو دەشفەرموێ: هذا حديث حسن صحيح، (ومن قتل دون أهله فهو شهيد)، وصححه الالباني فى الجامع الصحيح لسنن الترمذي برقم: ١٤٢١.

(٥) صحيح، صححه الألباني فى صحيح الجامع برقم: ٦٤٤٧.

١- دەر بڕینــی بــیروو بۆچــوون و هەڵبــژاردنی ئــایین و مەزهــەب و، مــافی نــەیاریی و ڕەخنەگرتن.

٢- مافی نیشتەجێبوون و گواستنەوە. هیوادارم توانیبیتمـان- وەكـو ڕێخۆشـكردنێك- دەرگا لە تەوەرەی باسەكەمان والاّ بكەین و، لێرەوە بچینە ناو باسەكەمان.

## ئازادی مرۆڤ لــە بیرو بۆچووندا:

ئایینی پیرۆزی ئیسلام، ئایینی سەربەستیی و ئـازادیی و چاوپۆشـییە، بـەبێ دانـانی هیچ لەمپەرێك مرۆڤی ئازاد كردووە- لە هەموو بوارێكدا - بە ئازادانە بیربكاتەوەو، ئـەم بوونەوەرە هەڵسەنگێنێ و بگەڕێ بۆ دۆزینەوەی بەدیهێنەرەكەی، پاشان بە دڵنیایی و بـەدڵ ئاسـوودەیی، وە دوور لــە هــەر گوشـارێك خـۆ تەسـلیم بكـات بـە خاوەنەكـەی، ئەوساش لە پێناویا تێدەكۆشێ و تەسلیم بە هیچ هێزێكی دەرەكیی و لاوەكیی نابێت.

بەڵێ یەكـەم هـەنگاوێك دینـی ئیسـلام هاویشـتی، ئـازادكردنی تـاك و كۆمـەڵ بـوو لـە بەندایەتیی و كۆیلەیەتی بۆ دەسەلأتدارانی دنیا خۆران، پاشان پێیگوتن هـەمووتان لـە ئادەمن و، (ئادەم)یش عليه السلام لـە گڵـە، كـەوابوو لـە نێـوان وەچـەو نەوەكانیـدا هەنـدێكی كوێخا نییەو، هێندێكیشی ژێر دەستەو ڕەعیەت، یان هەندێ ئاغاو، هەندێ نۆكەر، یان هەندێ پاشاو، هێنـدێ بـێ شـیو و بەنـدە، نـا .. بـەڵكو لـە بنەڕەتـدا كـەس لـە كـەس گەورەتر نییە، مەگەر بە ڕەوشتی بەرزو ئەخلاقی شیرین و، خزمـەتكردنی دیـن و وڵات و نیشـتمان، ئـەم ئایەتـەی بەردەسـتمان كـە دەفـەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقۡنَٰكُم مِّن ذَكَرٖ وَأُنثَىٰ وَجَعَلۡنَٰكُمۡ شُعُوبٗا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓاْۚ إِنَّ أَكۡرَمَكُمۡ عِندَ ٱللَّهِ أَتۡقَىٰكُمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٞ ﴾ (الحجــــرات: ١٣).

جەخت لەسەر ئەو ڕاستییە دەكاتەوە.. بـەڵێ قورئـانی پـیرۆز هەمیشـە خەڵكـە بینـاو خاوەن هۆشەكان، دنـە دەدات بـۆ بیركردنـەوە — بـە ئازادانـە — لـە دروسـتكراوەكانی خوای گەورەو سەرنجدان لێیان كە: ئـاخۆ هـیچ كـەم وكـورتیی و ناتەواوییـەكیان تێـدا دەبیـنن؟ دیـارە نـابینن، بۆیـە دەفـەرموێ: ﴿ ٱلَّذِي خَلَقَ سَبۡعَ سَمَٰوَٰتٖ طِبَاقٗاۖ مَّا تَرَىٰ فِي خَلۡقِ

ٱلرَّحۡمَٰنِ مِن تَفَٰوُتٖۖ فَٱرۡجِعِ ٱلۡبَصَرَ هَلۡ تَرَىٰ مِن فُطُورٖ ﴾ (مولك:٣). دووبارە بۆ تەحەددی کافران و خوا نەناسان دەفەرموێ: ﴿ فَٱرۡجِعِ ٱلۡبَصَرَ هَلۡ تَرَىٰ مِن فُطُورٖ ٣ ثُمَّ ٱرۡجِعِ ٱلۡبَصَرَ كَرَّتَيۡنِ ﴾ (الملك: ٤ –٣) واتە: حەزدەکەیت جارێکی ترو جارێکی تر بەوردی تەماشا بکە، ئاخۆ قڵیشێکی تێدایە..؟ دەسا بچۆ بە ئازادانە بیربکەوەو تەماشاکە، پاشانیش هەر بە ئازادانە وەڵامی خۆت بدەوە.! هەر وەك سەرکۆنەی ئەوانە دەکات کە بیرو هۆشی خۆیان لەکار دەخەن و بە ئازادانە –لەبەر هەر هۆیەك بێت- بیر ناکەنەوە، تەماشای ئەوانە بکە کە لە دنیادا خۆیان زەلیلی ژێر دەستی دەسەلاَتداران دەکەن، چۆن لە قیامەتدا بەیانی هۆکاری تووشبوونی خۆیان دەکەن و دەڵێن: ﴿ وَقَالُواْ رَبَّنَآ إِنَّآ أَطَعۡنَا سَادَتَنَا وَكُبَرَآءَنَا فَأَضَلُّونَا ٱلسَّبِيلَا۠ ﴾ (الأحزاب: ٦٧). واتە: ئەی پەروەردگارمان! ئێمە بیرو بۆچوونی خۆمانمان نەخستەگەڕ بۆ دۆزینەوەی هەق وراستیی - بەڵکو بەکوێرانە - دوای ئاغاو سەر زلەکانمان کەوتین، دەرەنجام ئەوانیش بەم شێوەیە گومڕاو سەرلێشێواویان کردین. وە لە سوورەتی (مائیدە)شدا بۆ جەخت لەسەر هەمان مەبەست دەفەرموێ:

﴿ وَإِذَا قِيلَ لَهُمۡ تَعَالَوۡاْ إِلَىٰ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ وَإِلَى ٱلرَّسُولِ قَالُواْ حَسۡبُنَا مَا وَجَدۡنَا عَلَيۡهِ ءَابَآءَنَآۚ أَوَلَوۡ كَانَ ءَابَآؤُهُمۡ لَا يَعۡلَمُونَ شَيۡـٔٗا وَلَا يَهۡتَدُونَ ﴾ (المائدة: ١٠٤). واتە: کاتێ پێیان بگوترێ: بەرەو ئەو پەیامە وەرن کەخوا دایبەزاندووە، وە بەرەو پێغەمبەر وەرن، بێ هیچ بیرکردنەوەیەك دەڵێن: ئێمە هەر ئەو دین و ئایینەمان بەسە کە باوو باپیرانمان لە سەری بوون، خۆ بێگومان باب و باپیرانیان هیچیان لە راستیی نەدەزانیی و، رێگەی هەقیان دەر نەدەکرد! وە لە سوورەتی(ئەعراف) یشدا هاتووە: ﴿ وَلَقَدۡ ذَرَأۡنَا لِجَهَنَّمَ كَثِيرٗا مِّنَ ٱلۡجِنِّ وَٱلۡإِنسِۖ لَهُمۡ قُلُوبٞ لَّا يَفۡقَهُونَ بِهَا وَلَهُمۡ أَعۡيُنٞ لَّا يُبۡصِرُونَ بِهَا وَلَهُمۡ ءَاذَانٞ لَّا يَسۡمَعُونَ بِهَآۚ أُوْلَٰٓئِكَ كَٱلۡأَنۡعَٰمِ بَلۡ هُمۡ أَضَلُّۚ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡغَٰفِلُونَ ﴾(الأعراف: ١٧٩).

ئەوانە بوونە جەحەننەمیی، چونکە دڵیان هەیە پێی بیر ناکەنەوەو پێی تێناگەن، چاویان هەیە راستییەکانی پێ نابینن، گوێیان هەیە هەقیی پێنابیستن!. مەبەست لەم

ئایەتەو دەیان ئایەتی دیکەو فەرمووده ئەمەیە کە: دەبێ مرۆڤ بە ژیرانە بۆخۆی بیرکاتەوەو، دەرەنجامی خۆی دیاری بکاو نەهێڵێ وەکو ئەوانە گیرۆدەی دەستی کاری چەوتی خۆی ببێت. خوای دەهندەو دلۆڤان هەموو مرۆڤێك هەڵدەنێت کە زۆر بە قووڵیی و دوور لە هەواو هەوەسی نەفس، بیر بکاتەوەو بەراشکاوی گفت وگۆی جیددی بکات لە هەر مەسەلەیەکدا بێتە بەردەستیی و شك وگومانێکی تێیدا هەبێ، جا قورئان پڕە لەو بابەتە، بۆ نموونە: ﴿ قُلْ إِنَّمَآ أَعِظُكُم بِوَٰحِدَةٍ ۖ أَن تَقُومُوا۟ لِلَّهِ مَثْنَىٰ وَفُرَٰدَىٰ ثُمَّ تَتَفَكَّرُوا۟ ۚ مَا بِصَاحِبِكُم مِّن جِنَّةٍ ۚ .... ﴾ (سبأ: ٤٦)، واتە: من هەر ئامۆژگارییەکتان دەکەم، ئێوە یەکە یەکەو دوان دوان بێن لەبەر خوا ڕاستەوەبن و پێکەوە بیر بکەنەوە، چاکیش بزانن هاوەڵەکەتان (موحەممەد) هیچ شێتی تێدا نیە. ئەم ئایەتە مرۆڤەکان بە ڕاشکاوی بانگ دەکا بۆ گەڕان بەدوای هەق و ڕاستیداو، بە ئازادانەو دوور لە ژێر فشاری هەر لەمپەرێکدا، بیر بکەنەوەو ڕاستی هەڵبژێرن و بکەونە شوێن مەنهەج و پەیامی ئەقڵ و ژیریی و، بڕیاری خۆتان لەمەڕ هاوەڵەکەتانەوە بدەن، بێگومانین کەسێك نییە دوودڵ بێت لە فام و هووشیاریی و ژیریی هاوەڵەکەتان.

وە دەفەرموێ: ﴿ أَفَرَءَيْتَ مَنِ ٱتَّخَذَ إِلَٰهَهُۥ هَوَىٰهُ وَأَضَلَّهُ ٱللَّهُ عَلَىٰ عِلْمٍ .... ﴾ (الجاثية: ٢٣) واتە: ئاخۆ تۆ ئەی پێغەمبەر! ئەو کەسەت دیتووە کە ئارەزووی خۆی دەپەرستێ؟! ئیتر خوایش ڕێی ڕاستی لێگۆڕیی و مۆری نا بەسەر دڵیاو لێلاییشی خستە سەر چاوی، دیارە ئەگەر هەر ئاوا بیر بکاتەوە قەت ڕاستیی نادۆزێتەوە. لە ئایەتێکی تردا خوای کارزان داوا لە ئیمانداران دەکات کە بە ئازادیی و بیروبۆچوونی خۆیان و بەشێوەیەکی مەنهەجییانەی ڕاست موناقەشەو لێکۆڵینەوە لەگەڵ بەرامبەرەکەیان بکەن و، دەرفەتیان بدەنێ تا بە ئازادانە بیر بکەنەوەو کام ڕێبازیان دەوێ هەڵبژێرن: ﴿ ٱدْعُ إِلَىٰ سَبِيلِ رَبِّكَ بِٱلْحِكْمَةِ وَٱلْمَوْعِظَةِ ٱلْحَسَنَةِ ۖ وَجَٰدِلْهُم بِٱلَّتِى هِىَ أَحْسَنُ .... ﴾ (النحل: ١٢٥). واتە: بە شێوەی ژیرانەو ئامۆژگاری چاك و پەسەند، مەردم بەرەو ڕێگای پەروەردگارت بانگ بکە، وە بە جوانترین شێوە لە گەڵیان بە ئاخفتە.. چونکە بە هێواش و نەرم و

نیان و لەسەرخۆ، بەرامبەرەکەت هەست بە حورمەت و ڕێزی خۆی دەکات و باشـتریش گوێ دەگرێت و ئاسانتر دێتە سەر ڕێی هەق، ئەوساش بە ئازادانە - پاش موناقەشـە و توێژینەوەکـە - ڕاو بۆچـوونی خـۆی هەڵدەبـژێرێ، سـەرەڕای ئەمانـەش هـەرگیز شـەریعەتی ئیسـلام حـوکم و بریـاری خـۆی ناسـەپێنێ بەسـەر کەسـێکدا بـە ئازادانـە (ئیقرار)ی نەکردبێ و پێی لێ نەنابێ، تەنانەتی کابرای تۆمەتبار لە بەردەم دادگادا، وە یان پێشتر ئەگەر بە هەڕەشەو تۆقاندن و داپڵۆسان، هاتبێ بە قەولـدا، هـیچ بریـارێکی لەسەر بنیات نانرێ. ئەمەیە کە لە گشت کتێبە فیقهیەکاندا هاتووەو دەڵێ: (ولا یصح إقرار مکره) واتە: قسەو پێ لێنانی زۆر لێکـراو - ئەگەرچـی لـە سـەر کـوفریش بێـت - وەکو عەممار - نادروست و ناڕەوایە، چـونکە خواسـت و ئـیرادەو ئـازادی لێ سـەنراوە. (ئەوزاعی)یش دەڵێت: دەسەڵاتدارانی ئەمڕۆ، کابرایـەکی تۆمـەتبار بـە دزیـی، یـان بـە کوشتن قۆڵبەست دەکەن و دەگرن، ئەوسا بۆ ئەوەی ئیقرار بکات، دارکارییـەکی زۆری دەکەن.. قسەی راست و رەوا لەو جۆرە پێ لێنانەدا ئەوەیە کە وەرنـاگیردرێ و، هـیچ بریارێکی فیقهی بـۆ نـادرێ، چـونکە ئـازادی لێ زەوت کـراوەو، ڕاو بۆچـوونی خـۆی لـە دەست داوەو، ناتوانێ بـە دروسـتی راو بۆچـوونی خـۆی دەربـڕێ و بارێـك هەڵبـژێرێ. دەتوانین بڵێین: رەتکردنەوەی قسەو ئیقراری زۆرلێکـراو، جـەماوەری زاناکـانی لەسـەر یەکدەنگە.

لە کتێبی (الطلاق)ی دکتۆر (زەڵم)ییدا هاتووە: (اتفق الجمهور — المالکیة، والشافعیة، والحنابلة، والجعفریة، والزیدیة، والظاهریة، والإباضـیة — علـی أن طـلاق المکـره لایقـع.. لأن الإکراه من العوارض الفاسدة التی تفسد الإرادة) کە جـەماوەری زاناکـان یەکـدەنگن لەسەر ئەوە تەڵاقی زۆر لێکراو ناکەوێ، چونکە زۆرکردن هۆیەکـە لـەو هۆیانـە ئـیرادەو ویسـتی مـرۆڤ لـە دەسـت دەدات، خـۆ مـرۆڤیش خـوا بـە خـاوەن ئـیرادەو بۆچـوون بەدیهێناوە، هەرکات لێی زەوتکرا ڕاو بۆ چوونیشی نـامێنێ و حیسـابێکیش بـۆ قسـەو ئاخافتنی ناکرێ.

بەڵگەشیان ئەو فەرموودەیە کە دەفەرموێ: ((لا طلاق ولا عتاق فى إغلاق)) ئیبن ماجە [٦]. یان دەفەرموێ: ((إن الله وضع عن أمتي الخطأ والنسيان وما استكرهوا عليه)) ئیبن ماجە [٧]. هەر ئەمەیە کە ئەمڕۆ لە دادگاکاندا تەلاقی پیاوی زۆر لێکراو- بەناهەق- ناخەن. لە (مجموعة الفتاوى)یشدا هاتووە: (إذا أكرهه بغير حق فأقر، كان إقراره باطلا، وإشهاده على الإقرار لا ينفعه، بل يوجب عقوبة الظالم المعتدى الذي اعتدى على هذا المظلوم بالإكراه). دیاریکردنی خەلیفەکانیش: جەماوەری زاناکان دەڵێن لە ڕێگای ئازادەوە هەڵبژێردراون، چونکە هەمووکات پێویستە کەش و هەوایەکی سازگارو ئازاد ساز بدرێت بۆ مرۆڤەکان هەتا بتوانن بە ئازادانە بیربکەنەوە بۆ هەڵبژاردنی سەرۆك و پێشەوا، یان بڵێین خەلیفەکان، بۆیە (ئیبن تەیمییە) دەڵێت: (وجمهور العلماء، والفقهاء، وأهل الحديث، والمتكلمين، كالمعتزلة، والأشعرية، وغيرهم..) واتە: جەماوەری زاناکان، فوقەهاکان و..هتد، دەڵێن: پێشەوا ئەبوبەکر ﷺبە هەڵبژاردن کرایە خەلیفە.

سازدانی کەش و هەوایەکی ئازادو دوور لە هەموو گوشارێکی سیاسیی و، وە بەرنەنانی تەمەح و ماددەو کورسیی و پلەو پایەی دنیا، زەرورەتێکی هەڵبژاردنەکانە، تا مرۆڤ بتوانێ کەسێتی و مرۆڤایەتی خۆی لە کیس نەدات و ئەو جۆرە شتانە گوشاری بۆ نەهێنن و توشی هەڵەی بکەن.

کەوابوو ئەو خەلیفانە، یان بڵێین ئەو پاشایانە کە بە زۆرو تۆقاندن و، بە هێزی سیاسیی و سەربازیی و، ئابووریی، ئازادی لە مەردم دەسێنن و راکانیان بۆ خۆیان دەپچڕێنن، یان لە ژێر سێبەری دەسەلات و سوڵتەدا -لێرەو لەوێ- (ریفراندۆم) دەکەن بۆ خۆیان و دەرەنجام لە سەدا سەدی دەنگەکان بە دەست دێنن! هیچ ئیعتبارو

(٦) حسن، حسنه الألباني فى سنن إبن ماجة برقم: ٢٠٤٦.

(٧) .صحيح، صححه الألباني في سنن إبن ماجة برقم: ٢٠٤٥ ٧

شەرعییەتیەکیان نیە، چونکە کەش و هەوای ئاوا ئازاد نیەو بە کەڵکی دەنگدان نایەت.

سوڵتەو دەسەڵات لە ئیسلامدا بۆ ئەوە نیە کە ئەو میللەتە بە زۆری ئاگرو ئاسن، سەری پێدانەوێنێ و، یان راوبۆچوونی خەڵکی بکرێ.. بەڵکو سوڵتە بۆ ئەوەیە ئەو شتانە کە دەبنە لەمپەرو ئەستەم بۆ ئازادی دەنگەکان رایانماڵێ و نەیانهێڵێ، جیهادیش بۆ ئەوە فەرزکراوە کە ئەو جۆرە دەسەڵات و دەنگدانە دەبنە لەمپەر لەبەردەم ئازادی بیروبۆچووندا، کپ بکرێنەوەو وەلانرێن. (بلازیری: کە مێژوو نووسێکی ئیسلامییە) بۆ دووپاتکردنەوەی ئەو قسەیە کە نابێ سوڵتە ئازادی و سەربەخۆیی مەردم زەوت بکات، لە کتێبەکەیدا دەڵێ: (ئەبوو عوبەیدە) گوتی: کە (عومەری کوڕی عەبدولعەزیز) کرایە خەلیفە، شاندێك- لەلای خەڵکی (سەمەرقەند)ـەوە — هاتنە لایی و سکالاّیان لە (قوتەیبە: سەر لەشکری ئەو سەردەمە - کرد کە گوایا بێ ئاگاداریی هاتۆتە ناو شارەکەیانەوەو، بە بێ رەزامەندی ئەوان، خەڵکی تێدا نیشتەجێ کردووە، (عومەر)یش خێرا نامەیەکی بۆ دەسەڵاتداری ئەوێ نووسی کە: بە پەلە (دادپەروەرێك) دابنێ و بکۆڵێتەوە لە سکالاّنامەکەیان، ئینجا ئەگەر بریاریدا بەدەرچوونی موسوڵمانەکان، دەبێ دەرچن، ئەویش بەگەیشتنی نامەکە، (جومەیع)ی (باجی) دیارییکرد بروانێتە داواکەیان، ئەوسا بریاری دەرچوونی موسوڵمانەکانی دەرکرد کە دەبێ خەڵکی شارەکەیش بەر لەوە —ئەوان هێرش بێنن- ئاگادار بکرێن، هەتا خۆیان بۆ جەنگ ئامادە بکەن، جا بۆ دوایی خەڵکی (سەمەرقەند) ئەوەیان پێناخۆش بوو، بۆیە رەزامەندییان دەربڕی چۆن هاتوون، هەر ئاوا لەشارەکەدا بمێننەوە.

سەرباری ئەم هەموو ئایەتانەو دەیان ئایەتی تر، بنەمایەکی زۆر پیرۆزو گرنگ لە دینی ئیسلامدا (شورا)و راوێژە، لە هەر کارێکی گرنگ و پێشهاتدا، وەرگرتنی راوبۆچونی ئەو ئەنجومەنەیە، هەڵسەنگێنەری گشت پێشهاتەکانە - ئەو شتانەی کە

دەقێك لە بەرامبەریانەوە نەهاتووە- ئەوساش دەربڕینی راو بۆچونیانە بە ئازادانەو بوێرانە، هەر لەمەیشەوە سەرچاوەی گرتبوو كە هاوەڵان (خوا لێیان رازی بێ) لە هەرشتێكدا ئیشكالێكیان هەبووبا، یان بە باشتریان زانیبا بە دلێرانە دەنگی خۆیانیان دەردەبڕیی و بارە چاك و پەسەندەكەیان روون دەكردەوە، بۆ نموونە: كاتێ پێغەمبەر ﷺ لە رووداوەكەی (بەدر)دا لەشكرەكەی بردە سەر بەشی خوارووی ئاوەكانی بەدر، هاوەڵێك وەكو پسپۆرێكی سەربازی - لێی دێتە دەنگ و دەڵێ: ئەی پێغەمبەری خودا! مەگەر ئەمە وەحیی و سروشە كە ئێمە لەم جێگایەدا بین؟ یان راوبۆچوون و فێڵێكی سەربازییەو، دەتوانین قسەی تیا بكەین؟ پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: نەخێر، وەحیی نەهاتووەو راوبۆچوونی تەكنیكیی و سەربازییەو پلانی شەڕە، ئەوجا هاوەڵەكەش (خوا رازیی بێت لێی) گوتی: دەسا مادام وەحیی نیەو، جەنگیش بە پلان و دۆزینەوەی باری راست و شیاوە بۆ سەركەوتن، من ئەم شوێنە بە گونجاو نازانم، بفەرموو بە خەڵكەكە تا دەڕۆنە جێگایەكی نزیك بە ئاوەكەوە لەوێ دابەزین و هەموو چاوگەكانی تر پڕ دەكەینەوە تا قورەیش سوودیان لێ وەر نەگرن، خۆیشمان ئەستێڵێكی لێ دروست دەكەین و ئینجا شەڕیان لەگەڵ دەكەین، لەكاتی پێویستیشدا سوود لە ئاوەكە وەردەگرین و ئەوان بێ ئاوو تینوو دەبن، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئاماژەت بۆ رایەكی باش و پەسەند كرد، بۆیە پێغەمبەری خوا سوپاكەی لەوێ هەڵساندو بردیە سەر نزیكترین چاڵاو لە دوژمنەوە، ئیتر لە نیوەشەودا لەوێ دابەزین و پاشان ئەستێڵەكەیان دروستكردو، هەموو چاوگەكانی تریان پڕ كردەوە، پێغەمبەرمان موحەممەد ﷺ جگە لە بەدر، لە چەند جێگایەكی تردا راو بۆچوونی هاوەڵانی وەرگرتووە، ئەوانیش زۆر بە ئازادانە راو بۆچوونی خۆیانیان دەر بڕیوەو كاریشی پێكراوە، چ لە كاروباری سەربازیدا، چ لە هەر بوارێكی تردا، جا بۆ نموونە: ناوی چەند جێگایەك دێنین كە پێغەمبەر راوێژی تێدا بە هاوەڵان كردووە، ئەوانیش بە بوێرانە دەنگی خۆیانیان لە سەر داوە:

## ١- جەنگی ئوحود:

ئەم جەنگە ڕۆژی هەینی (٦)ی شەشەلاَنی ساڵی سێی کۆچیی، کە قورەیش لە ماڵ دەرچوون و نزیکی (مەدینە) بوونەوەو ویستیان لەگەڵ موسڵمانەکاندا جەنگ بکەن، جا کە پێغەمبەر بەوەیزانی، بە خەڵکەکەی فەرموو: هەر کەسە بە زوویی راوبۆچوونی خۆی دەربڕێ لە مەڕ چۆنیەتی ئەم جەنگە دەرگای پێگرتووین.

## ٢- جەنگی (حمراء الأسد):

پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆژی شەممە (٨)ی شەشەلاَنی ساڵی کۆچیی، کە لە (ئوحود) گەڕایەوە (مەدینە) پاش ئەوە شەهیدەکانی گۆڕەپانی جەنگی خستە گۆڕ، ئەوسا ڕۆژی یەکشەممە (عەبداللەی کوڕی عەمری کوڕی عەوف)ی نارد، بەشکو دەنگ و باسێکی قورەیشی بۆ بزانیّ، جا کە گەڕایەوە گوتی: گوێم لە (ئەبوو سوفیان)ـەوە بوو، بە دەورو بەرەکەی خۆی دەگوت: بەراستی شەوکەتمان شکاندن لە ئوحود دا، بەلاَم هێشتای ماویەتی! مەرج بێت لە ریشەیان بێنین. ئینجا پێغەمبەر (ئەبووبەکر) و (عومەر)ی بانگ کردن و رای وەرگرتن کەچی بکەن بەرامبەر ئەو پێشهاتە؟ ئەوانیش گوتیان پەلاماری دوژمن بدریّ و دەست بۆ ماڵ و منداڵیان نەبریّ.

## ٣- جەنگی (ئەحزاب):

ئەم جەنگە ساڵی پێنجەمی کۆچیی، ڕۆژی سێ شەممە (٨) زیقەعەدە پێغەمبەر ﷺ سوپای کۆکردەوە بۆ بەرهەڵست لێیان. شیاوی باسە (١٥) ڕۆژ بوو لە گەمارۆی خوا نەناسەکاندا بوون، پاشان مەشۆرەتی بە موسڵمانەکان کردو فەرمووی: بە رای ئێوە بچینە دەرەوەی (مەدینە) بۆیان یان هەر لە شاردابین و بە دەوریا چاڵ لێدەین، یان لە نزیك شاردا بین و پشت بکەینە چیاکە؟.

## ٤- (حودەیبیە):

رووداوی حودەیبیەش ساڵی شەشەمی کۆچیی و، مانگی زیقەعەدە بوو، ئەوەبوو پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ (٦٠٠) کەسدا لە هاوەڵانی بەدەست و دیارییەکی باشەوە هاتن تەنیا بە مەبەستی عومرە، جا کە موشریکەکان بەمەیان زانی، بەیەك دەنگ بڕیاریاندا ڕێیان لێبگرن و نەهێڵن بێنە مزگەوتی (حەرام)ـەوە، ئینجا کە ئەم هەواڵە بە پێغەمبەر ﷺ گەیشت، هاوەڵانی کۆ کردەوە مەشۆرەتی پێکردن: دەبێ چی بکەن باشە؟.

## ٥- جەنگی خەیبەر:

ئەم جەنگەش ساڵی (٧)ی کۆچیی، مانگی (صەفەر) هاتە پێش، چونکە جوولەکانی خەیبەر لە گەڵ عەرەبە دەشتەکییەکاندا، ڕێکەوتبوون — لە تۆڵەی بەنی نەزیرو بەنی قورەیزە- هێرش بکەنە سەر موسڵمانەکان، بۆ ئەم جەنگەش (١٠٠٠٠) هەزار کەسیان ئامادە کردبوو، پێغەمبەریش ﷺ ئەو شەوە لە خەیبەر بنەو بارخانەی پێخستن و حەوانەوە، جا کە ڕۆژەوە بوو (حەبباب) هات و گوتی: ئەر بە وەحی لەم جێگایەدا بنەتان خستبێ، قسەیەکم نیە، ئەگینە چەند تێبینییەکم سەبارەت بەم جێگایە هەیە، ئەوەبوو چەند تێبینییەکی باسکردو پێغەمبەریش ﷺ هەر ئەو شەوە گواستیەوەو شوێنەکەی بەجێ هێشت.

## ٦- غەزای حونەین:

ئەم غەزایەش لە شەشەلانی ساڵی (٨)ی کۆچیدا بوو (واتە: پاش ئەوە کە فەتحی مەککە کرا)و موسڵمانەکان پیرۆزو سەرکەوتوبوون و دەسکەوتێکی زۆریشیان بوو، جا کە گەڕانەوەو گەیشتنە (جەعرانە)، نوێنەری هۆزی (هەوازن) کە ئیمانیان هێنابوو هاتنە لای پێغەمبەر ﷺ و داوای دیلەکانیان لێکرد، جا کە نوێژی نیوەڕۆیانکردو، باسەکەیان هێنایە ناوەو، ئەمیش ﷺ فەرمووی: هەرچی کەوتبێتە لای من و لای

کوڕانی (عبدالمطلب)، ئـەوە مسـۆگەرەو هـی خۆتانـە، بـۆ ئەویدیکـەش دای بـە گـوێی هاوەڵەکانیدا، ئەوانیش ڕەزامەندییان لە سەردا.

## ٧- جەنگی تائیف:

ئـەم جەنگـەش هـەر لـە مـانگی شەشـەلانی سـاڵی (٨)ی کۆچـیدا بـوو، ئـەوەبوو لـە سـەرەتاوە موسـڵمانەکان چـەند کەسـێکیان لێ شـەهید کـرا، پاشـان کـە (حـەبباب)ی پسپۆڕی کاروباری سەربازیی هات و شـوێنەکەی پێبـاش نـەبوو، گـوتی: مەگـەر لەبـەر وەحیە لەم جێگایەدا بنەتان خستووە ئەی پێغەمبەری خوا؟ ئەر لەبـەر وەحـی نـەبێ، مـن قسـەم هەیـە، پێمچـاکە لـە قەلاکەیانـەوە دوورەوەکـەوین، پێغەمبـەریش ﷺ لـە بەرامبەر وتەکەیەوە بێدەنگبوو، واتە: ڕەزامەندی لەسەر دا.

## ٨- خەزای تەبووک:

خەزای تەبووك لەمانگی ڕەجەبی ساڵی نۆیەمی کۆچـیدا بـوو، ئـەوەبوو پێغەمبـەر ﷺ فەرمانیدا خۆیان ئامادە بکەن و بچنە سەر ڕۆمەکان، شیاوی ئاماژە بۆکردنە کاتەکەی ئێجگار گەرم و نارەحەت و وشکە ساڵ بوو، لەولایشەوە میوە نۆبەرەی پێگەیشتبوو.. پێغەمبەریش ﷺ وەك باوی خۆی مەشۆرەتی بە هـاوەڵانی کـرد کـە چ ڕێگەیـەك بگرنـە بەرو چۆن دەست پێ بکەن؟. بـەڵێ پێغەمبـەری خـوا ﷺ مرۆڤێکـی خـود ڕەویـی خـۆ پەسـەند نـەبووە، بـەڵکو راو بۆچـوونی هـاوەڵانی زۆر لا مەبەسـت بـووە، وە پـاش مەشۆرەت، پێـی لـەنگ و نـەنگ نـەبووە لەراکـەی خـۆی بێتـە خـوارێ و رای هـاوەڵان قـەبووڵ بکـات، ئـەوەبوو چـەند جارێـك ڕاو بووچـوونی (حـەبباب) و هـاوەڵانی تـری وەرگرت.

* لە سەردەمی خەلیفەی موسـڵماناندا (عومـەری کـوڕی خـەتتاب-رضي الله عنه) مـارەیی ژنـان زێدە ڕۆییەکی زۆری تێدا کرا، بۆیە خۆی بە بەرپرسـزانیی و بـە پێویسـتی کۆمەڵگـەی زانی کە بەرهەڵستی ئەوکارەیە بووەستێ، بۆ ئەوە چـووە سـەر میمبـەرو ئامۆژگـاریی

کردن و، پاشان ڕێی لێگرت و سنوورێکی بۆ مارەیی دیاریکرد، پاشان ئافرەتێك ڕووبەڕوی وەستاو گوتی: مادەم خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿...وَآتَيْتُمْ إِحْدَاهُنَّ قِنطَارًا..﴾ النساء/٢٠ واتە: ئەر کلوورێك زێڕتان کردبوویە مارەیی هەرکامێکیان، نابێ بەهەر بڕوو بیانوویەکەوە بێ لێیان بسێننەوە، کەوابوو تۆ بۆت نییە سنووری بۆ دیاری بکەیت.، ئینجا عومەر گەڕایەوە سەر میمبەرو قسەو راو بۆچوونی ژنەکەی پەسەند کردو بۆ خۆشی گوتی: خوایە! داوای لێبوردنت لێدەکەم، لەوە کە عومەر هەڵەی کردوو، ژنێك هەڵەکەی بۆ راست کردەوە، بێ لەمانەش ئەگەر سەیرێکی (ئیجتیهاد)ـی زاناکانمان بکەین کە چۆن بە ئازادانە بیریان لە مەسەلە زانستە جیاجیاکانیان کردۆتەوە، بێ ئەوەی دەوڵەت، یان هەر هێزێکی تر ببێتە بەرهەڵست بۆیان، دەرەنجام توانییان فیقهی ئیسلامیی دەوڵەمەند بکەن و لە هەموو بوارێکدا - سیاسیی، ئابووریی، کۆمەڵایەتیی — راوبۆچوونی خۆیان دەربڕن و، ئێستاش لە جیهانی ئیسلامەتیدا جێگەی ڕێزو حورمەت و ئیعتیباری موسڵمانانن، دیسان بەوانە پتر (ئازادی لە بیرو بۆچووندا) روون دەبێتەوەو بێ دوو دڵی دەسەلمێنرێت.

* دیسان هەر پێشەوا عومەر ﵁ لە وتارێکدا گوتی: موسڵمانەکان! ببیسن و بەرفەرمان بن، ئەوسا (سەلمان)ـی فارسی هەڵسایەوەو گوتی: نابیسین و بەرفەرمان نابین! پێشەوا عومەر فەرمووی: بۆنابیسن و گوێ ناگرن؟ گوتی: چونکە لە شێوەی دابەشکردنی ئەو قوماشە کە لە (یەمەن)ـەوە هاتبوو بۆ موسڵمانان ئیشکالمان هەیە، دەبینین کراسەکەی تۆ پان و پۆڕو تەواوە لە بەرتدا، بەڵام هی موسڵمانەکانی تر کورت و ناتەواوە لەبەریاندا.. ئەویش گورج شایەتێکی بۆ راستکردنەوەو شایەتەکە روونیکردەوەو گوتی: من بەشە قوماشەکەی خۆمم بە عومەر بەخشیوەو کراسەکەی عومەر لە بەشەکەی من و بەشەکەی خۆی دوراوە، ئەوسا (سەلمان) گوتی: دەسا فەرموو ئێستا گوێڕایەڵ دەبین.

* ئەمانـەو بەسـەدان وەك ئەمانـە - كـە لـەناو موسـڵماناندا هـەبووە - هـەموو مانـای سەربەستی و ئازادی مرۆڤ دەگەیەنن لە دەربڕینی راوبۆچوونی خۆیـدا، بـێ ئـەوە هـیچ كەسێك گوشاری خستبێتە سەر هیچ كەسێك.

هیوادارم ئەمانە ببنە بەڵگەی ئازادی ڕاو بۆچـوون لای گـوێگران و خوێنـەرانی بـەڕێز، خۆ من دڵنیام كە تاكە ئایـەتێك، یـان فەرموودەیـەك، یـان ڕووداوێكـی مێـژوویی بـەس بوو، بەڵام لەبەر زیادە شیكردنەوە بوو ئەوەندە درێژەم دایە.

## ئازادیش سنووری هەیە:

پـاش ئـەو لێكۆڵینەوەیـە، دەمـەوێ بڵـێم: هـەموو یاسـاو ڕێسـایەك - چـەندە بـە راوبۆچوون ئازادی دابێ - بێگومانـە هێڵێكـی سـووری دیـاریكردووەو، نـابێ لـەو هێڵـە سوورە تێپەڕێن، وە هەرگیز مرۆڤی بێ یاساو ڕێسا ناگونجێ و نابێت، كـەوابوو دانـانی یاسـاو سـنوور بـۆ هەنـدێ قسـەو بۆچـوون و توێژینـەوەو لێكۆڵینـەوەكان، مانـای زەوتكردنی ئازادیی و سەربەستی ئازادیخوازەكـان نیـە، كەسـێك بـە نـاوی ئازادییـەوە گشـت پیرۆزییـەكان بـێ ڕێـز بكـا، حورمـەت و سـومعەی كەسـێتی هەڵكـەوتووەكان ببەزێنێ، كەسێك بیەوێ باسـە ئیسـلامییەكان بشـێوێنێ و خـەڵكیش چەواشـە بكـات، كەسێك بیەوێ خودی ئیسلام بە كۆنە پەرست و شوێنكەوتووەكانیشـی بـە ڕەجعیـی و دواكەوتوو بداتـە قەڵـەم، بـێ شـك ئـەوە ئـازادی نیـەو قبـوڵیش نـاكرێ، بـەڵام لەگـەڵ ڕەچاوكردنی یاسـای (مونـازەرە) و (موناقەشـە)، هـەر ڕەخنەیـە دەگـرێ و دەڵـێ، بـا بەبێ هیچ سانسۆرێك بیگرێ و بیڵێ .

سەد مەخابن - ئێستا گەلێ كەس هەیـە — كـە بـێ پـەردە دادەبەزێتـە سـەر مەسـەلە بەهادارەكانی ئیسلام و، دەیەوێ حەرامكراوەكان حەڵاڵ بكرێنەوە: تێكەڵی ژن و پیـاو سنووری نەبێ، شەرابخۆریی، قوماربازیی .. هتد . بە پێشكەوتن حسابیان بۆ بكرێـت، كە لای گشت زانا كۆمەڵایەتییەكان ئەوانە بە قێزەون و زیان بەخش خراونەتە ڕوو.

* نەخۆشێك - بە ناوی ئازادیی و ترسنۆكی خۆیەوە - ڕێ بە پزیشك نەدا چارەسەری بكات، مرۆڤێك بەناوی ئازادییەوە ماڵی خۆی بسووتێنێ و، پارەو پوولی خۆی لە قوماردا بدۆڕێنێ.. پێویستە ئەمانە یاسا ڕێیان لێبگرێت، هەرچەندە گلەیی و گازندەشیان هەبێ، بۆیە شەریعەتی ئیسلام (حەجر)ی لەسەر منداڵ و مرۆڤی بێ ئاوەزوو شێت و بێ (روشد)ی داناوە، ئەوانەی ئاوەزی خەرج و سەرفی ماڵیان نییە ! کاتێ خوا دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تُؤْتُوا۟ ٱلسُّفَهَآءَ أَمْوَٰلَكُمُ ٱلَّتِى جَعَلَ ٱللَّهُ لَكُمْ قِيَـٰمًا ... ﴾ (النساء: ٥) مانای زەوتكردنی ئازادیان نییە، بەڵكو دەیەوێ سەرو ماڵیان تیا نەچێ و بپارێزرێت.

لە ئیسلامدا (تتبع)ی عەورات و بەدواداچوونی کەم و كورتییەكانی هەر مرۆڤێك — لەبەر ناچاری زەروورەت نەبێ — ڕێ پێنەدراوەو قەدەغەكراوە، دیسان هەر باس و خواسێكیش لەوانە لێیان دەدوێن و دەیانكەنە هەراو كێشە، تا نەگەنە رادەی یەقین نابێ بە دوایاندا بچین: ﴿ وَلَا تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ ۚ إِنَّ ٱلسَّمْعَ وَٱلْبَصَرَ وَٱلْفُؤَادَ كُلُّ أُو۟لَـٰٓئِكَ كَانَ عَنْهُ مَسْـُٔولًا ﴾ (الإسراء: ٣٦).

## ئازادی مرۆڤ لە هەڵبژاردنی ئایین و مەزهەبدا

بەر لەوە بچینە ناو ئەم باسەوە، پێویستە ئەم راستییە بزانین كە غەیرەز ئەو دین و بەرنامانەی ئاسمانین، هیچ بەرنامە و بۆچوونێكی تر بە (دین) دانانرێ و بەر ئازادی هەڵبژاردنی دین و مەزهەب ناكەون: ﴿ أَفَغَيْرَ دِينِ ٱللَّهِ يَبْغُونَ وَلَهُۥٓ أَسْلَمَ مَن فِى ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ طَوْعًا وَكَرْهًا وَإِلَيْهِ يُرْجَعُونَ ﴾ (آل عمران: ٨٣). دینی ئیسلام كۆتا ئایینەكانی ترەو پێویستە گشت پەیرەوانیان پەیرەویی لە ئیسلام بكەن و تەنانەتی پێغەمبەرەكانیشیان (سلاویان لەسەر بێ) ئەر ئێستا لە ژیاندا بووبان، دەبوو باوەڕ بەم پێغەمبەرە (محمد ﷺ) و دینەكەی بكەن و هەنگاویش بەدووی ئەودا هەڵگرن: ﴿ وَإِذْ أَخَذَ ٱللَّهُ مِيثَـٰقَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ لَمَآ ءَاتَيْتُكُم مِّن كِتَـٰبٍ وَحِكْمَةٍ ثُمَّ جَآءَكُمْ رَسُولٌ مُّصَدِّقٌ لِّمَا مَعَكُمْ

لَتُؤْمِنُنَّ بِهِۦ وَلَتَنصُرُنَّهُۥ ۚ قَالَ ءَأَقْرَرْتُمْ وَأَخَذْتُمْ عَلَىٰ ذَٰلِكُمْ إِصْرِى ۖ قَالُوٓا۟ أَقْرَرْنَا ۚ قَالَ فَٱشْهَدُوا۟ وَأَنَا۠ مَعَكُم مِّنَ ٱلشَّٰهِدِينَ ﴾ (آل عمران: ٨١). واتە: ئەوکاتە وەبیر بێنە کە خوای میهرەبان لەگەڵ پێغەمبەرەکاندا پەیمانی بەست و پێیگوتن: من هەر کتێبێکی زانستیی و پڕحیکمەتم بە ئێوەدا، پاشان کە پێغەمبەرێك هاتە ناوتان و ئەوانەی لای ئێوەشی بە راست دەزانی، دەبێ ئێوەش بڕوای پێبێنن و یاریدەی بدەن و هاوکاری بکەن، خوای گەورە فەرمووی قەبووڵتانە؟ ئەرێ ئێوە ئەم ئەرکەم لە ئەستۆ دەگرن ؟ وتیان بەڵێ پەیمان بێت، گوتی: دەسا بەشایەت بن، ئەوا منیش لەگەڵتانم.

دیسان ئیسلام بە راشکاوانە رووبەڕووی ئەو گشت هەڵەو پەڵانە دەوەستێ کە (ئەهلی کیتاب) تێکەڵی کتێبەکانی خوایان کردووە، بەلأم ئەڵبەت بەشێوەیەکی زانستیی و مەنهەجییانەو هیچ زۆرو زەنگێك بەکار ناهێنێت و، هەڵە بە هەڵە چارەسەر ناکات، بەڵکو سەرزەنشتیان دەکات لەبیرووبۆچوونی مەزهەبی خۆیانداو، ئازادیشن لە مومارەسەی درووشمەکانیاندا، دەبێتە دەستەبەری گشت مافەکانیشیان، بە مەرجێ دەستدرێژی نەکەنە سەر موسڵمانان و بەها پیرۆزەکانیان، ئەمانەش هەندێك لە هەڵەکانیان کە قورئانی پیرۆز بۆمانی باس دەکات و دەفەرمووێ:

﴿ فَبِمَا نَقْضِهِم مِّيثَٰقَهُمْ وَكُفْرِهِم بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَقَتْلِهِمُ ٱلْأَنۢبِيَآءَ بِغَيْرِ حَقٍّ وَقَوْلِهِمْ قُلُوبُنَا غُلْفٌۢ ۚ بَلْ طَبَعَ ٱللَّهُ عَلَيْهَا بِكُفْرِهِمْ فَلَا يُؤْمِنُونَ إِلَّا قَلِيلًا ﴿١٥٥﴾ وَبِكُفْرِهِمْ وَقَوْلِهِمْ عَلَىٰ مَرْيَمَ بُهْتَٰنًا عَظِيمًا ﴿١٥٦﴾ وَقَوْلِهِمْ إِنَّا قَتَلْنَا ٱلْمَسِيحَ عِيسَى ٱبْنَ مَرْيَمَ رَسُولَ ٱللَّهِ وَمَا قَتَلُوهُ وَمَا صَلَبُوهُ وَلَٰكِن شُبِّهَ لَهُمْ ۚ وَإِنَّ ٱلَّذِينَ ٱخْتَلَفُوا۟ فِيهِ لَفِى شَكٍّ مِّنْهُ ۚ مَا لَهُم بِهِۦ مِنْ عِلْمٍ إِلَّا ٱتِّبَاعَ ٱلظَّنِّ ۚ وَمَا قَتَلُوهُ يَقِينًۢا ﴿١٥٧﴾ بَل رَّفَعَهُ ٱللَّهُ إِلَيْهِ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا ﴿١٥٨﴾ وَإِن مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ إِلَّا لَيُؤْمِنَنَّ بِهِۦ قَبْلَ مَوْتِهِۦ ۖ وَيَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ يَكُونُ عَلَيْهِمْ شَهِيدًا ﴿١٥٩﴾ فَبِظُلْمٍ مِّنَ ٱلَّذِينَ هَادُوا۟ حَرَّمْنَا عَلَيْهِمْ طَيِّبَٰتٍ أُحِلَّتْ لَهُمْ وَبِصَدِّهِمْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ كَثِيرًا ﴿١٦٠﴾ وَأَخْذِهِمُ ٱلرِّبَوٰا۟ وَقَدْ نُهُوا۟ عَنْهُ وَأَكْلِهِمْ أَمْوَٰلَ ٱلنَّاسِ بِٱلْبَٰطِلِ ۚ وَأَعْتَدْنَا لِلْكَٰفِرِينَ مِنْهُمْ عَذَابًا أَلِيمًا ﴾(النساء: ١٥٥ – ١٦١). یان دەفەرمووێ: ﴿ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ لَا تَغْلُوا۟ فِى دِينِكُمْ وَلَا تَقُولُوا۟ عَلَى ٱللَّهِ إِلَّا ٱلْحَقَّ ... ﴾ (النساء: ١٧١) هاوڕێ لەگەڵ دەیان ﴿ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ ﴾ی تر لە قورئاندا.

جا لەگەڵ دەرخستنی بیرو بۆچوونە هەڵەکانیشیان، هێمان ئیسلام هەر باوەڕی بە گفتوگۆو دیالۆك و لێکۆڵینەوەیەکی راشکاوانەیە:

﴿ وَلَا تُجَـٰدِلُوٓاْ أَهۡلَ ٱلۡكِتَـٰبِ إِلَّا بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُ إِلَّا ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ مِنۡهُمۡۖ وَقُولُوٓاْ ءَامَنَّا بِٱلَّذِيٓ أُنزِلَ إِلَيۡنَا وَأُنزِلَ إِلَيۡكُمۡ وَإِلَـٰهُنَا وَإِلَـٰهُكُمۡ وَٰحِدٞ وَنَحۡنُ لَهُۥ مُسۡلِمُونَ ﴾ (العنكبوت: ٤٦) . ﴿ قُلۡ يَـٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَـٰبِ تَعَالَوۡاْ إِلَىٰ كَلِمَةٖ سَوَآءِۭ بَيۡنَنَا وَبَيۡنَكُمۡ أَلَّا نَعۡبُدَ إِلَّا ٱللَّهَ وَلَا نُشۡرِكَ بِهِۦ شَيۡـٔٗا وَلَا يَتَّخِذَ بَعۡضُنَا بَعۡضًا أَرۡبَابٗا مِّن دُونِ ٱللَّهِۚ فَإِن تَوَلَّوۡاْ فَقُولُواْ ٱشۡهَدُواْ بِأَنَّا مُسۡلِمُونَ ﴾ (آل عمران: ٦٤).

ئێمە نامانەوێ هەموو ئەو ئایەتانە - لە بارەی خاوەننامەکانەوەن- بیانهێنین و لەم جێگایەدا هەڵەکانیان بخەینە ڕوو، چونکە ئەوە زۆری دەوێ، ئاشکرایشە مشتێك نموونەی خەرمانێکە، جا دینێك ئەوەندە خاوەنی چاوپۆشیی و سەماحەت بێ، جێگەی شانازی نیە بۆ موسڵمانان کە خاوەن دینێکی ئاوان رێزو حورمەت لە هەموو مرۆڤێك دەگرێ و، رێگە نادات تۆزقاڵەیەکیش ستەم لە هیچ کەسێك بکرێ، وە ئازادی خاوەن دینەکانیش دەپارێزێ و رێگەیان دەدا چۆن بیر دەکەنەوەو چۆن خواپەرستی خۆیان دەکەن بە مەرجێ ئازاری موسڵمانان نەدەن و قسەی تەنزو ناوو ناتۆرە بە بەها پیرۆزەکانیان نەڵێن، بەراستی موسڵمانانیش چاك پەیڕەوییان لە دینەکەیان کردو، وەکو ئەو داوای کرد لەگەڵ بەرامبەریان رەفتاریان کرد بە درێژایی مێژوو، لەگەڵ ئەو هەموو دەمارگیریی و رەگەزپەرستییەدا هەیان بوو، گەلێ جار جوولەکەکان دەچوون بە گژ گاورەکاندا گەلێ جار ئەوانیش دەستیان لەمان دەوەشاند، بەڵام سەماحەت و چاوپۆشیان بەرامبەر بە ئایین و ئاینداەرەکان لە باس نایەت.

(ئەبوو یوسف) لەو نامەیەدا وەڵامی (هارونە ڕەشید)ـی پێدایەوە کە: تێیدا پرسیاری کردبوو کە لەسەر چ بنەمایەکی ئیسلامیی دێرو کەنیشتەو شاری خاوەننامەکانتان - پاش ئازادکرن - بێ دەستکاری لە دەستی خاوەن نامەکاندا هێشتۆتەوە؟ ئایا چۆن لە هاتوو چۆدا بە رۆژدا چاخ (صەلیب)ـەکانیان دەنوێنن؟ لە وەڵامدا گوتی: موسڵمانەکان و خاوەننامەکان لەسەر ئەوە پێکهاتوون کە خاوەننامەکان سەرانە

(جزیە) بدەن بە موسڵمانەکان لـە بەرامبـەر پاراسـتن و خزمەتگوزاریەکانـەوە، پاشـان دێـرو کەنشـتـەو دێروگونـدو شـارەکانیان پـارێزراو دەبـن، ئێسـتاش بـە ئازادانـە کـاری خۆیان تیایاندا ئەنجام دەدەن.

بە (ئەبوو عوبەیدە)شیان گوت: لە ساڵێکدا رۆژێکمان بۆ دیاری بکە کە چاخەکانمان دەرخەین و بنوێنین، ئـەویش وەڵامـی دانـەوەو داخوازییەکـەیانی جێبـەجێکرد... هـەر ئەمـەش بـوو خـاوەن نامـەکان بـۆ دوایـی بوونـە پاڵپشـتێکی چـاك و بـە ئەمـەك بـۆ موسڵمانەکان، وە لەکاتی پێویستدا هاوکارییان دەکردن.

رێـزو حورمـەت گـرتن لـە خـاوەن نامـەکان، وە لـە دیـن و مەزهـەبیان هـەر لـە ژیـانی پێغەمبەردا ﷺ پراکتیك کراو رەنگی دایەوە، ئەوە بوو کاتێ هاتە مەدینە مووساییەکی زۆری تێـدابوو، پـەیمان نامەیـەکی لەگـەڵ مـۆر کـردن کـە دەبـێ موسـڵمانەکان لـە ئایدۆلۆژیاو دین و مەزهەبیان رێز بگرن هەر ئازارو بێزارێکیش - لێرەو لەوێ — روویـان تێبکـات، دەوڵـەت دیفاعیـان لێبکـات ئـەمانیش لەگـەڵ موسـڵمانەکاندا بـۆ پاراسـتنی مەدینە بوونە دەستێکی پۆڵایین .

* پێغەمبەر ﷺ هەندێ دراوسێی (ئەهلی کیتـابی) هـەبوو، هەمیشـە چاکەو پیـاوەتی لەگەڵ دەکردن، هەدیەو دیاری بۆ دەناردن، ئەوانیش دەست و دیارییان بۆ ئەو دەنارد هەتا لەمەوە ژنێکی مووسـایی ئەمـەی بـە هـەل قۆسـتەوەو رانـە گۆشـتێکی ژەهـراوی کراوی بۆ پێغەمبەر ﷺ نارد !.

* کە شـاندەکەی (حەبەشـە)ش هـاتن، پێغەمبـەر ﷺ خـۆی هەسـتا خزمـەتی کـردن، فەرمووی: چـونکە ئـەوان لـە هاوەڵـەکانمان زۆر رێزیـان گـرت کـاتێ لـەوێ پەناهەنـدە بووین، ئێستا پێم خۆشە خۆم بە دەستی خۆم میواندارییان بکەم .

* کـە نوێنـەری عیسـاییەکان (نـەجران)، هـات پێغەمبـەر ﷺ لـە مزگەوتەکـەی خـۆی داینـان و، هەرلـەوێش نوێـژی خۆیانیـان کـرد، پێغەمبــەر ﷺ لەگـەڵ موسـڵمانەکاندا لەلایەکی مزگەوتەکەدا نوێژیان دەکـردو شـاندەکەی (نـەجران)یـش لەلاکـەی تریـا، بـۆ

دوایـیش کەوتنــە دیفـاع لــە دینەکـەیان و لەگـەڵ پێغەمبــەر ﷺ کەوتنــە موناقەشـەوەو ئەمیش ﷺ بە ئەوپەڕی چاوپۆشییەوە ڕێگای پێدان و گوێی بۆ گرتن.

* (موقەوقیس) کەنیزەیەکی بەناوی (ماریە) بە هەدیە بۆ پێغەمبەر ﷺ نـارد، ئـەویش بە سنگێکی فراوانەوە لێی قبووڵ کردو کردیە خێزانـی خـۆیی و پاشـان (ئیـبراهیم)ــی کوڕی لێبوو، ئـەوەبوو چـەند مانگێك تەمـەنی کـردو کۆچـی دوایـی کـرد، بـۆ دوایـیش پێغەمبەر ﷺ ئەوەند بە وەفاو بـە ئەمـەك بـوو سـپاردیە لای موسـڵمانەکان کـە لەگـەڵ (قیبتی)ـەکاندا چاك بن، چونکە خەزوورانتانن (مەبەستی ژن هێنانەکـەی خۆیـەتی کـە ماریە خان موقەوقیس کردیە خەڵاتیی و ئیبراهیمی لێبوو).

* لە سەردەمی خەلیفەکانیشدا هەر بەو پێیە بە ئەوپـەڕی چاوپۆشـیی و لێبوردنـەوە لەگەڵ خاوەننامەکانـدا ڕەفتـار دەکـرا، تەماشـای عومـەری کـوری خـەتاب بکـە کـاتێ چوویە (بیت المقدس)ـەوەو ئازادی کرد، نوێژی عەسر لـە کەنیشـتەی قودسـی گـەورە دەبێ، ڕێی بە خۆی نەدا نوێژی عەسری تیـا بکـات، نـەوەك دوای خـۆی موسـڵمانەکان بەو بیانووەوە کە عومەر نوێژی تیا کردووە بیکەنە مزگەوت !.

* (عـەمری کـوری عـاص) لــە سـەردەمی عومــەردا سەرپەرسـتیاری وڵاتــی (میصـر) دەبێــت و، لەبــەر گــەورە بــوونی شــارەکەو زۆری نوێــژ خوێنــەکان پێویســتی بــە گەورەکردنی مزگەوت دەبێ، وایش دەبێ ئـەو خـانووەی بـە تەنیشـتی مزگەوتەوەیـە، گونجاوە بۆئەوەی بخرێتە سەر مزگەوت، خانووەکەشماڵی ژنێکـی (عیسـایی) دەبـێ، عەمریش تەکلیفی زۆری لێدەکاو پارەیەکی زیاد لـە نرخـی خـۆی دەداتـێ نایفرۆشـێ و نایدات، لەولایشەوە بەرژەوەندی گشتی ئـەو کـارە دەخـوازێ، بۆیـە لـە ڕێـی شـەرع و یاسایشەوە دەیتوانی بە زۆر بیخاتە سەر مزگەوتەوە، ئینجا هەڵسا پارەکەی لـە (بیـت المال) دانا بۆ ژنەکەو، خانووەکەی خسـتە سـەر مزگـەوت، پاشـان ژنەکـە هەواڵەکـەی گەیاندە عومەر، ئەویش بە پەلە کردیە سەر (عەمر) کە مزگەوتەکە بروخێنەو خـانووی ئەو ژنە چاك بکەوە.

* بۆ دواتریش لەکاتی (ئەمەوی) و (عەباسیە)کاندا موسڵمانەکان و خاوەن نامەکان لە نزیك یەکەوە مزگەوت و کەنیشتەیان هەبوو، بە ئازادانە پیاوە ئایینیەکانیان کاروباری دینی خۆیانیان بە جەماوەرەکەیان رادەگەیاند . (من روائع حضارتنا / دکتور سباعی).

* بێگومان مێژووی زێڕینی موسڵمانان پڕە لە موسامەحەو چاوپۆشی بەرامبەر بە خاوەن نامەکان و بەرەوانی لێیان لەکاتی پێویستدا. بۆ نموونە: کاتێ (تەتار)ـەکان هاتن و وڵاتیان داگیر کرد، پاشان یەکێ لە گەورەکانیان ویستی دیلە موسڵمانەکان ئازاد بکاو، عیساییەکان بهێڵێتەوەو ئازادیان نەکات، لەولاوە زانایەکی دین پەرەوەرو ئازاو بە جورئەت گوتی: مافی خاوەن نامەکان لەسەر موسڵمانانە، چی بۆ موسڵمانەکان دەکرێ دەبێ بۆ ئەوانیش بکرێ، بۆیە ئەگەر دیلەکانی ئەوانیش ئازاد نەکەن، ئەوا موسڵمانەکان دەست بە جەنگ دەکەن لەگەڵتاندا، لە پێناو ئازادکردنی ئەو دیلانەدا.

* لەم دواییەشدا زانای پایە بەرز (أبو الأعلی المودودی) سەبارەت بە ئازادی راوبۆچوونی ئەو غەیرە دینانەی لە ژێر رکێفی دەوڵەتە ئیسلامییەکاندا دەژین گوتی: دەتوانن بە ئازادانە ماڵ و منداڵیان لە دینی خۆیان تێبگەیەنن و، خوێندنی خۆیانیان فێر بکەن و، لە بارەی نیکاح و ژن و مێردیشدا بە پێی شەریعەتی خۆیان مامەڵە بکەن، هەروەها دەڵێ دەتوانن خەڵکانی ناموسڵمان بانگ بکەن بۆ دینی خۆیان، وە لە سنووری یاساشدا رەخنە لە ئیسلام بگرن، مەبەست ئەوەیە هەر رەخنەیەکی هەبێ دەتوانێ بیخاتە ڕوو بێ هیچ سانسۆرێك تا زانایەك بۆی شی بکاتەوەو تێیبگەیەنێت (مقترحات الدستور الإسلامی للباکستان/ مودودی).

* ئەو هەموو رووداوە مێژووییانە، ئەر شتێك بگەیەنن ئەوە دەگەیەنن کە دین و دینداریی و قبوڵکردنی ئاین و مەزهەب، بە ئیختیارو هەڵبژاردنە، خۆ ئەگەر وانەبێ پێغەمبەر ﷺ چۆن ئەو هەموو لوتفەی لەگەڵ خاوەن نامەکاندا دەنواند؟ ئەی چۆن

ڕێگەی دەدا بە وەفدەکەی (نەجران) لەلایەکی مزگەوتەکەیدا نوێژی خۆیان بکەن و، خۆیشی لەولاکەی تری؟ ئەی ئەگەر وانەبێ کە عومەر چوویە (قودس) و، سەری لە کەنیشتەکەیان داو داوای لێکرا نوێژێکی تیا بکات، ئەویش گوتی: نوێژی تیا ناکەم، نە وەك موسڵمانەکان پاش من بیکەنە مزگەوت، بێگومان ئەمەش هەر ئازادی دینداری دەگەیەنێت، ئەگینە عومەر لێی قبووڵ نەدەکردن لەسەر دینی خۆیان بمێننەوە، وە کەنیشتەکەشی دەکردە مزگەوت .

* سەرباری گشت ئەمانەش قورئانی پیرۆز دەفەمووێ: ﴿ لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِۖ … ﴾ (البقرة: ٢٥٦). واتە: ئاخۆ تۆ دەتەوێ بە زۆر ئیمان و باوەڕ بەو مەردمە بێنیت؟. یان ئەفەرمووێ: ﴿ …أَفَأَنتَ تُكۡرِهُ ٱلنَّاسَ حَتَّىٰ يَكُونُواْ مُؤۡمِنِينَ ﴾ (یونس: ٩٩)، واتە: لەم دینی ئیسلامەدا بە هیچ جۆرێك زۆر و خۆسەپاندن نیە. ئیبن عەباس "خوای لێ ڕازی بێ" دەڵێ: ئافرەتێك هەبوو منداڵی بۆ نەدەما، بڕیاریدا کە ئەگەر منداڵی بۆ بمێنێ بیکاتە مووسایی! جا کە ئەو دەمە (بەنوو نەزیر) ساڵی چوارەمی کۆچی بە هۆی خیانەتەکەیانەوە دەرکران، هەندێ منداڵە ئەنصارییان تێدا بوو گوتیان: قبووڵ ناکەین منداڵەکانمان مووسایی بن، واتە: ویستیان گلیان بدەنەوەو بە زۆر موسڵمانیان بکەن، جا بۆ ڕاستکردنەوەی ئەو هەڵەیە خوای گەورە ئەم ئایەتی:﴿ لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِۖ … ﴾ دابەزاند. ریوایەتێکی تر دەڵێ: پیاوێك لە ئەنصار دوو کوڕی عیسایی هەبوو، چوویە خزمەت پێغەمبەر ﷺ گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێم دەدەیت زۆریان لێبکەم بۆ موسڵمان بوون؟ ئەوسا ئەم ئایەتە هات و ڕێی لێگرتن . تفسیر إبن کثیر .

بەڵێ ئەم مەسەلەی زۆر نەکردنە لە هیچ کەسێك بۆ موسڵمان بوون، لەولایشەوە فەرزبوونی جیهادو ئەم ئایەتە کە دەفەرمووێ: ﴿ وَقَٰتِلُوهُمۡ حَتَّىٰ لَا تَكُونَ فِتۡنَةٞ وَيَكُونَ ٱلدِّينُ لِلَّهِۖ.. ﴾ (البقرة: ١٩٣) لەگەڵ دەیان ئایەت و فەرموودە لەوبارەیەوە ئیشکالگەلێکی دروست نەکردووە، ئەگەر چی هەندێ نەیارو ناحەزانی ئیسلام دەڵێن ئەم دوو بڕیارە: ﴿ لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِۖ … ﴾ و ﴿ وَقَٰتِلُوهُمۡ حَتَّىٰ لَا تَكُونَ فِتۡنَةٞ ﴾ ناکۆك و دژی یەکن ! چونکە ئەویان دەڵێ زۆرو خۆ سەپاندن لە ئیسلامدا نیە،

ئەمیشیان بریاری جیهاد دەداو موسڵمانەکانیش بە عەمەلی چەندین جار چوونەتە جیهادو کوشتاریان کردووە ! هەندێکیش موسڵمانن بەڵام بە جۆرێکی تر بیر دەکەنەوەو دەڵێن: ئەگەر لەکاتی خۆیشیدا جیهاد بووبێ ئەوا بێگومان بۆ ئەمڕۆو سبەینێ پێویست بە چەك و تەقەمەنی نیە ! وا قسە دەکەن کە ئیسلام بە فەرزکردنی جیهاد لە قەفەسی تۆمەتدایەو ئەوانیش دیفاعیان لێدەکەن .

* بێ شك هەردوولا بۆ دژایەتی ئیسلام و هەڵوەشانەوەی بریارەکانی ئیسلام هاوکارن، چونکە ئەمانە کە موسڵمانن دەڵێن: ئەمڕۆ جیهاد پێویست نیە، ئەوانە بێ ئەوە بە خۆیان بزانن بڵێسەو ئاگری ئەقیدەو دیفاع لێی دەکوژێننەوە، لەولایشەوە وا دەبەنە مێشکیانەوە کە ئەو جەنگانەی موسڵمانان لەگەڵ داگیرکەران کردوویانە هیچی جەنگی ئەقیدەو ئیمان نەبووە ! بەڵکو تەنیا جەنگی بازاڕو ململانێی کورسی بوو، بۆیە جیهاد پێویست نیە .

بەڵێ ئیسلام جیهادی فەرز کردووەو، بە درێژایی مێژوویش موسڵمانان لە جیهاددا بوون، بەڵام ئەو جەنگانە هیچیان بۆ زەبروو زۆر نەبووە بەرامبەر بە کەسێك موسڵمان ببێ، بەڵکو هەر جەنگێ ئامانج و مەبەستێکی بووەو، هۆیەك پاڵی ناوە بە موسڵمانەکانەوە دەست بدەنە چەك و شیر، نەك زۆر لەم و لەو بکەن بۆ باوەڕ هێنان. پێغەمبەر ﷺ کە لە مەککەدا تەشریفی هات و دەستی کرد بە بڵاوکردنەوەی دەسەڵاتی خواو تاك و تەنیایی خوای گەورە، بێ ئەوە بە خراپە باسی شتێکی ئەوانە بکات، ئەوەبوو کۆمەڵە خەڵکێك موسڵمان بوون و دوای کەوتوون، جا کە دەسەڵاتدارانی مەککە ئەوەیان پێ قبووڵ نەکرا دەستیان دایە ئازاردانی موسڵمانەکان و ئەشکەنجە دانیان، بێ ئەوە پێغەمبەر ﷺ باسێکی لە جیهاد کردبێ زۆرێکی بووبێ تا بە زۆر کەسێك موسڵمان بکات، جا بۆ دیفاع و بەرەوانی لەو رەش و رووتانەو بۆ بەرگری لە دین و سەروماڵ و منداڵیان بریاریدا جیهاد بکات، چونکە دەست درێژی بۆ سەر ئایدۆلۆژیاو ئەقیدەو ئازاردانی خەڵکەکەی لە دەست درێژییە بۆ سەر گیانی مرۆڤەکان:

﴿ ...وَٱلۡفِتۡنَةُ أَشَدُّ مِنَ ٱلۡقَتۡلِۚ ... ﴾(البقرة: ١٩١) جا کە موسڵمان ڕێی پێبدرێ بەرگری لـە ژیـن و لە ماڵی بکات، بێ شك چـاکتر ڕێـی پێـدەدرێ بـەرگری لـە دیـن و ئایـدۆلۆژیای بکـات، چونکە ئایین و مەزهەب دەبێ ئازاد بێ .

ئیسلام بۆ بەرگری لە ئازادیی و سەربەستیی، بانگەوازی جیهادی فەرزکرد، هـەروەها بۆ بەرگری لە ئازادی دین و ئایدۆلۆژیا.. ئیسلام بـە خێـروو بێرێکـی زۆرەوە هاتـە نـاو کۆمەڵگە .. هات بۆ ڕێنمایی ئادەمیزادو .. ئینجا لە پاش ئەوە پێیان دەڵێ: ﴿ ...فَمَن شَآءَ فَلۡيُؤۡمِن وَمَن شَآءَ فَلۡيَكۡفُرۡۚ ... ﴾ (الكهف: ٢٩) کێ ئیمان دێنێ، کێش ئیمان ناهێنێ خـۆی سەرپشك بێت، بەڵام دەبێت کەش و هەوایەکی سازگاریش هەبێت بـۆ ڕاگەیانـدنی ئـەو بەرنامەیە بە تەواوی مەردم، هەر وەکو لەلای خواوە بۆ تەواوی مـەردم هـاتووە، نـابێ هیچ کەسێك ببێتە لەمپـەر لەبـەردەم ڕاگەیاندنیـدا، وە ئەگـەر زلهێزێـك یـان کەسـێکی (طاغوت) ڕێی نەدا بەیان بکرێت ئەوە ئیسلام لەو حەلەدا ڕێ بـە جیهـاد دەدات، هـەتا کەش و هەوایەکی ئازاد بەرهەم دێنێت بۆ ڕاگەیاندنی، نەك بـۆ ئـەو مەردومـەی کـە بـە زۆر بیکەنە دین و ئایدۆلۆژیای خۆیان .. دیسان بۆ ئەمەش هەتا قیامـەت دێـت جیهـاد هەر دەبێ .

* ئیسـلام جیهـاد دەکـات بـۆ پاراسـتنی ئـەو ڕژێـم و یاسـا خواییـە کـە هـاتووە بـۆ ئادەمزاد، نەك وەك مرۆڤە نەیارو دژەکانی تۆمـەتباری دەکـەن! بـەڵکو تـەنیاو تـەنیا جیهاد دەکەن بۆ فەراهەم هێنانی یاساو ڕژێمێك کە: دیندارەکانی لە ژێریا بحەوێنەوەو ملکەچی ئەو یاساو ڕژێمەیە بن، ئەگەرچی وەکو (دین)یش بـاوەڕی پێنەکـەن.. دیـارە پاراستنی کەشی هەوایەکی ئازادی ئاوا، هـەتا دنیادنیـا بێـت، هێـزو توانـاو دەسـەڵاتی دەوێ، بۆ ئەمەیـە کـە دەفـەرمووێ: ﴿ وَأَعِدُّواْ لَهُم مَّا ٱسۡتَطَعۡتُم مِّن قُوَّةٖ وَمِن رِّبَاطِ ٱلۡخَيۡلِ تُرۡهِبُونَ بِهِۦ عَدُوَّ ٱللَّهِ وَعَدُوَّكُمۡ وَءَاخَرِينَ مِن دُونِهِمۡ لَا تَعۡلَمُونَهُمُ ٱللَّهُ يَعۡلَمُهُمۡۚ .... ﴾ (الأنفال: ٦٠) کەوابوو ئیسلام دەبێ یاسای هەبێ و بەرگریشی لێبکات، هێزو توانای خۆی هەبێت لـە پێناویدا جیهادیش بکات، دیارە ئیسلامێکی بێ یاسـاو ڕێسـاو بـێ هێـزو توانـا ئیسـلام

نیەو، هەرگیزیش توانای مانەوەی سەرکردایەتی ئادەمزادی نیەو ناشتوانێ خۆشیی و خۆشگوزەرانیی و، ئاسوودەیی فەراهەم بێنێ.

ئومێدەوارم بەم کورتە شیکردنەوەیە، لە ئازادی دین و ئایدۆلۆژیاو، لە جیهادەکانی ئیسلام تێبگەین و، بەرگری لە بوون و شەڕفرۆشی لێك بکەینەوە.

(دوژمنانی دینی خوا ئیسلامێکی بێ یاساو ڕێساو بێ هێزو بێ دەسەڵات و، بێ ئابووریی و بێ پارەو پووڵیان قبووڵە! ئیسلامێکیان پەسەندە نینۆکی کرابێ و، ئیسلامێکیان دەوێ هەمیشە شوێنکەوتە بێت، ئیسلامێکیان دەوێ لە چوارچێوەی مزگەوت نەچێتە دەرەوە، موسڵمانێکیان دەوێ بە بەرنامە ڕۆشنبیر کرابێ، بەپێی نەخشەو پیلانی ئەوان بجووڵێ و بڵێ!)

لە کۆتایی ئەم باسەدا پێویستە ئاماژە بەمە بکەین کە گەلێك کەس لە زانای ئایینی و ئەکادیمیی و خاوەنی جۆراوجۆری بڕوانامە ئەم ئایەتی: ﴿ لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِۖ ... ﴾یان بە هەل قۆستۆتەوەو پێیان وایە بێ دانانی هیچ جۆرە یاساو سانسۆرێك دەبێ بە ئازادانە گشت ڕێچکەیەك - لێرەو لەوێ – بڵاو بکرێتەوەو خەڵکی بۆ بانگ بکرێت ! بەڵام زانای خوا ناس (مەودودی) "خوا لێی خۆش بێ" لە کتێبی (رسالة الجهاد)دا دەڵێت: کاتێ موسڵمانان دەستیان دایە جیهاد، لەبەر ئەو هۆیانە لە ئیسلامدا ڕێ بە جیهاد دەدەن و بۆیان نیە دەستکاری ئاقیدەو ئایدۆلۆژیاو بەرنامە کۆمەلأیەتییەکانی مەردم بکەن، دەتوانن چ جۆرە دینداررییەك دەکەن، بەرنامەی کۆمەڵگەیان چۆن بنیاد دەنێن؟ بەڵام نابێ ئەوەند ئازاد بکرێن تا حوکمی وڵات بەدەست بگرن و بەو ڕێچکە هەڵدێرانەدا خەڵکی ببەن و وڵات بگێرنەوە بۆ ژێر ئاڵای کوفرو خوانەناسی، نابێ لەو ڕێگایەوە بەریان بۆ چۆڵ بکرێت .

* مانای ﴿ لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِۖ ... ﴾ ئەوە نیە کە هەموو مارکسیی و خوانەناس و لە دین دەرچوویەك، ئەوە بە هەل بزانێ و بێت لە ژێر سێبەری دەوڵەتی ئیسلامدا بە ئازادانە بانگەواز بکات بۆ ڕێچکە ئیلحادییەکەی، چونکە لە پێشەوە گوتمان: بەدەر لە دینی

خاوەن نامەکان لەگەڵ ئەوەشدا کە پڕە لە هەڵەو پەڵە، هیچ بەرنامەو بیرووبۆچوونێك بەدین و ئایدۆلۆژیا دانانرێت .

* مانای ﴿ لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِۖ ... ﴾ ئەوە نیە کە خەڵکانێك بە ئارەزووی خۆیان لە وتارو لە سیمینارو لە ڕۆژنامەو تەلەفزیۆن و بەشەکانی تری ڕاگەیاندندا دابەزێنە سەر دینی ئیسلام و بە کۆنە پەرست و ڕەجعی بدرێنە قەڵەم و مەردم هەڵنێن بۆ وەرگرتنی ڕێچکەکەی خۆیان و واز لە ئیسلام بێنن! مەردم بانگ بکەن بۆ پەرستنی نەتەوەو نیشتمان و سۆسیالیستیی و دیموکراسیی ... هتد .

* مانای ﴿ لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِۖ ... ﴾ ئەوە نیە کە لەناو جەماوەردا (ریفراندۆم) بکرێت بۆ هەڵبژاردنی ئیسلام، یان عەلمانیەت !.

* مانای ﴿ لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِۖ ... ﴾ ئەوە نیە کە لە دەوڵەتی ئیسلامیدا (پەرلەمان)ێك لە شیوعیی و، لە ئیشتیراکیی و، لە دیموکراسیی خواز - بەو مانایە کە سەرچاوەی حوکم و بریار "گەل بێت" - پێکبهێنرێت .

* بەڵکو مانای ﴿ لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِۖ ... ﴾ ئەوەیە کە دەبێ ئیسلام بۆخۆی حاکم بێ، خەڵکانی تر — دیندارو غەیرە دین - لە ژێر سێبەریدا بە خۆشیی و، بە ئازادانەو دوور لەهەر ترس و تۆقاندنێك بژین و، هەموومافێکیان مسۆگەر بێت.

**چپەیەک:**

خوێنەری هێژا! ئەوە ئازادی مرۆڤی غەیرە دین بوو لە ژێر سێبەری شەریعەتی خوای میهرەباندا، حەز دەکەم ئاوڕێك بدەنەوە بەلای (ئەندەنووس) و (ئیسپانیا) و وڵاتە کۆمونیستەکان و (هیند)ی گا پەرست و زایۆنیزم و خاچ پەرستەکاندا، بە تایبەتی ئەو وڵاتانەی کەمینەی موسڵمانیان تێدایە، تا بزانن باری کۆمەڵایەتیی و بژێویی و سیاسیی و دینیی و مەزهەبیی و ئازادی لە بیروبۆچوون و مافی گواستنەوەو نیشتەجێ بوونیان چۆنە..؟ پەرستگاو مزگەوت و دروشمە پیرۆزو بەهاکانیان لە چیدایە؟ ئایا سەروسیمای ئیسلامیان بە موسڵمانەکان نەگۆڕیوە ؟ سەرپۆش و باڵاپۆشیان لەبەر

کیژەکاندا دا نەماڵیی و لە خوێندن و بڕوانامە - لەم سەدەیەشدا - بێبەش نەکران ؟ ئەی رەگەزنامەو ناوی ئیسلامیی منداڵەکانیان پێنەگۆڕین ؟ لە دام و دەزگا دەوڵەتییەکاندا - چێشتخانە و ئوتێل و کەناسیی و پێڵاو بۆیاخ کردن نەبێ - وە لا نەخراون ؟! پێویستە مرۆڤ لەهەر جێگایەك بێت، دەبێ وەکو مرۆڤ تەماشا بکرێ، ڕێزو حورمەتی لێبگیردرێ، بە مرۆڤی راستەقینە دابنرێ و ماف و حەقی خۆی بۆ دابین بکرێ.. (سەیری هەر سێ بەرگی: الأقليات المسلمة في العالم: ظروفها المعاصرة، آلامها وآمالها - ساڵی ١٩٨٦ ز بکە).

## ئازادی مرۆڤ لە نەیاریی و ڕەخنە گرتندا

مەسەلەی نەیاریی و ڕەخنەگرتن لەهەر موسوڵمانێك، هەتا دەگاتە (خەلیفە)ش لە هەر بابەتێکدا، بە مەبەستی دەرکەوتنی باری ڕاستی لەو مەسەلەیەدا، لە ئیسلامدا دەرگا والآیە بۆ گەورەو بچوك، ژن و پیاو، خوێندەوارو نەخوێندەوار، بەڵکو گەلێ جار پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: ((أشيروا عليَ أيها الناس))[٨] چیتان پێباش نییە، فەرموون بەیانی بکەن و ڕەخنە بگرن، هاوەڵانیش هەر شتێکیان بە خزمەتی دین و لە بەرژەوەندی کۆمەڵگەدا زانیبا، بە ڕاشکاوی دەیان درکان، ئەویش ﷺ گوێی بۆ دەگرتن و بیرو ڕاکەی لێوەردەگرتن و کاری پێدەکرد، لە (بەدر) و لە چەند جێگایەکی تردا کە (حەباب) ی پسپۆڕ لە کاروباری سەربازیدا بە پێغەمبەری دەگوت: مەگەر بە وەحیە ئەم لەشکرە لەم جێگایەدا بێ ..؟ ئەگەر وابێ، ئەوا قسەیەکمان نیە، ئەگەر نا ئەم جێگایە بە باش نازانم...!

جا بۆ دواییش هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ هەر لەسەر بنەمای رەخنەو ئازادیی لە بیرو بۆچووندا کاریان دەکرد.. خۆ دنیا دەزانێ کە (سەقیفە) و (بەنی ساعیدە) چ

(٨) جاء من حديث أنس وأخرجه مسلم برقم : ١٧٧٩، ومن حديث عبدالله بن مسعود عند البخاري برقم : ٣٩٥٢.

میمبەرێکی ئازاد بوون، بۆ ڕەخنەو ڕاگۆڕینەوەی (ئەنصار) و(موهـاجیر) —بەتایبـەتی- لە دانانی خەلیفەدا.

(ئەبووبەکر)یش ﷺ هـەر کـە پۆسـتی خەلافـەتی وەرگـرت، فـەرموی: هـەتا لەسـەر هەقبم، هاوکاریم بکەن، خۆ ئەر دیتان هەقڕەو نیم و ڕێگەم هەڵـە کـردووە، بمخەنـەوە سەر ڕێی ڕاست.

ئەی (عومەرﷺ) هەر کـە پۆسـتی خەلافـەتی وەرگـرت، نەیفـەرموو: دەخیلتـانم، هـەر کامێکتان هەڵەیەکی لێ دیتم، بۆ خوا ڕاسـتی بکاتـەوە ؟ ئەوسـاش یـەکێ لـە گـوێگران گوتی: سوێندبێ بە خوا ! هەر هەڵەیـەکمان لێ بینیـت بـە شـیر ڕاسـتی دەکەینـەوە !، ئەی ئەمە کە ڕۆژێ (عومەر ﷺ) چوویە سەر میمبەرو، ویستی سنورێك دیاری بکات بۆ مارەیی ژنان، چونکە لـەو سـەردەمەدا زێـدە ڕۆیـەکی زۆر لـە مـارەیی ژنانـدا دەکـراو، کچان و کوڕان نەیان دەتوانی بە ئاسانی هاوسەری بکەن، ئەمیش — لە رووی ئـەوەوە کـە خەلیفەیـەو، دەبـێ هەمیشـە بەرژەوەندیـەکانی گـەل لـە بـیر نـەکات — لـە سـەر میمبـەری نوێـژی هـەینی ئـەو مەسـەلەیە خسـتە پـێش چـاوو ورووژانـدی، کەچـی ژنـە قورەیشییەکی لێهاتە دەنگ و گوتی: مەگەر ئـەو ئایـەتی ﴿ ..وَءَاتَيْتُمْ إِحْدَىٰهُنَّ قِنطَارًا .. ﴾ (النساء: ٢٠) واتە: ئەر کلووری مالْتان کردبوویە مارەیی ژنـەکانتان نـابێ هیچیان لێ بسێننەوە، بەڵگەی ئازادیە بۆ ژنان لە دانانی مارەیی خۆیاندا؟ ئەوسا پێشەوا(عومـەر) تەسلیم بووو گوتی: ((أصابت إمرأة وأخطأ عمر..))[٩] واتە: ژنێك هەقی پێکـاو، عومـەر هەڵەی کردو نەی پێکا.

یـان ئـەو ڕۆژە کـە لەسـەر میمبـەری نوێـژی هەینیـدا گـوتی: خەڵکینـە ! ببیسـن و فەرمانبـەربن، کەچـی (سـەلمانی فارسـی) هەڵدەسـێتەوەو دەڵـێ: نابیسـین و فەرمانبەریش نابین، چونکە جلکەکانی تۆ تێروتەسەل و ڕەسایە لە بەرتا، لـە کاتێکدا

(٩) هذه القصة عن عمر بن الخطاب رضي الله عنه، وقع في سندها كلام والأقرب ضعفها.، وقال البخاري في الحديث نظر..، هذا وقد ضعف الشيخ ناصر الألباني – رحمه الله – هذا الأثر (٦/٣٤٨). وقد شنع الشيخ أبو إسحاق الحويني كثيرا على هذا الأثر وضعفه بشدة في ((الانشراح)). والله تعالى أعلم. ملتقى أهل الحديث.

ئەمانـەی ئێمـە، كـورت و ناتـەواوو ناڕەسـایە لـە بەرمانـدا، دەبـێ ئەمـەمان بـۆ ڕوون بكەیتەوە، ئەوجا گوێ دەگرین، ئەویش شایەتی راسـتەوە كـرد كـە: ئـەو برایـە بەشـە قوماشەكەی خۆی بەخشیوە بە خەلیفە، واتە: جلكەكانی لە بە شـەكەی خـۆیی و ئـەو برایە درووە.. ئینجا كـە خەڵكـە قەناعـەتی كـرد، گوتیـان: دەسـا فـەرموو درێـژە بـە قسەكانت بدەو وتارەكەت تەواو بكـە.. باشـە! ئـەی ئەمانـە مانـای ئـازادی نـەیاریی و ڕەخنە گرتن نین لە ئیسلامدا؟!

ئەی زانای پایەبەرز (مەودوودی — خ) لەو ڕەشنووسـەدا بـۆ دەسـتوری (پاكسـتان)ی ئامادە كردبوو، تێیدا نەینووسیبوو كە بۆ غەیرە دینیەكان — ئەوانەی لە ژێر چاودێری دەوڵەتدان — ڕەوایە هـەر شـك و گومانێكیـان هـەبێ، لـەبارەی ئایـدۆلۆژیای ئیسـلام و دروشمەكانیەوە، دەری ببڕن، واتە: دەتوانن وەكو رەخنەو ئیشكال پێشنیاری بكـەن. (مقترحات الدستور الاسلامی — للباكستان).. سـەرباری ئەمانـە هـەموو، پێغەمبـەرمان (محمد ﷺ) دەفەرموێ: ((إن الدين النصـيحة، قلنـا لمـن يـا رسـول الله)) واتـە: پایـەی گرنگی ئەم دینی ئیسلامە، رەخنەو ئامۆژگارییە، بە پێغەمبەریان گوت ﷺ ئامۆژگـاریی و رونكردنەوە دەربـارەی كـێ..؟ فـەرمووی: ((لله ولرسـوله ولكتابـه ولأئمـة المسـلمين وعـامتهم))[١٠]. لەمـەڕ خـواو پێغەمبەرەكەیـەوە، باسـی بـوون و وجـودی خـواو، تـاك و تەنهایی خواو، راست و دروستی بەرنامەكەی خوا، ئەوجا گەورەیی مەزنی پێغەمبـەرو، دركاندنی هەر كاروبارێك لات روون نەبێ، هەروەها ئامۆژگاریی و رەخنـەو فەرمانبـەری پێشەوایانی موسڵمانان، دواتر ئامۆژگاریی و رونكردنەوە بۆ سەرجەم موسڵمانان . خـۆ ئەگەر چاوێكیش بـە قورئانـدا بخشـێنین، دەبیـنین لـە بـارەی رەخنـە گرتنـەوە — لـە هەموو بوارێكدا — ئایەت گەلێكی تێدایە، بۆ نمونە:

* ﴿ أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ ٱلْقُرْءَانَ أَمْ عَلَىٰ قُلُوبٍ أَقْفَالُهَآ ﴾ (محمـد: ٢٤). واتــە: ئــاخۆ لــە قورئــان رانامێنن، یان دڵیان داخراوە؟.

---

(١٠) صحيح، صححه الألباني في صحيح الترغيب والترهيب برقم: ١٧٧٦. وقال شعيب الأرنأووط: إسناده صحيح على شرط مسلم. مسند أحمد رقم الحديث: ١٦٩٨٢ .

* ﴿ أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ ٱلْقُرْءَانَۚ وَلَوْ كَانَ مِنْ عِندِ غَيْرِ ٱللَّهِ لَوَجَدُواْ فِيهِ ٱخْتِلَٰفًا كَثِيرًا ﴾ (النساء: ٨٢) واتە: مەگەر ئەوانە لە قورئان ورد نابنەوەو، بە وردی سەرنجی نادەن، وائێستا بە شك و گومانن لێی و، رەخنە دەگرن؟! بێ شك ئەگەر كارو بەرنامەی كەسێكی تر بوایە — بێجگە لە خوا — بێگومان دژایەتی و ناكۆكیەكی زۆریان تێدا دەدیت.

* ﴿ مَا لَكُمْ كَيْفَ تَحْكُمُونَ ﴾ (الصافات: ١٥٤). بۆچی وا بڕیار دەدەن و بیردەكەنەوە ؟

## ئازادی مرۆڤ لە نیشتەجێبوون و گواستنەوە

بەر لەوە بچینە ناو ئەم باسەوە پێویستە كورتە باسێ دەربارەی رێزو حورمەتی مەسكەن و خانووو بەرەی هەر مرۆڤێك- بە موسڵمان وغەیرە دینەوە - بنووسین، ئەگەرچی ساباتێكیش بێت لە دەشتێكدا دروستی كردبێ، خانووو بەرە لە ئیسلامی پیرۆزدا رێزی تایبەتی خۆی هەیە، بۆ هیچ كەسێك نیە بێ مۆڵەت بچێتە ژوورەوە، بۆ ئەوە ئەسرارو نهێنیی خاوەن ماڵ پارێزراو بێت و هیچ كەسێك بێ مۆڵەتی ئەو پێی نەزانێت، وە لە حاڵەتی خەفڵەتدا عەورەتیان دەرنەكەوێ، عەورەتی سیاسیی، كۆمەڵایەتی، ئابووریی، ئەو خوراك و خواردنەی ئەیخوات، ئەو جل و بەرگەی لە بەریدەكات، ئەو فەرش و رایەخ و ناو ماڵەی هەیەتی و حەزناكات خەڵكێك بیبینێت. گەلێ حاڵەت هەیە — تەنانەتی - ژن و مێرد، لە یەكتری دەیشارنەوە، مندالْ لە دایك و بابی پەنهانی دەكات، وە هەروەها..

ئیسلام رازیی نیە كە خانووو بەرەی هیچ كەسێك حورمەت و رێزی بشكێنرێ و، بێ قایەلبوون بە رێزیان و بەسەر بەستانەو بێ پرس و را هەڵبكوتیتە سەریی، ئەگەرچی ئەو سنوور بەزێنەش خەلیفەی موسڵمانان بێت.، خۆ داستانەكەی (عومەری كوڕی خەتتاب)تان بیستووە كاتێ بە سەر دیواری ماڵێكدا سەركەوت، تا بەچاوی خۆی ببینێ: ئاخۆ راستە ئەو ماڵە خەریكی مەشروب خواردنەوەن؟ ئەوسا لەگەڵ ئەوەش كە بە چاوی خۆی دیتی مەشروب دەخۆنەوە، مەشرووب خۆرەكان رەخنەیان لە

شێوە بشکنینەکەی عومەر گرت و عومەریش بە ڕێزەوە سەرکۆنەکەی وەرگرتن و گەڕایەوە ! پێیانگوت: خوا دەفەرموێ: لە دەرگاوە بچنە ژووری: ﴿...وَأْتُوا۟ ٱلْبُيُوتَ مِنْ أَبْوَٰبِهَا ۚ... ﴾ (البقرة: ١٨٩) کەچی تۆ لە سەر دیوارەکەوە سەرکەوتیت ! .

خوا دەفەرموێ: ﴿ولا تجسسوا..﴾ واتە:

بە دوای نهێنیەکانی یەکتردا مەچن، کەچی تۆ کوڵەت لێگرتین ! . خوا دەفەرموێ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَدْخُلُوا۟ بُيُوتًا غَيْرَ بُيُوتِكُمْ حَتَّىٰ تَسْتَأْنِسُوا۟ وَتُسَلِّمُوا۟ عَلَىٰٓ أَهْلِهَا ۚ ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ ﴾(النور: ٢٧) واتە: هەتا خۆتان نەناسێنن بە خاوەن ماڵ و سڵاو نەکەن و مۆڵەت وەر نەگرن، نەچنە ژورێ، کەچی تۆ هیچێکت لەمانە نەکردو هاتوویتە ژوورەوە ! لەسەردەمی جاهیلیەتدا - بێ پرس و مۆڵەت - خۆیان دەکرد بە ژووردا ئەوسا دەیگوت: لێرەن؟! گەلێ جار خاوەن ماڵەکەی لە حاڵەتێکی ناپەسەندو نەشیاودا دەدیت، وا دەبوو ژن و پیاوەکە، یان یەکێکیان ڕووت دەبوو، ئەوەش ئازاری دەروونی دەدان، جا لەبەر ئەوەو بە دەیان شتی تری بێزراو و نەشیاو، خوای میهرەبان وێڵی موسڵمانانی داداو فەرمووی:

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَدْخُلُوا۟ بُيُوتًا غَيْرَ بُيُوتِكُمْ حَتَّىٰ تَسْتَأْنِسُوا۟ وَتُسَلِّمُوا۟ عَلَىٰٓ أَهْلِهَا ۚ ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ ﴿٢٧﴾ فَإِن لَّمْ تَجِدُوا۟ فِيهَآ أَحَدًا فَلَا تَدْخُلُوهَا حَتَّىٰ يُؤْذَنَ لَكُمْ ۖ وَإِن قِيلَ لَكُمُ ٱرْجِعُوا۟ فَٱرْجِعُوا۟ ۖ هُوَ أَزْكَىٰ لَكُمْ ۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ ﴾ (النور: ٢٧ – ٢٨).

واتە: ئەی خەڵکانی خاوەن باوەڕ ! بەدەر لەماڵی خۆتان، سەر بەهیچ ماڵێکدا مەکەن هەتا ئیزن نەخوازن و سڵاو بۆ ئامادە بوانی ماڵەکە نەکەن . دیارە ئەمە بۆ ئێوە باشترە و، بەشکوم پەندیشی لێوەرگرن، خۆ ئەگەر کەسێکتان تێدا نەدیت، نەچنە ژوورەوە تا خاوەنی ئیزنتان دەدات، ئەگەر گوتیشیان: بگەڕێنەوە، دەبێ بگەڕێنەوە، ئەمە بۆ ئێوە باشترە، خوا لە هەرکارێ دەیکەن ئاگادارە . ئەم وردەکارییانە گشت لە موسڵمانانی پێشوودا ڕەنگیان دایەوەو، زۆر بە جیددی گرتیان

و کاریان پێکردن، بەر لە هەموو کەس پێغەمبەری مەزنمان (محمد ﷺ لە خۆیدا جێبەجێی کرد. (قەیسی کوری سەعد) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ بە مەبەستی سەردانمان تەشریفی هات بۆ ماڵەوەو فەرمووی: (السلام علیکم ورحمة الله) سەعدیش ئەوەند بە هێواش وەلآمی دایەوە گوێی لێوە نەبوو، (قەیس) بە سەعدی گوت:

ئەوە بۆ بە هێواش وەلآمی پێغەمبەر دەدەیتەوە؟! سەعد گوتی: حەز دەکەم پێغەمبەر ﷺ سلاوی زۆرم لێبکات (چونکە سلاوی ئەو، مایەی لێبوردنی خوایە) جا دووبارە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (السلام علیکم ورحمة الله) دیسان سەعد بە هێواش وەلآمی دایەوەو نەیبیست، بۆیە بۆ جاری سێیەم سلاوی کردەوە، ئیتر گەڕایە دواوەو رۆشت، سەعدیش بە پەلە دوای کەوت و گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەوەی راستی بێ هەر سێ جارەکە گوێم لە سەلامەکەتەوە بوو، بەلآم لەبەر ئەوە کە سەلامی زۆرم لێبکەیت بە هێواش وەلآمم دایتەوە، پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ سەعدا گەرایەوە بۆ ماڵی سەعدو، ئەویش چەندەی پێکرا خزمەتی کردو پاشان پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((اللهم اجعل صلاتك ورحمتك علی آل سعد بن عبادة..))[11]. واتە: خوایە لێبوردن و دلۆڤانیت بەرامبەر بە ئالوبەیتی سەعد هەبێت.

(ئەبوو داود) لە (عەبدالله)ی کوری (بەشیر)ەوە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ کە دەچوویە بەر دەرگای هەر ماڵێك، یان لە لای راستی دەرگاکەوە، یان لەلای چەپیەوە دەوەستاو دەیفەرموو: (السلام علیکم ورحمة الله) پاشان داوای مۆڵەتی چوونە ژوورەوەی دەکرد، واتە: نەدەچوو روو لە ناو حەوشەو ماڵەکە بکا، ئەوسا مۆڵەت بخوازێ، بۆیە هەرکەسێ لە دەم دەرگادا وەستابێ و رووی لە ناو ماڵ و حەوشە کردبێ، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرمووە: لە راست یان لەلای چەپەوە بوەستە، چونکە قازانجی ئەو مۆڵەت وەرگرتنە ئەوەیە کە ئاگاداری عەورەت و ناتەواوییەکانی ئەو ماڵە نەبێت .

(۱۱) مسند أحمد بن حنبل – مسند المكيين، حديث قيس بن سعد بن عبادة – حديث : ۱۵۱۷۸، قال شعيب الأرنؤوط : إسناده ضعيف لانقطاعه محمد بن عبد الرحمن بن أسعد بن زرارة لم يثبت له سماع من قيس بن عبادة .

لە (بوخاریی) و (موسلیم)دا هاتووە: ئەگەر کەسێ بە ئیزن و مۆڵەت لە دەرگاوە یان لە درزی دەرگاوە یان بە هەر جۆرێکی تر ئاگاداری ناو ماڵت بوو، تۆش - لەبەرامبەر ئەو سنوور شکێنەیەوە - زیخێکت بۆ هەڵداو چاوی دەرهێنا، هیچ گوناخێکت لەسەر نیە !

وە هەر بۆ راگرتنی حورمەت و رێزی مەسکەن و جێی حەوانەوەیە کە: (عومەرﷺ) لایدایە لای ژنێکی قورەیشی کە لە چادرێکدا بوو گوتی: (السلام علیکم) مۆڵەت هەیە بێمە ژووری؟ ئەوە بوو تا ژنەکە بە راشکاوی مۆڵەتی عومەری نەدا، مافی بەخۆی نەدا بچێتە ژوورەوە. ! تەنانەتی ئیسلام رێ لە خاوەن ماڵیش دەگرێ خۆی بکاتەوە بە ماڵدا، بە تایبەتی ئەگەر لەسەفەر بگەرێتەوە، ئەمەیش بۆ ئەوەیە چونکە لە سەفەر بووە، ئەگەری ئەوەی هەیە خێزانەکەی ناتەمیزو ریعایەتی پاکوخاوێنی نەکردبێ، ! بۆیە پێغەمبەر ﷺ هەر کە لە سەفەر دەگەرایەوە - ئەگەر هێمان رۆژ بووبا - لە نزیکی مەدینەوە پشوویەکیان دەدا هەتا بەشێ لە شەو دەچوو بە هاوەڵانیشی دەگوت: چاوەڕوان بن هەتا ژنان قژیان شانە دەکەن و خۆ پاکو خاوێن دەکەن .

ئەمەیە ئاداب و وێڵی ئایینی پیرۆزی ئیسلام، لەمەڕ مەسکەن و جێ حەوانەوەی هەموو مرۆڤێك، تەماشا بکە، ئەوەند بەرزو شکۆمەند رایگرتووە، نابێ هیچ کەسێك - ئەگەر پێغەمبەریش بێ ﷺ - سنوورو (حەریم)ی ببەزێنێ . بەلآم بەداخەوە دەبێ ئێستا ئەو ئەدەب و وێڵە ئیسلامییە بەرامبەر بە خانوو بەرەو مەسکەن لە کوێ بێت؟ کوا موسڵمانان پەیڕەویی لێدەکەن؟. گەلێ مرۆڤ هەیە هەر کە بە خەیاڵیا دێ بچێت بۆ لای هەرکەسێك — بە شەوو بە رۆژ — ئیتر بێ رەچاوکردنی ئاداب و وێڵی زیارەت و سەردان، هەڵدەکوتێتە سەر دۆستەکەی! زۆر جارانیش ئەوەند لە دەرگا دەدات و دەرگای لێناکرێتەوە، دەروو دراسێکانیش بێتاقەت و نارەحەت دەکات، هەتا ناچاریان دەکات بە فەرمووو دەرگاکردنەوە، ئەگەرچی خۆیان و ناو ماڵیشیان لەو کاتەدا کەڵکی میوان داری پێوە نەبێت ! خۆ زۆر جاریش هێڵی تەلەفۆن هەیە، دەتوانێ کات و ژوان وەرگرێت بەر لەوە بەو شێوەیە هێرش بکاتە سەریان، خۆ دیارە ئەمانە هیچیان ناکاو

تائێستاش کۆمەڵگە وای لێنەهاتووە بتوانی بەکەسێك بڵێیت: داوای لێبوردن دەکەم ئێستا کاتمان نیەو بۆ کاتێکی تر، کە ئەمە ئادابێکی ئیسلامییەو هەقە رەچاو بکرێت: ﴿...وَإِن قِيلَ لَكُمُ ٱرْجِعُوا فَٱرْجِعُوا هُوَ أَزْكَىٰ لَكُمْ ...﴾ (النور: ٢٨) هەڵدەکوتێتە سەریان پیاو لەوێ بێت یان نا؟ کاتی حەوانەو پشووودان و نان خواردن بێت یان نا؟ سەرە رای ئەمانەش ئەگەر وەکو پێویست نەتوانرا خزمەت بکرێ، غەزەب و تووڕەیی دەیگرێت !

پێغەمبەرمان محمد ﷺ رێدەگرێ لە شوێنکەوتنی عەیب و عاری ئەم و ئەوو و، بلاوکردنەوەیان لێرەو لەوێ، ئەوەتە لە فەرموودەیەکیدا دەفەرموێ:((يَا مَعْشَرَ مَنْ أَسْلَمَ بِلِسَانِهِ وَلَمْ يُفْضِ الإِيمَانُ إِلَى قَلْبِهِ، لَا تُؤْذُوا الْمُسْلِمِينَ وَلَا تُعَيِّرُوهُمْ وَلَا تَتَّبِعُوا عَوْرَاتِهِمْ، فَإِنَّهُ مَنْ تَتَبَّعَ عَوْرَةَ أَخِيهِ الْمُسْلِمِ تَتَبَّعَ اللَّهُ عَوْرَتَهُ، وَمَنْ تَتَبَّعَ اللَّهُ عَوْرَتَهُ يَفْضَحْهُ وَلَوْ فِي جَوْفِ رَحْلِهِ))[١٢]. واتە: ئەی ئەو کۆمەڵە کەسە ! بە زمان باوەڕتان هێناوەو نەگەیشتۆتە ناخی دڵتان، هەرگیز بە ناشیرین ناوی موسڵمانان مەهێنن و بە دوای عەورەتیاندا مەچن، بێشك هەرکەسێك بەدوای عەورەتی برای خۆیدا بچێت، خوایش بە دوای عەورەتیا دەچێ و ئا بڕووی دەبا، خۆ هەر کەسێکیش خوا بیەوێ ئەسرارو نهێنیەکانی دەر بخات، ئەوا لە ناو جەرگەی ماڵەکەی خۆیدا ئابڕووی دەبات.

مرۆڤ - سەرجەم - لە دیدی ئیسلامدا لە ماف و حقووقدا یەکسانە، هەموانیش بەندەی خوای دلۆڤان دادەنرێن، بۆ هەموانیش مافی زمان و کەلتوورو فەرهەنگ و، فێربوونی زانست و زانیاریی و، گوزەران و خۆشگوزەرایی و، نیشتەجێبوون هەیە، ئایەتی: ﴿وَٱلْأَرْضَ وَضَعَهَا لِلْأَنَامِ﴾ (الرحمن: ١٠) جەخت لەسەر ئەو هەقیقەت و بنەمایە دەکاتەوە، چونکە خوای گەورەو میهرەبان مرۆڤی بە خاوەن ئاوو خاك و هەقی نیشتەجێبوون دروست نەکردووە، ئایەتی: ﴿...إِنَّ ٱلْأَرْضَ لِلَّهِ يُورِثُهَا مَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ وَٱلْعَٰقِبَةُ لِلْمُتَّقِينَ﴾ (الأعراف: ١٢٨). یان ئایەتی: ﴿وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦ خَلْقُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ

---

(١٢) صححه أحمد شاكر في سنن الترمذي: ٢٠٣٢. وقال الألباني حسن صحيح.

وَٱلۡأَرۡضِ وَٱخۡتِلَٰفُ أَلۡسِنَتِكُمۡ وَأَلۡوَٰنِكُمۡۚ .... ﴾ (الـروم: ٢٢). وە ئايـەتی: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقۡنَٰكُم مِّن ذَكَرٖ وَأُنثَىٰ وَجَعَلۡنَٰكُمۡ شُعُوبٗا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓاْ ... ﴾ (الحجرات: ١٣) وە ئايەتی: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالٗا كَثِيرٗا وَنِسَآءٗۚ ﴾(النساء: ١).

به تايبەتی كه ئيسلام ئەم مەسەلەی نيشتەجێبوونەی لەسەر بنەمای دين و ئايين دامەزراندووە، چونكه ئايينێكی گشتگيرو جيهانيە، بۆيە لە هەر جێگايەك پەرەی سەند، ئەو جێگايە دەبێتە نيشتمان بۆ ئەو ئيماندارانە باوەڕيان پێی هێناوە، جگە لەوەش لە هەموو لايەكەوە دەتوانن بۆی بگوێزنەوەو بۆی بچن، بۆ ئەوەش نابێ لە هيچ لايەكەوە گرفت دروست بكرێت، سەر باری ئەوەش هەر موسڵمانێك لە هەر جێگايەك بژيی و، نەتوانێ بە ئازادانە دينداری خۆی بكات، لە سەری فەرزە لەوێ بگوێزێتەوەو كۆچ بكا بۆ جێگايەكی تر بتوانێ تێيدا خواپەرستيی بكات و لەو ستەم و ناهەقيەش خۆی رزگار بكات، بۆ چەسپاندنی ئەم راستييە چەندين ئايەت هاتووە لە قورئانی پيرۆزدا، ئەمانە هەندێكيانن:

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ تَوَفَّىٰهُمُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ ظَالِمِيٓ أَنفُسِهِمۡ قَالُواْ فِيمَ كُنتُمۡۖ قَالُواْ كُنَّا مُسۡتَضۡعَفِينَ فِي ٱلۡأَرۡضِۚ قَالُوٓاْ أَلَمۡ تَكُنۡ أَرۡضُ ٱللَّهِ وَٰسِعَةٗ فَتُهَاجِرُواْ فِيهَاۚ .. ﴾ (النساء: ٩٧) ﴿ وَمَن يُهَاجِرۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ يَجِدۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ مُرَٰغَمٗا كَثِيرٗا وَسَعَةٗۚ وَمَن يَخۡرُجۡ مِنۢ بَيۡتِهِۦ مُهَاجِرًا إِلَى ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ... ﴾ (النساء: ١٠٠). ﴿ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَلَمۡ يُهَاجِرُواْ مَا لَكُم مِّن وَلَٰيَتِهِم مِّن شَيۡءٍ ... ﴾ (الأنفال: ٧٢)

بەڵێ .. دەبێ مرۆڤ بە ئازادانە بژی، بە ئازادانە نان و خۆراك پەيدا بكا، بە ئازادانەش لە هەموو سووچێكی زەويدا - ئەگەر بيەوێ - دابنيشێ و خانووبەرەی لێ دروست بكات، پاشانيش بە ئارەزووی خۆی لەوێ بگوێزێتەوە، هەروەها ئايينی پيرۆزی ئيسلام دەرگای والاكردووە لەو كەسانە دەيانەوێ بێنە ناو جيهانی ئيسلامييەوە وەكو پەناهێنان - ئەگەر كافرو شەڕ فرۆش بن - لەگەڵ رەچاوكردنی ئەو بەرژەوەندييانە

بۆیان دەنوسرێت، وەك لەم ئایەتەوە دەر دەكەوێ: ﴿وَإِنۡ أَحَدٞ مِّنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ٱسۡتَجَارَكَ فَأَجِرۡهُ حَتَّىٰ يَسۡمَعَ كَلَٰمَ ٱللَّهِ ثُمَّ أَبۡلِغۡهُ مَأۡمَنَهُۥۚ ...﴾ (التوبة: ٦).

واتە: ئەگەر یەكێك لە بتپەرستان خۆی خستە داڵدەتەوە ئەی پێغەمبەر ﷺ پەنای بدە تا فەرموودەی خوا دەبیستێ، ئەوسا بینێرە شوێنێ تا نەترسێ، ئایینی پیرۆزی ئیسلام لەگەڵ ئەوەشدا جیهادی راگەیاند لە رووی گشت ئەوانەدا دەبنە بەرهەڵست لەبەردەم راگەیاندنی دینی خوادا، بەڵام ئەو جۆرە جەنگانە، جەنگی ئیبادەو لە بن هێنان نیە، بەڵكو بۆ هیدایەت و رێنماییە، بۆ تێگەیاندنی ئەو كەسانەیە لە ئیسلام حاڵی نەبوون، بۆیە لەم ئایەتەشدا ئەو موشریكانە دەیانەوێ بێنە وڵاتی ئیسلامییەوە بۆ ئەوەی شتێ لە قورئان تێبگەن، یان بۆ بازرگانی، یان وەكو پەناهەندەی سیاسیی، یان بۆ خوێندن، یان .. یان، دەبێ پێشوازی بكرێن و رێ و شوێنی حەوانەوەیان بۆ ئامادە بكرێ، وە لە هەر خراپەو دەستدرێژییەكیش سەرو ماڵیان بپارێزرێ، ئینجا ئەگەر ویستیان بگەرێنەوە بۆ وڵاتی خۆیان، یان بۆ هەر جێگایەكی تر، دەبێ بە سەلامەتی رەوانە بكرێن و بگەیەنرێنەوە وڵاتی خۆیان، وە هیچ كەسێك بۆی نیە سووكایەتیان پێبكاو بە دژایەتی سەیریان بكا، ئەگەرچی موسڵمانیش نەبن و باوەڕ بە ئیسلامیش نەهێنن.

ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت كە ئیسلام زۆر سوورە بۆ رێنمایی و شارەزاكردنی مرۆڤەكان بۆ رێگای سەرفرازیی و بەختیاریی، وە هەرگیزیش حەزی لە مرۆڤ كوشتن و خوێن رشتن نیە بەناهەق، رێگەش بە كەس نادا بێتاوان كەسێ بكوژێ، مەگەر كەسێك بۆ خۆی دژایەتی بانگبەرەكانی ئیسلام و دینی ئیسلام بكا، ئیسلام لە بەردەم باوەرداران و ئەو كەسانەشدا دەیانەوێ بێنە جیهانی ئیسلامییەوە، گشت سنوورەكانی كردۆتەوە كە بە ئازادانە بێنە ناوچە ئیسلامییەكانەوە، بە مەرجێ هەتا لەوێن ئەمن و ئاسایش بپارێزن و سیخوڕیی و جاسووسی نەكەن، وە رەچاوی یاساو شەریعەتی

ئیسلام بکەن، ئیسلام مامۆستای خەڵکانی نەزانە، پەناگای پەنا هاوەرانە، ئەگەرچی تا دوێنێش دژی بووبێ و شیری بەرامبەر هەڵگرتبێ .

**دەتوانین پوختتر بڵێین**: مرۆڤ هەقیەتی بە ئازادانە بۆخۆی بژیی، لە هەر جێ و ڕێیەك حەز بکات، وە لە هەر لایەك خانوو بکات، یان بچێتە هەر وڵاتێکی تر، بێ ئەوە لە لایەن دەوڵەتەوە هیچ لەمپەرێکی بۆ دروست بکرێت، یان خوێنی حەڵاڵ بکرێت، بۆیە کاتێ نوێنەرەکەی (موسەیلەمە) هاتە لای پێغەمبەرو لێی پرسی: مەگەر تۆ شایەتی دەدەیت (موسەیلەمە) پێغەمبەر بێت ؟ گوتی: بەڵێ !

ئەوسا پێغەمبەر فەرمووی: ئەر نوێنەر کوژرا با، تۆ هەقی کوشتنت هەبوو ! (ئیبن کەسیر) دەڵێ: مەبەست لەو پەنادانەی ئایەتەکە: ﴿وإن أحد من المشركين..﴾ ئەمەیە کە هەر کەسێك لە (دار الحرب)ـەوە هاتە وڵاتی ئیسلامیەوە بە نوێنەرایەتی هەر وڵاتێك، یان بۆ بازرگانیی، یان بۆ صوڵح و ئاشتی، یان داوای گرێدانی پەیمانی کرد، یان لەبەر هەر هۆیەکی تر هات و داوای لە دەسەڵاتدارانی دەوڵەت کرد پەنای بدەن، دەبێ پەنای بدەن و لە هەر پێشهاتێکی خراپیش — هەتا لەوێیە — بیپارێزن، وە هەر کاتێکیش ویستی بگەڕێتەوە بۆ زێدی خۆی، دەبێ بە شێوەیەکی جوان و پەسەند بەڕی بکرێت.، لە ئیسلامدا بەندکردن و دوورخستنەوەی هیچ کەسێك — بەبێ هۆی شەرعیی — ڕەوا نییە، چونکە دەست درێژییە بۆ سەر ئازادیی و کەسێتی مرۆڤەکان، دیارە ئەمەش پێچەوانەی عەدل و دادگەرییە، بەلأم لە رژێمە دەست کردەکاندا هیچ کەسێك بۆی نیە پێچەوانەی ڕاو بۆچوونەکانی ئەوان هەناسە بدات، وە سەروماڵی هیچ کەسێك پارێزراو نیە !.

**خوێنەری هێژا** ! لە کۆتاییدا بە پێویستی دەزانم هەندێ لەو بنەما گشتیانە کە دەوڵەتی ئیسلامییان لەسەر دادەمەزرێ و، ئەو ئازادیی و مافانەی تیا بەدەست دێت — بەکورتەیەك - بۆ ئێوەی بەرێز باس بکەم ، بەم شێوەیەی خوارەوە:

**یەكەم**: دەوڵەت لە ئیسلامدا لەسەر بنچینەی ئاقیدەو ئایدیۆلۆژییایەكی پاك و خاوێن و، قایەلبوون بە تاك و تەنیایی خوای میهرەبان و هەڵگۆزراو لە قورئان و سوننەت دادەمەزرێ، دیارە ئەو ئازادیی و مافانەش لەوەوە سەرچاوە دەگرێت، نەك لەسەر بنەمای عیرقیی و (ئەسنۆلۆژی)، یان لەسەر بناغەی جوگرافیایی و مێژوویی (جیبولۆتیكی)، ئەمەیە كە خوا دەفەرموێ: ﴿ كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَتُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ ... ﴾ (آل عمران: ١١٠). یان دەفەرموێ: ﴿ وَكَذَلِكَ جَعَلْنَاكُمْ أُمَّةً وَسَطًا لِتَكُونُوا شُهَدَاءَ عَلَى النَّاسِ وَيَكُونَ الرَّسُولُ عَلَيْكُمْ شَهِيدًا ... ﴾ (البقرة: ١٤٣) . پاشان ئەو دەوڵەتە بە شێوەیەكی مرۆڤ دۆستانەو گشتگیر هەڵدەستێ بە ئەنجامدانی كارەكانی: ئەوەیە كە دەفەرموێ: ﴿ يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَى وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا ... ﴾ (الحجرات: ١٣)، یان دەفەرموێ: ﴿ وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا رَحْمَةً لِّلْعَالَمِينَ ﴾ (الأنبياء: ١٠٧). لەگەڵ ئەمەشدا زۆرو زۆرداری بە شتێكی حەرام دەزانێ و رێنادات بەرامبەر بە هیچ كەسێك ئەنجام بدرێ، بە بیانووی ئەوەی بەڵكو كەسەكان ئیمان بێنن، وەكو ئەم ئایەتە دەفەرموێ: ﴿ لَا إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ ... ﴾ (البقرة: ٢٥٦)، یان ئەم فەرموودە دەفەرموێ: ((لیس منا من دعا إلى عصبية وليس منا من قاتل على عصبية..))[١٣] سەرباری ئەمانەش مێژووی دێرین و زێڕینی موسڵمانان، شایەتە بۆ ئەو هەقیقەت و راستییانە .

**دووەم**: دەوڵەتی ئیسلامیی لەسەر ئەساسی رێزگرتن لە ئەحكام و شەریعەتی خواو سەروەریی و گوێڕایەڵی بۆ بڕیارەكانی خوا دامەزراوە، دەبێ بە قورئان و سوننەت كار بكات، دەبێ بە شێوەیەكی ئاسان مەردمی لێ حاڵی بكات، لەولایشەوە پێویستە ئوسرەو خێزان و سەرجەم خوێندن و خوێندنگاكان و دەزگاكانی راگەیاندن، جەخت بكەنەوە لەسەر پەروەردەی نەفس و ئەقڵ و بەرەو ئیسلام و رێنماییەكانی ئیسلام

(١٣) بەم لەفزەو بەم ریوایەتە لاوازە، هەر چەند ماناكەی صەحیح و درووستە..، ضعيف/ ضعفه الشيخ الألباني في سنن أبي داوود ٥١٢١ .

ئاراستە بکرێن، وە دەبێ هاوکاریی و هاریکاریی لە دڵ و دەروونی هەموو ئینسانەکاندا بروێنرێ بۆ ئەنجامدانی گشت کارێکی خێر لەسەر ئەساس و بنەمای: ﴿ ...وَتَعَاوَنُواْ عَلَى ٱلۡبِرِّ وَٱلتَّقۡوَىٰۖ ... ﴾ (المائدة: ٢). پێویستە بۆ گرتنەبەری رێگای هەق و راستیی و، فەرمان بە چاکەو رێگرتن لە خراپە، یەکتر راسپێرن و بەئارام و خۆ راگربن.

خوا دەفەرموێ: ﴿ ...وَأُوحِيَ إِلَيَّ هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانُ لِأُنذِرَكُم بِهِۦ وَمَنۢ بَلَغَ ... ﴾ )الأنعام: ١٩( ﴿ وَٱلۡعَصۡرِ ١ إِنَّ ٱلۡإِنسَٰنَ لَفِي خُسۡرٍ ٢ إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَتَوَاصَوۡاْ بِٱلۡحَقِّ وَتَوَاصَوۡاْ بِٱلصَّبۡرِ ﴾ (العصر:١-٣). سلووك و رەوشتی گشت موسڵمانان - بە سەرۆك و فەرماندەکانیشەوە - بێ جیاوازیی، هەر ئەوەیە کە لە قورئان و سوننەتی پێغەمبەردا ﷺ روونکراوەتەوە .

بیروبۆچوون و ئیجتیهادو لێکدانەوەی زاناو یاسا ناسەکان و، دارشتنی (دەستوور) بۆ وڵات، لەسەر بنەمای قورئان و سوننەتە، کەوابوو ئەوی بە پێی فەرمان و بریاری خوا نەبێ، کاری پێناکرێ و دەبێ بدرێتە دواوە، مەردم لەبەردەم شەرعی خوادا گشت یەکسانەو، تاوانیش تەنها لەسەر شانی تاوانکار دەکەوێ و پێی مجرۆ دەبێ: ﴿ ...وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٞ وِزۡرَ أُخۡرَىٰۗ ... ﴾ (الإسراء: ١٥).

هەرچیش پێش هەر بریارو دەقێك کرابێ، بەر ئەو بریارو دەقە تازەیە ناکەوێ - وەکو بیرۆکەی یاسای نوێش دەڵێ ئایەتی: ﴿ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُضِلَّ قَوۡمَۢا بَعۡدَ إِذۡ هَدَىٰهُمۡ حَتَّىٰ يُبَيِّنَ لَهُم مَّا يَتَّقُونَۚ ... ﴾ (التوبة: ١١٥). وە ئایەتی: ﴿ ... وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّىٰ نَبۡعَثَ رَسُولٗا ﴾ (الإسراء: ١٥). ﴿ ....عَفَا ٱللَّهُ عَمَّا سَلَفَۚ .... ﴾ (المائدة: ٩٥)، بەڵگەی ئەو راستیەن.

<u>**سێیەم**</u>: دەوڵەتی ئیسلامیی — کە لەسەر بنچینەی ئیسلام، خۆی دادەمەزرێنێ - پێویستە (دادگەریی) بە مانا فراوانەکەیی و لە بواری سیاسەت و ئیدارەو داوەریی و کۆمەلآیەتییدا فەراهەم بێنێ لە ولآتدا، هەتا بتوانێ مافەکانی مرۆڤ و ئازادیی و یەکسانی بۆ تاك و کۆمەڵ بچەسپێنێ .

دەوڵەتی ئیسلامیی لەسەر بنەمای (شوورا)و راوێژ، مومارەسەی کاری رۆژانەی دەکات، ئایەتی: (١٥٩)ی (ئالی عیمران) و (٣٨)ی (شوری) بۆ چەسپاندنی ئەو بنچینە مەزنەیە.

دەبێ فەرمانبەرو كارگێرانی دەوڵەتی ئیسلامیی، هەمیشە دەرگایان لە هاولاتیان والا بێت، هەتا هاولاتیان بتوانن بە ئاسانی بۆ چارەسەری كێشەكانیان پەیوەندییان پێوە بكەن و بۆیان باس بكەن .

دەوڵەتی ئیسلامیی، دەبێ لە رووی ئابووریی و بە دەستهێنانی خۆشگوزەرانیەوە بۆ مەردم - زەوی ئاوەدان بكاتەوەو رێگای كشتوكاڵێكی سەركەوتوانە بداتە بەرو، لە دابەشكردنی موچەو گەیاندنی كارە خزمەتگوزەرانییەكاندا، رەچاوی (عەدالەت) بكات، ئایەتی:﴿ ....كَيْ لَا يَكُونَ دُولَةً بَيْنَ الْأَغْنِيَاءِ مِنكُمْ ... ﴾ (الحشر: ٧). جەخت لەسەر ئەو راستییە دەكاتەوە. پێغەمبەریش ﷺ بەرپرسێتی كاروباری مەردم و گوزەرانیان دەخاتە سەر ئەستۆی ئەوكەسانە دەوڵەت بەرێوە دەبەن، بۆیە دەفەرموێ: ((أنا أولى بالمؤمنين من أنفسهم، فمن مات وعليه دين ولم يترك وفاء فعلينا قضاؤه، ومن ترك مالا فلورثته))[١٤]. واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ هەموو ژن و پیاوێكی موسڵمان، لە نەفسی خۆیان بۆ خۆیان نزیكترو باشترە، كەوابوو ئەو كەسەی دەمرێ و سەروەت و سامانێك بەجێ دێڵێ، دەدرێتە كەس و كارە میراتبەرەكانی، خۆ ئەگەر بە قەرزاری مردو ماڵ و منداڵێكی بێ دەرامەتی جێهێشت با بچنە لای پێغەمبەر ﷺ، چونكە ئەو سەرپەرستیاریانەو، دەبێ ئەویش كەم و كورتیەكانیان بۆ تەواو بكات، جا بۆ بەڵگەی ئەم بنەما زۆر گرنگە، فەرمووی: حەز دەكەن ئایەتی:﴿ النَّبِيُّ أَوْلَى بِالْمُؤْمِنِينَ مِنْ أَنفُسِهِمْ .. ﴾ (الأحزاب: ٦) بخوێنەوە.

كەوابوو دەوڵەت دالدەدەری سەرجەم ئەو مرۆڤانەیە لە ژێر ركێفیدان، دەبێ بێ فەرق و جیاوازی رەچاوی هەموو بەرژەوەندییەكان بكاو، نەهێڵێ - بە پێی توانا - هیچ كەسێك سەرماو گەرماو برسی ببێ، ئەگەرچی ئەو كەسەش باوەڕی بە دین و ئایدۆلۆژیای ئەو نەبێ .

(١٤) صحيح البخاري – كتاب الفرائض، باب قول النبي "صلى الله عليه وسلم : " من ترك – حديث : ٦٣٦١.

عومەری کوری خەتتاب ﷺ لە وتارە گرنگەکەیدا گوتی: بەخوا سوێندی بێ، کەسێ لە کەسێکی تر، لەم (بيت المال)ـەدا هەقدارتر نیە، سوێند بەخوا ! هەمو مرۆڤێك لەم (بيت المال)ـەدا خاوەن مافە، منیش وەکو تاکێکی ئێوەم (بۆم نیە زیاترو باشتر بخۆم) هەر مرۆڤێ بەپێی تێکۆشانیی و تووشبوونی لە ئیسلامدا خاوەن هەقە، هەر مرۆڤێ بەپێی کۆن و تازەی موسڵمانبوونی رەفتاری لەگەڵ دەکرێت، هەموو مرۆڤێك بە ئەندازەی پێویستی هاوکاری دەکرێت .

(خالیدی کوری وەلید) کاتێ لەگەڵ خەڵکی (حيرة)دا رێکەوتن گوتی: هەر پیاوێك دەوڵەمەند بوویێ و، ئێستا هەژار کەوتبێ و خێری پێبکەن، سەرانەکەی لەسەر هەڵدەگیردرێ و، خۆیی و ماڵ و منداڵیشی لە (بيت المال) جیرەیان بۆ دەبرێتەوە.

لە ئیسلامدا دەدان بە خاوەندارییەتیدا نراوە، بە مەرجێ زیان بە خەڵکانی تر نەگەیەنێت: ﴿ فَإِن لَّمْ تَفْعَلُواْ فَأْذَنُواْ بِحَرْبٍ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ۖ وَإِن تُبْتُمْ فَلَكُمْ رُءُوسُ أَمْوَٰلِكُمْ لَا تَظْلِمُونَ وَلَا تُظْلَمُونَ ﴾ (البقرة: ٢٧٩). کۆکردنەوەی سەروەت و سامان و دارایی لە رێگای پەسەندی خۆیەوە، لای ئاینی پیرۆزی ئیسلام پەسەندکراوە، ئەڵبەت لەگەڵ رەچاوکردنی بەشە زەکاتەکەیی و ئەو مافانەی تر تێیدا هەن، هەقە لەسەر دەوڵەت دنەی مرۆڤ بدات بۆ بازرگانیی و ئاسانکاریشی بۆ بکات و سەرو ماڵیشی بپارێزێ لە دزیی و دەغەڵی.

<u>چوارەم</u>: دەوڵەتی ئیسلامی پێویستە لەگەڵ سەرجەم هاوڵاتە غەیرە دینەکانیدا — بە تایبەتی ئەوانەیان لە ژێر چاودێری ئەودان — لەسەر بنەمای ئەم ئایەتە پیرۆزە رەفتار بکات کە دەفەرموێ: ﴿ لَّا يَنْهَىٰكُمُ ٱللَّهُ عَنِ ٱلَّذِينَ لَمْ يُقَٰتِلُوكُمْ فِى ٱلدِّينِ وَلَمْ يُخْرِجُوكُم مِّن دِيَٰرِكُمْ أَن تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوٓاْ إِلَيْهِمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُقْسِطِينَ ﴾ (الممتحنة: ٨). واتە: خوا رێتان لێناگرێ لەگەڵ ئەوانەدا نەهاتوون بەگژتاندا و، لە زێدی خۆتان دەریان نەپەڕاندوون، چاك بن و بەدادگەرانە لەگەڵیان بجووڵێنەوە، خۆ دیارە کە خوای بە هەقیش مرۆڤە خاوەن ئینساف و خاوەن

ویژدانەکانی خۆش دەوێ. لەم ئایەتەدا دەرکەوت کە ئەو غەیرە دینانە — هەرچی بن - مادام شەڕ فرۆش نەبن و دژایەتی موسڵمانان نەکەن، دەبێ موسڵمانان چاکەیان لەگەڵ بکەن و بە ویژدان و بە ئینساف بن لە گەڵیاندا.. بێگومان ئەمەیە مانای ئازادیی راستەقینەو، دابینکردنی مافی مرۆڤ بۆ گشت ئینسانەکان، ئیسلام لەگەڵ ئەو خاوەن دینانە دژو نەیار نیەو هێزو ئاگر بەکار ناهێنێ و دژیان ناوەستێ، هەر لەبەر ئەوە کە باوەڕیان پێی نییە، بەڵکو تەنیاو تەنیا دژ بە وانە دەوستێ، دژیی دەوەستن و ئاژاوە دەنێنەوە لە وڵاتدا، ئەگەر ئیمانداریش بن، ئەگینە غەیرە دینەکان بە ئازادانە دەتوانن مومارەسەی ژیان بکەن، بێ دانانی هیچ لەمپەرێك لە بەردەمیاندا. قورئانی پیرۆز بەرامبەر بە خەڵکانی دژو ناحەز ، یەك راو بۆچوونی هەیە بۆ هەمووان هەر ئەمەیە کە دەفەرموێ: ﴿ وَإِن طَآئِفَتَانِ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ٱقۡتَتَلُواْ فَأَصۡلِحُواْ بَيۡنَهُمَاۖ فَإِنۢ بَغَتۡ إِحۡدَىٰهُمَا عَلَى ٱلۡأُخۡرَىٰ فَقَٰتِلُواْ ٱلَّتِي تَبۡغِي حَتَّىٰ تَفِيٓءَ إِلَىٰٓ أَمۡرِ ٱللَّهِۚ ... ﴾ (الحجرات: ٩). واتە: ئەگەر یەکێ لەو دوو دەستە ناکۆکە - پاش هەوڵی صوڵح و سازشی نێوانیان — هەر سوور بوو لەسەر کاری دەست درێژی بۆ سەر ئەوی تریان، دەبێ هەتا تەسلیم دەبن بە حوکم و بڕیاری خوا، بچن بە گژیاندا، تەنانەتی روبەرووشیان بووەستن، هەموو ئەوانەی ململانێ لەگەڵ سوڵتەو دەسەڵاتداراندا دەکەن، جا بۆ هێورکردنەوەی بارودۆخەکە، هەر ئەوەیە راو بۆچونی ئیسلام، ئیتر هەر دەستەو تاقم و خەڵکانێکبن. خودا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّمَا يَنۡهَىٰكُمُ ٱللَّهُ عَنِ ٱلَّذِينَ قَٰتَلُوكُمۡ فِي ٱلدِّينِ وَأَخۡرَجُوكُم مِّن دِيَٰرِكُمۡ وَظَٰهَرُواْ عَلَىٰٓ إِخۡرَاجِكُمۡ أَن تَوَلَّوۡهُمۡۚ وَمَن يَتَوَلَّهُمۡ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴾ (الممتحنة: ٩). واتە: خوا هەر لەوانە رێتان لێدەگرێ چاکەو دۆستایەتی بکەن، کە دژایەتی بانگەوازو دینەکەتان دەکەن و، لە وڵات و زێدی خۆتان دەرتان دەپەڕێنن، وە بۆ دەرپەڕاندنتان لەگەڵ خەڵکانی تر دەبنە دۆست و دەست تێکەڵ دەکەن و دەبنە هاوپەیمان، دیارە دۆستایەتی لەگەڵ خەڵکانی ئاوادا، مایەی شیرکەوکارێکی ناهەق و ستەمە و، خواش قەبووڵی ناکات.

بەڵێ هەر بۆ دیفاع و بەرەوانی لە خەڵکانی غەیرە دین بوو، هاتنی ئەو دە ئایەتەی سوورەتی نیساء، کە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّآ أَنزَلۡنَآ إِلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ بِٱلۡحَقِّ لِتَحۡكُمَ بَيۡنَ ٱلنَّاسِ بِمَآ أَرَىٰكَ

ٱللَّهُۚ وَلَا تَكُن لِّلۡخَآئِنِينَ خَصِيمٗا ﴾ (النساء: ١٠٥) هەتا دەگاتە: ﴿ ...إِلَّا مَنۡ أَمَرَ بِصَدَقَةٍ أَوۡ مَعۡرُوفٍ أَوۡ إِصۡلَٰحِۭ بَيۡنَ ٱلنَّاسِۚ ... ﴾ (النساء: ١١٤) ئەم ئایەتانە کاتێ هاتنە سەر پێغەمبەر ﷺ کە کۆمەڵێ لە موسڵمانە (ئەنصار)یەکان تووشی دزیەك دەبن و دەیانەوێ بۆ دەرباز بوون لێی بیسەپێنن بەسەر موساییەکدا، جا بۆ ئەوە هەستان – بەشەو – ماڵە دزراوەکەیان فڕە دایە ماڵی کابرای موسایی بێ ئاگاو بێ خەبەر لەو کارە، بەشکو ئابروویان نەچێت لە ناو ئەو کۆمەڵگەدا، جا پاش ئەوە چوونە لای پێغەمبەر ﷺ خەریکبوو قەناعەتی پێ بکەن و ببێتە پشتیوانیان کە ئەوان ئاگایان لەو شتە نیە ! جا بۆ راستکردنەوەی ئەو هەڵەیەو دیفاع لە بێ تاوانی کابرای موسایی، ئەو ئایەتانە هاتن و فەرموویان: ئەم قورئانەمان بۆ تۆ دابەزاند (ئەی پێغەمبەر ! ﷺ) بە هەق و راست، دەسا تۆش بەم قورئانە – بەوشێوە خوا دایبەزاندووە – هەستە کاری مەردم بە تێکڕا ئەنجام بدە، واتە: کێ خاوەن هەقە، هەقی بدەرێ – ئەگەر موساییش بێت – کێیش تاوانبارو ناراستە جەزرەبەی خۆی وەرگرێ – ئەگەر لە ئەنصاریش بێت - .

**خوێنەری بەڕێز !** پاش هێنانی ئەو چەند خاڵ و بڕگەیە لە سەرەوە، وا دەزانم ئەگەر کەمێ ئینساف و ویژدان هەبێ، هەقە ددان بە راستی و دادگەری دینی ئیسلامدا بنرێت، هەقە بگوترێ: (لە ئیسلامدا هەموو دینەکان ئازادن و، دیندارەکانیش بۆ خۆیان بە ئازادانە مومارەسەی دروشمە دینیەکانی خۆیان دەکەن، وە لەگەڵ موسڵمانانیشدا گشت لە بەردەم یاساو شەریعەتی خوادا یەکسانن. ئەم دینی ئیسلامە، ئەگەر دینی خوا نەبووبا، دەبوو کابرای موسڵمانی (ئەنصاریی) سەریان داپۆشرایە و رووشکێن نەکرابان، وە دەبوو بۆ هەلێک گەڕابان بۆ جوولەکە، چونکە جوولەکە مێژوویەکی تاڵ و تفتیان لەگەڵ موسڵمانەکاندا هەیە، بەڵام دیارە ئەم پەیامی خوا لە هەموو شتێک مەزنترە، بۆ چەسپاندنی دادو یەکسانی هاتووە لە نێو هەموو مرۆڤدا (موسڵمان و غەیرە دین)، بێگومان موسڵمانان هەتا بە رێك و راستیی کاری پێ بکەن، هەرگیز لە هەق کلا نابن، ئەگەرچی بە زیانی خۆیشیان تەواو ببێت .

**خوینەری هەقڕەو** ! ئـەم بابەتـە وەڵامێـك بـوو بـۆ مەسـەلەی (ئـازادی مـرۆڤ لـە ڕووی.. بـیرو بۆچـوون و .. **هەڵبـژاردنی** نـەیارو .. ڕەخنـە گـرتن و، نیشـتەجێبوون وگواستنەوە..) بە پێی تواناو گونجان کورتە باسێکمان لێنووسی، **هیوادارم** - ئەر وەکو پێویستیش نەبێ — توانیبێتم شیتەڵ و ڕوونی بکەمەوە بۆ گوێگران و خوێنەران.

**ئیتر سەر فراز و بەختیار بن ، وە خواش ئاگادارو چـاودێری هـەموان بێت.**

**و صلى الله وسلم و بارك على سيدنا محمد، و آله الأفاضل، و أزواجه الطاهرات، و أصحابه الميامين، و على كل من دعا بدعوته إلى يوم اللقاء .**



# لادانی گومان لەسەر
# زانایانی ئیسلامی و کاری سیاسیی..!

**لێکۆڵینەوەیەکە لەمەڕ عەلمانیەت و دەرخستنی**
**کاری واقیعیی زاناکانی ئیسلام !**

**جومادی دووەمی ١٤٢٣ ک – ئابی ٢٠٠٣ز**

**بسم الله الرحمن الرحيم**

لـە مێـژە هـەوڵ دەدرێ — چ لێـرەو چ لـەوێ- کـە دیینـی ئیسـلام و زانایـانی ئیسـلام لەگۆڕەپانی ژیان وەلانرێن و ڕێگەی عەلمانیەت بدرێتە بەر، وە بـە جۆرەهـا شـێوە لـە دەرەوەو ناوەوە بانگێشەی بۆ دەکرێت و بۆتە جێگـەی مشـت و مـڕی ئیسـلامیەکان و ئەوروپای ئەو ڕۆژەو، هەردوولاشیان -ئیسلامییەکان و ئەوروپا- دەیان بابەت و کتێـب و نامیلکەیان لەسەر نووسیی، ئەوروپا دەیانویست بەدنیای بسەلمێنن کە هەرگیز دیـن و دەوڵەت پێکەوە نایانکرێ و دژ بەیەکن! دەیانویست -بەتایبەتی- دینی ئیسـلام زۆر زۆر بچوك و کورت بکەنەوە، بەڕادەیـەك لـەناو قـوژبن و (زاویـە)ی مزگەوتەکانـدا جێـی بکەنەوەو، کاروباری هەر ئەوەندەبێ کە پەیوەندی نێوان مـرۆڤ و (پـەروەردگاری) پـێ توندوتۆڵ بکرێت، هەر خەریکی هەندێ (طقوس) و (رموز) و نەشـیدو سـروودی ئـایینی بێـت، ئـیتر -پـاش ئـەوە- نـابێ هـەقی بـەدەرەوەی دەرگـای مزگەوتیشـەوە هـەبێت، شیرازەی کۆمەڵایەتی و پێکەوەنانی خێزان و، نان پەیداکردن و ئابووری و ڕامیاریی و، دامەزراندنی دەوڵەت و دەسەڵات بەدەسـت کـێ بێـت چ کەسـێك سـەرۆکی وڵات بێـت؟ کاروباری دەرەوەو نێوخۆیی.. ئەمانە گشـت بنـەما بـەهادارەکانی تـر، دیـن بـۆی نیـە لەبارەیانەوە فزە بکاو ڕەخنەیەکیش بگرێت، چونکە بەبۆچوونی ئەوان دەبێ دین هەر لەو چوارچێوەیەدا زیندان بکرێ و سەر نەهێنێتە دەرو باسی ئەخلاق نەکا!

بەڵێ بانگێشەی ئەو سەردەمەو لاسایی کردنەوەی خۆیشمان ئێسـتا زەمینـە سـازیی بۆی لەسەر شاشەی تەلەفزیۆن و ڕادیۆو ڕۆژنامەکاندا، بگرە هەندێ جاریش ووروژانـدنی بـەهێنانی (مــەلا)یــەك و فــەتوادانی بــۆ شــەرعیەت و دروســتیی و پێکــەوە ژیــانی (عەلمانیەت) لەگەڵ ئیسلامدا، وەیـان گـوتنی: عەلمانیـەت -بـەلای ئـەوەوە- پـڕ بـەپڕ لەخزمەت و بەرژەوەندی دینی ئیسلامدایە! دەیانـەوێ کەمـە کەمـە ڕێگـای بـۆ پاکـژە بکەن و بەیانی و دوو بەیانیش ڕاپرسی بـۆ بکـەن لـەناو جـەماوەرێکی چەواشـەکراودا: ئـاخۆ ئێـوە عەلمانیـەتتان دەوێ، یـان ئیسـلامییەت، واتـە: جیاکردنـەوەی سـوڵتەو

دەسەڵات لەدین و، داخستنی دەرگای مزگەوتەکان لەسەر نوێژ خوێنەکان و ئیمامەکەشیان و گەمارۆدانی لەچوارچێوەی مزگەوتەکەدا! وەیان بەشێوەیەکی تر پێشنیازی دەکەن و دەیوروژێنن و دەڵێن: برۆ دینداری خۆت بکەو نوێژو ڕۆژو حەج و تەنانەت زەکات و.. بدە، بەڵام هەقت بەسەر دەوڵەتەوە نەبێت، چونکە ئەو کە ڕێ لەنوێژی تۆ نەگرێ، ئیتر تۆش چیت دەوێ لەو..؟!

بەڵێ.. ئەگەر عەلمانیەت ئاوا بۆ خۆی کوێخای وڵات بێت و بەئارەزووی خۆی گەزو پێوانە بکاو ئەخلاق و مەخلاق نەمێنێ و، مەشروبات و عارەق و قوماربازی لاموباح بێ، نێرو مێ، کچ و کوڕ پێکەوە بژین و پێکەوە بخوێنن و، هیچ فەرقیان نەبێ و بەمانا فراوانەکەی (ئازادیی بێ سنوور) ئازاد بن، دەبێ بۆچی ڕازی نەبێ و مەمنوونی ئەو نووسەرو مەلایانە نەبێ کە پێیان وایە: (مەلا هەر دەبێ لەپەناگایەکا، وەیان لەمزگەوتێکدا) هەر خەریکی وەعزو نەسیحەتی خۆی بێت لەگەڵ ڕیشسپی گەڕەکدا، بالاوەکانیش لەهاوێنە هەوارەکان و مەیخانەکاندا مەست و سەرخۆشبن! دەبێ ئامۆژگاریی مەلای پەڕو باڵشکاو بۆ کوێخایەکی ئاوا چ کەڵکێکی هەبێ؟ وەیان کەی دەنگی دەیگاتێ تا پێی بڵێ: ئەو ڕەفتارو کردارانە حەرامن! خۆ هەمووشمان دەزانین کاربەدەستان و فەرمانداارانی ئەمڕۆ وەك خەلیفە (مەنسوور) و (هاروونە ڕەشید) نین، تا زانایەك بەرنە لای خۆیان و گوێی بۆ بگرن و ئامۆژگارییان بکا..!!

عەلمانیەت لە فەرهەنگی ئینگلیزیدا بەمانای دنیا گەرایی هاتووە، وەیان ڕەچاوکردنی ماددە، وەیان، مەبەست پێی بێ دینیە، یان مەبەست پێی دوورکەوتنەوەیە لەمانای خواپەرستی! هەر هەمان فەرهەنگ دەڵێ: (العلمانية: هي النظرية التي تقول: إن الاخلاق والتعليم يجب أن لا يكونا مبنيين على أسس دينية).

وە لە (دائرة المعارف البريطانية)دا هاتووە دەڵێ: (العلمانية: حركة إجتماعية، تهدف إلى نقل الناس من العناية بالآخرة إلى العناية بالدار الدنيا فحسب).

هەر هەمان فەرهەنگ باسی (إلحاد) دەکاو دەڵێ: (إلحاد) دوو بەشە: ئیلحادیی تیۆری (نظری) ئیلحادیی (عەمـەلیی)کردەیـی، دیـارە ئـەو فەرهەنگـە عەلمانیـەت بەبەشـێکی ئیلحادی عەمەلیی دادەنێت. کەوابوو عەلمانیەت: یەکێکە لە مەزهەبە خـوا نەناسـەکان و ئەوانەی نکوڵی بوونی خوای گەورە دەکەن! وە دەیەوێ جڵەوی دنیا لـەدین دامـاڵێ و بـەئارەزووی خـۆی و بـێ سـنوور لـەبوارەکانی سیاسـەت و ئیقتیصـادو ئیجتیمـاع و ئەخلاق و یاسادا کار بکاو دوور لە هەیمەنەت و دەسەڵاتی (دین) ببـزوێ! لەولایشـەوە (عەلمانیـەت) هـیچ پەیوەندییـەکی بـە (عـیلم) و زانسـتەوە نیـە، وەك هەنـدێ کەسـی چەواشەکراو دەڵێن: گوایا مەبەست بە عەلمانیەت ئەوەیە کە لەڕێی زانسـتەوە هـەنگاو بۆ ژیان و بزووتن هەڵنرێ و کارەکانمان هەموو لەڕووی زانستەوەبێ! کـەوابوو کـورتترو باشتر هەر ئەوەیە لەپێناسەی عەلمانیەتدا بگوترێ: (العلمانية: هي اللادينية).

**عەلمانییەت: دوو بەشە: هەرکامێکیان بگری لەوی دیکەیان ناشیرینترو خراپترە:**

**<u>یەکـەم</u>:** عەلمانیـەتی ئیلحـادیی و بـێ دینـی، زاناکـان ئـەو بابەتـە بـەم شـێوەیە پێناسـەی دەکـەن کـە: سـەرجەم ئینکـاریی و نکـوڵی لـەدین و گشـت (مـەبادئ) و (قییەم)ـەکانی دین دەکاو، بەر لەهەموو شتێکیش حاشـا لـەبوونی خـوای بەدیهێنـەرو دروسـتکەرو نەخشـەگر دەکـا، بـەدەر لـەوەش هـەر کەسـێك باسـی ئیمـان و بـاوەڕو ئـەخلاقییات بکـات، ئـەو بـێ پـەردە دژایـەتی و ململانێـی لەگـەڵ دەکـا! ئـەم جـۆرە عەلمانیەتە – ئەگەرچی زۆر خراپ و سیماو دیمەنێکی تەواو ناشیرینی هەیە، بەڵام لای خەڵك بەئاسانی کافر دەکرێ و حوکمی هەڵگرانی ئەو پەرچـەمەش لای موسـڵمانان زۆر ئاشکراو ڕوونە و هیچ کەسێکیشیان قبووڵی ناکات، مەگەر کەسێ بیەوێ لەبازنەی دین دەرچێ و ئازادییەکی بێ سنوور بەخۆی بدات!

خەڵکانی ئەم جۆرە عەلمانیەتە زۆر توندڕەون لەدژایەتی کردنی (دین)داو، زۆریش بێ بەزەییانە موسڵمانان ئەشکەنجە دەدەن و، هەتا بۆشیان بلوێ سەرکوتیان دەکەن و ناهێڵن لەهیچ شتێکا دەنگ و رەنگیان هەبێ.

**دووەم**: عەلمانیەتی غەیرە ئیلحادییە -ئەگەرچی عەلمانیەت گشت دیمەن و سیمایەکی هەر ئیلحادە- بەڵام ئەم بەشەیان چونکە حاشا لە بونی خوا ناکات و ئیمانێکی تیورانەیە بەم ناوە پێناسەی دەکەن و دەڵێن: (العلمانية غير الملحدة) خۆ ئەگەرچی ئاواش بێت ئەمیش هەر ڕێگا نادا (دین)ی خوا دەست بخاتە نێو کاروباری دنیای مەردمەوە و هەوڵی جدیشی (تەهمیش) و لە پەراوێزنانی ئایینەو هەرگیز ڕازی نابێت بەرنامەی ژیان تێکەڵی بەرنامەو شەریعەتی خوا بکرێت و دەوڵەتیش ئازاد دەکا لە دانانی یاساو شێوەی بەڕێوەبردن، مەبەستیش لەم دابەشکردنی (عەلمانیەت)ـە بۆ ئەو دوو بەشە ئەوەیە کە لای زۆرینەی خەڵکی (عەلمانیەت) هەر ئەوەیان یاساغ و حەرامە کە نکوڵی بوونی خوا بکا، ئێمە هەردوو بەشەکەیمان شیتەڵکرد تا خەڵکان وریاو وشیاربن کە ئەوانەی حاشا لە بوونی خوا دەکەن و، ئەوانەش بۆرە ئیمانێکیان پێی هەیە، بەڵام ئەمیش هەر پێی وایە کە (دین) لە دەوڵەت جودابێ و بۆی نیە دەست بخاتە نێو کاروباری دەوڵەتەوە، ئەوە هەردوو بارەکەی بێ باوەڕی و کوفرەو هەرکەسیش پێی باش بێت بە (ملحد) و خوانەناس دادەنرێت.

ئەم بەشی دووەمی (عەلمانیەت)ـە لەڕووی چەواشەکردنەوە لەبەشی یەکەمی خراپترو خەتەرترە، چونکە بەشی یەکەم بەئاشکرا (نەفی) بوونی خوا دەکاو خەڵکیش بەئاسان دەیناسن و لێی تێدەگەن، بەڵام بەشی دووەم، وادەبێ هەڵگرانی ئاڵاکەی نوێژو ڕۆژووش دەگرن و هەندێ واجیباتی ئیسلامیش ئەنجام دەدەن، بەڵام ڕاوبۆچوونی ئەمەیە کە: (دین) نابێ دەست وەربدا لە کاروباری دەوڵەت و مەردم!

لەبەر کەم زانستی و ئاگاداری بەهەردوو بەشەکەی عەلمانیەت دەبینی زۆربەی یاساکانی حکوومەتە دەسەڵاتدارەکان لەجیهانی ئیسلامدا، یاسایەکی عەلمانیان هەیە و زۆرینەی موسڵمانانیش بەو ڕاستیە بەئاگا نین و وە دوویان دەکەون! هەر بۆیە زۆرێکی ئەو دەوڵەتە بەناو ئیسلامییانە -لە بنەڕەتا- جەنگ لەگەڵ دیندا دەکەن، دژایەتی لەتەك بانگخوازانی ئیسلام دەکەن، بەتایبەتی ئەو بانگخوازانە کە ئەم ڕاستیانە ڕوون دەکەنەوەو دەڵێن: دەبێ دینی خوا لەکۆشکی پاشاو سەرکۆمارەکانیشدا (حاکم) بێت، هەر وەکو لە چوارچێوەی مزگەوتدا حاکمەو پەیڕەوی لێدەکرێت، هەر ئەو تێنەگەیشتنەیە کە گەلێ جار ئەو خاوەن فیکرەو بۆچوونانە لەوتارو سمینارو نووسینەکانیاندا ناوی خوا دێنن و، هەندێ جاریش -ئەگەر پێویست بێت- بەئایەتی قورئان و فەرموودەکان وتارەکانیان دەڕازێننەوە، ئیتر دە ئەوەندەی تر خەڵکی سادەیان پێ چەواشە دەبێت و بەفەرماندەو حاکمێکی خواناس دەدرێنە قەڵەم.

<u>**با پوختەتر بڵێین**</u>: عەلمانیەت بەهەردوو بەشەکەیەوە کوفرێکی ئاشکراو نمایانە، بێ هیچ گومان و دوو دڵییەك، بۆیە هەر کەسێك بڕوای بەهەرکامێك لەو دوو بەشەیە هەبێ، بێ سۆ لەدینی ئیسلام چووەتە دەرێ، چونکە دینی ئیسلام بۆخۆی دینێکی تێرو تەسەلە، وە کامڵ و گشتگیرە و هەموو لایەنەکانی ژیانی لەخۆ گرتووە، رۆحی و جەستەیی، سیاسەت و ئابووری، وە رەوشت و قییەم.. وە هەروەها.. جا لەبەر ئەوە نابێ مەنهەج و ڕێڕەوێکی تری ئامێتە بکرێ هەر بۆ ئەوەیە کە خوای گەورە دەفەرموێ:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱدْخُلُوا۟ فِى ٱلسِّلْمِ كَآفَّةً ... ﴾ (البقرة: ٢٠٨) و یان لۆمەو سەرکۆنەی ئەوانە دەکا کە بڕێکی قبووڵ دەکەن و، بڕێکیش وەلا دەنێن:

﴿ ..أَفَتُؤْمِنُونَ بِبَعْضِ ٱلْكِتَٰبِ وَتَكْفُرُونَ بِبَعْضٍ ۚ فَمَا جَزَآءُ مَن يَفْعَلُ ذَٰلِكَ مِنكُمْ إِلَّا خِزْىٌ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۖ وَيَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ يُرَدُّونَ إِلَىٰٓ أَشَدِّ ٱلْعَذَابِ ۗ وَمَا ٱللَّهُ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ ﴾ (البقرة: ٨٥)

عەلمانیەكان بەو كارەیان - ئەگەر بڕواشیان بەخوا هەبێ- دینی خۆیانیان هەڵوەشاندۆتەوە، چونكە پێیان وایە كە بەرنامەو یاساكانی زەوی تێرو تەسەلترە لەبەرنامەو ڕێنماییەكانی دینی ئیسلام، بۆیە گشت زانایانی ئیسلام یەكدەنگن و دەڵێن: (من اعتقد أن الأنظمة والقوانين التى يسنها الناس أفضل من شريعة الإسلام، او أن نظام الإسلام لايصلح تطبيقه فى هذا القرن، أو أنه كان سببا في تخلف المسلمين، او أنه يحصر في علاقة المرء بربه، دون أن يتدخل فى شؤن الحياة الأخرى) هەر كەسێك وا بزانێ ئەو ڕژێم و یاسایانەی مردم دابان دەهێنن باشترو قەشنگترن لە شەریعەتی ئیسلام و، دینی ئیسلام هەرتەنیا بۆپتەو كردنی پەیوەندی مرۆڤەبە (پەروەرێنە)وە، وە نابێ دین بە هیچ كلۆجێ دەستێوەردا لەكاروباری ژیان، یان ناگونجێ لەم سەدانەدا ئیسلام پراكتیك بكرێت، وەیان دینی ئیسلامە بۆتە هۆی دواكەوتن و بەجێمانی موسڵمانان...ئەوا بەهەر یەكێ لەو بۆچوونانە دین لە دەست دەداو، لە دین ترازاوە.

بۆیە ئێستا بەداخ وكەسەرێكی زۆرەوە لە وڵات و ناوچەكانی دنیای ئیسلامدا لە ناو جیل و پێڕی نووسەرو واژەوانان و ڕۆژنامە نووساندا عەلمانیەكی زۆر هەڵكەوتووە، زۆرێكیشیان پێیان دەڵێن بیریار، یان مامۆستای زانكۆ! یان... یان، و خەریكە وای لێ بێت بێ پەردە ئاڵای عەلمانیەت بەرزەوە بكرێت و بێتە مایەی بیرتیژیی و ڕۆشنفكری سەردەم!!

هەر لەوەوە.. ئەنجام گەیشتە ئەوە كە:

١- حوكم و بڕیارەكان بە (ما أنزل الله) ڕەفز بكرێت و پشتە سەربخرێن و، شەریعەتی ئیسلام لەتەواوی بوارەكانی ژیاندا وەلا بنرێت و، لەباتی (وحی) نیگای خوا بۆ پێغەمبەرمان (محمد) سڵاوو دروودی هەتاهەتایی لەسەربێت، قانوون و یاساكانی خورهەڵات و خۆرئاوا ڕەوابێت و، بانگەوازیش بۆ گەڕانەوەی شەریعەت و هەیمەنەی

بەسـەر دام و دەزگاکانـدا بـە دواکـەوتن و (ئیرهـاب) بدرێتـە قەڵـەم و لای سـوڵتەی سەردەم حیسابی تایبەتی خۆی بۆدەکرێت و، تەنانەت لە ژیانی سـەرەتاییش بێبـەش دەکریٚ و هیچ کارێکی دەوڵەتیشی پیٚ ناسپێردریٚ و لای گەل و جەماوەریش بە پیاوی بێگانە نیشاندەدەریٚ، بۆ ئەوەی قسەیان تین و کاریگەری نەبیٚ بەسەریانەوە.

٢- مێژووی پڕ لە سەروەری ئیسلام هەڵوەشێنەوەو لای خوێنکـاران و خـەڵکانی دنیـا گەمـەو گاڵتـەی پـیٚ بکرێـت و، سـەردەمی ڕونـاك و زێڕینـی ئیسـلام، بەسـەردەمێکی تاریکی و دواکەوتوانە دابنرێـت و، لـە پـەیمانگاو زانکۆکانـدا بـە ئـارەزووی مامۆسـتای پۆلەکە (تەقییم)بکریٚ و بگوترێتە وە..!

نـابیٚ هـیچ خوێنـدکارێکی موسـڵمانیش فـزە بکـا، ئەگینـە -لـەژێر سـایەی دیموکراسـییدا!- بـەئیرهابی دادەنـریٚ و، هەڕەشـەی هەمـە جۆرەیشـی لێـدەکرێت، بچوکەکەیان دەرکردنەو، سبەینێش لە هیچ دەزگایەکی دەوڵەتییدا جێی نابێتەوە!

٣- پـەروەردەو تێگەیانـدن و پێگەیانـدن چەواشـە بکـریٚ و، ببێتـە خزمـەتگوزاری بڵاوکردنەوەی بیرۆکەی عەلمانیەت، ئەوسا لەمەشەوە:

أ- لـە گشـت قۆناغـەکانی خوێنـدن و قوتابخانەکانـدا بیرۆکـەی عەلمانیـەت ڕەواجـی بدرێتیٚ و بەنیشانەی پێشکەوتن دابنرێت.

ب- کەم سەیرکردنی ماددە دینییەکان و کەمکردنەوەی فـەترەی کاتەکـە بۆیـان، یـان هەر بخرێتە دوای دواوە، ئەوکاتە کـە نـە مامۆسـتا توانـای لا مـاوە، نـە خوێنـدکاریش وزەی پێمـاوە بـۆ وەرگرتنـی، یـان لەوانـەی ئایینـدا دەرچـیٚ و دەر نەچـیٚ هـەر دەرچووە..!

ج- ڕاگرتنی گشت دەقەکان و قەدەغەکردنی هێنانیـان، هـەتا لاوازی بیرۆکـەی ئـەوان پەردەی لەسەر لانەبریٚ.

د- تێکدانی گشـت دەقـە شـەرعییەکان، لەڕێگـەی ڕاڤەکردنیانـەوە، بـەجۆریٚ شـیتەڵ بکرێن خزمەت بە عەلمانیەت بکەن، لەباتی ئامانجە دینییەکان!

هـ- دوورخستنەوەی مامۆستا دیندارەکان و گواستنەوەیان بۆ شوێن و جێگا ئیدارییەکان، یان خانە نشین کردنیان!

و- کەم تەماشاکردنی خوێندکارە دیندارەکان، بەشێوەیەك نەتوانن لەگەڵ مامۆستاکاندا (موناقەشە) بکەن بۆ دەرکەوتنی ڕاستیەکان و دووریش نیە سەری ساڵ جەزرەبەی خۆی وەرگرێ و ژیری بکەن!

ز- هەرکەسێك بیرۆکەی عەلمانیەتی لەگیرفاندا نەبێ، دژی یەکڕیزی نیشتمانی (الوحدة الوطنية) دابنرێت و، تەنها هەر عەلمانی هاوڵاتی دڵسۆزو ڕەسەنە!

٥- بڵاوبوونەوەی (ئیباحییەت)ی بێ سنوورو بەدڕەوشتی و، ڕووخاندنی بینای خێزان - کە یەکەم تۆمەتە لەیاسای کۆمەڵایەتیدا- و دنەدنەی هاوڵاتیان و گەنجەکان بۆ ئیباحییەت.

- ئەوەش لەڕێی:

أ- ئەو یاسایانەی کارە زۆر خراپ و دزێوەکان ڕێ پێدەدەن و هیچ تۆڵەیەکیان لەبەرامبەرەوە دانانێن، دیارە ئەوکاتە- زیناو داوێن ناپوختی و مومارەسەی کاری جینسی لەپرۆسەی ئازادیی کەسێتی گشت کەسێکەوە دەبێ ئەو ئازادیەش بپارێزرێ!

ب- ڕاگەیاندنە جیاوازو جۆراوجۆرەکان: ڕۆژنامەکان و گۆڤارو ڕادیۆو تەلەفزیۆنەکان کە شەوانە و ڕۆژانە ماندو نابن لەدژایەتی (فەزیلە) و بەهاکان و مرۆڤایەتی و کردنەوەو ڕازانەوەی سەدان هاوینەهەوارو جێگا گەشت و گەڕەکان بەشێوەیەك ببێتە هۆی وروژاندنی (غەریزە)ی جینسی لاوەکان و، ئەوجار تێڕژاندنی سەدان و هەزاران کچ و کوڕی لاوو مێرمنداڵ و گۆرانی و هەڵپەڕکێ و سەماو سووڕدان لەبەردەم یەکتردا.

ج- دژ وەستانی (حیجاب)و لەچك و جل و بەرگی کوردیی -کە لەگەڵ پۆشاکە ئیسلامییەکەماندا یەك دەگرێتەوەو، سەپاندنی خۆ دەرخستن و (سفووری) و تێکەڵکردنی کچ و کوڕ لە پەیمانگاو دانشگاکاندا.

٦- دژایەتیکردنی بانگەوازی ئیسلامی لەڕێگای:

أ- چاودێرییەکی توندو تیژ لەسەر بڵاوکراوە ئیسلامیەکان، هاوکات لەگەڵ واڵاکردنی دەرگای ڕۆژنامەو گۆڤارو هەر کتێبێکی چەواشەکەرو فریودەرو لادەر لەڕێبازی ئیسلام و شەریعەتی ئیسلام.

ب- فراوانکردنی دەرفەت لەبەردەم هۆکانی ڕاگەیاندنە عەلمانیەکان، تا باشترو زیاتر دەنگ و ڕەنگیان بگات بەجەماوەرو گەل و مەبەستە مادییەکانی خۆیانیان بۆ ڕاڤە بکەن و ئیسلامیش بەدینێکی دواکەوتەو پێشێلکەری مافی مرۆڤ، بەتایبەتی ئافرەتان بنوێنرێ.

٧- تەفرو توناکردنی بانگبەرانی دینی خواو دژایەتیکردنیان و تۆمەتبار کردنیان بەجۆرەها درۆو دەلەسەو قسەی نابەجێ و ناپەسەند بەرامبەریان و، تاوانبارکردنیان بەپیاوی بێگانەو، دواکەوتە لەکاروانی تەکنەلۆژیاو باسە زانستیەکان و، خاوەن عەقلێکی دواکەوتەو گوشراوو، کۆنە پەرست!

٨- گوشار خستنە سەر ئەو موسڵمانانەی دژی عەلمانیەتن، لەڕێ گرتن و کوشتن و نەفی و شار بەدەرکردنیان.

٩- بێزاریی و حاشا لە (جیهاد) و هێرشکردنە سەریی و، دانانی بەکارێکی ڕێگریی و ناهەق و ناڕەواو هەمە جیانە، چونکە جیهاد بۆ سەرخستنی دینی خوایەو، بۆ سەرخستنی فەرمان و بڕیارەکانی خوایە، دیارە عەلمانیەت (دین)یان لەکاروباری دنیا دابڕیوەو هەر ئەم قسەیە دەکەن کە دین پەیوەندییە لە نێوان خۆی و خواوەندیدا -ئەویش ئەگەر حاشا لەبوونی خوا نەکەن-، دەسا ئیتر چۆن جیهاد قبوولْ دەکەن و دەرفەت دەدەن جیهاد بکرێت؟!

١٠- بانگێشە بۆ نەتەوایەتی و نیشتمانپەروەری.. واتە: کۆکردنەوەی گشت هاوزمانان لەسەر بنەمای نەتەوایەتی و وەلاتی (دین)و گوێ نەدان بەبنەما بەهادارەکانی دین!

ئەمانەو دە ئەوەندەی تریش عەلمانیەت زیانی لێدەبێتەوە بۆ ئیسلام و کۆمەڵگەی

بنیادەم، بۆیە بەهیچ جۆر ڕەوانیە پڕو پاگەندەی بۆ بکرێت و لەوڵاتی موسڵمانانندا پشتیوانی لێبکرێت.

**عەلمانیەت چۆن دین دەگۆڕێ و لاوازی دەکات لە دەروونی موسڵمانانندا !؟**

بەڵێ عەلمانیەت ڕێگەی زۆرە بۆ تێکدان و هەڵوەشاندنەوەی بنەما بەهادارەکانی دینی ئیسلام لەمێشك و دەروونی موسڵماناندا، لەوانە:

١- خەڵەتاندن و لەخشتە بردنی بڕێ خەڵکی ئیمان کزو لاواز بەماڵ و سامانی دنیاو (مەنصەب) و پلەو پایە، وەیان هەندێ ژنی لاواز بەکرێ دەگرن، هەتا لێرەو لەوێ برەوو ڕەواج بدەن بە ئاڵای عەلمانیەت، ئەڵبەتە بەر لەوە ئەو ئەرکەیان پێ بسپێرن، بەهەندێ ناوی زلەو جل و بەرگی فشۆڵە (نمایش)یان دەکەن لەبەردەم جەماوەردا، هەتا گوتارو قسەیان قبوولْ بێت و بایەخیان بدرێتێ.

٢- هێندێ لەوانە لەمەڵبەندی تایبەتیدا -لە خۆرئاوا- گۆشدەکەن و پێیاندەگەیەنن و ناوو نازناوی بەرزیان پێدەبەخشن وەك بڕوانامەی (دکتۆرا) یان مامۆستای زانکۆ، پاشان دەیانگێڕنەوە بۆ زانکۆکان هەتا لەوێوە وردە وردە دەست پێ بکەن و ژەهری خۆیان بڕێژن و کەسێکیش نەتوانێ لەبەردەمیاندا هیچ شتێك بڵێت (چونکە بڕوانامەی دکتۆرای هێناوەتەوەو بیریارە ! !) هەر ئەمەیشە ئەمڕۆ لەزانکۆکاندا پتر پەرچەمی عەلمانیەت بڵندەو بازاڕی گەرمەو خوێندکارانیش هیچیان پێناگوترێ!

٣- وروژاندنی باس و خواسی بڕێ لە مەسەلەکان و ئاڵۆزکردنیان و سەرقاڵکردنی مەردم پێیانەوە، بۆ نموونە مەسەلەی ژنان و مافیان دەخەنە ناو بەرنامەوە، بۆ ماوەیەکی زۆر لەگشت بۆنەو جێگاکاندا دیفاع و بەرگری لێدەکرێ و دەبێتە کێشەو مشت و مڕی ناو خوێندکارانی زانکۆو پەیمانگاکان و، کۆڕو سیمیناری زۆری بۆ دەبەسترێ و، کتێب و نوسراوی لەسەر بڵاو دەکرێتەوەو زۆرێکی زۆرینە ژنانی پێ لەخشتە دەبەن و، بەوە دەتوانن دەنگ و ڕەنگیان بکڕن و مل بەیاسا گرنگە ئیسلامیەکان نەدەن و یاخی بن.

٤- نیشـاندانی زانـا بـەڕێزەکانی ئیسـلام و بانگبـەرانی ئیسـلام -لەڕاگەیاندنەکانـدا بەگشـتی- بەچـینێکی زۆر دواکەوتـەو نـەزان و لـەکاروانی ڕۆشـنبیری بـەجێماوو بـێ سیاسەت و کەم ئاگا لەگۆڕانکارییە نوێکانی دنیاو کاروانی پێشکەوتن و، ماددەپەرست و خـۆفرۆش و خـائین و لەمپـەر لەبـەردەم ئـازادی و ڕزگاریـدا، ئـەوجۆرە تۆمەتانـەو دەیانی تریش، بۆ ئەوەیە کە لای جەماوەرو گەل ئیعتیبارو متمانەیان نەمێنێ و کەسێ بـۆ قسـەیان گـوێ نـەگرێ و، لەولایشـەوە گۆڕەپانەکـە تـەختتر ببـێ بـۆ فێرخـوازانی عەلمانییەت و تەنیا خۆیان بۆ خۆیان کوێخاو دەمڕاسی گەل بن!

٥- وروژانـدنی کێشـەو ئیختلافـاتی نـاو زاناکـان لەمەسـەلە بابەتیـەکان، بـەجۆرێکی وا مەردم وا لێی تێ بگا کە (دین) هەر هەمووی جێگەی کێشـەو ئیختیلافاتـەو بەدەگمـەن شتێك دەستکەوێ زاناکان یەکدەنگ و یەکڕابن لەسەری، مەبەستیش هـەر ئەوەیـە کـە (دین) شتێکی وا یـەقین نیـە هـەتا زاناکـان بتـوانن لەسـەری ڕێـك بکـەون و بێـدەنگبن بەرامبەری.

٦- داهێنـانی قوتابخانـەو زانکـۆو چـەند مەڵبەنـدێکی تـری ڕۆشـنبیری گۆشـکراوو پەروەردەکراو بەشیری بێگانـەو خـەڵکانی دەرەوەو نـەیار بەکۆمەڵگـە ڕەسـەنەکەمان، هەتا زۆر بەجیدییانە هەڵسن بۆ برەو پێدان بەعەلمانیـەت و لاوازکردنـی پەیوەنـدی بـە ئیسلامەوەو نەهێشتنی (التزامات) بەدینـەوەو جورئـەت بخەنـە بـەر کچ و کـوڕە تـازە پێگەیشتووەکان کە ئەوان پتر هەوڵ بـدەن لـەژێر ڕکێفـی ئیسـلام خـۆ ئـازاد بکـەن و، ئـەخلاق و قییـەم شـتێکە ئیسـلام دایهێنـاوە بـۆ زەوتکردنـی سەربەسـتیی و ئـازادیی لەبنیادەم!

ئەمـە کورتەیـەکبوو لـەماناو مەبەسـتی (عەلمانییـەت) و ئاسـەوارە شـەڕوخراپەکانی، خرانە بەر چاوی ئێوەی بەڕێزو دڵسـۆز بـە ئیسـلام و نیشـتمانی خۆشەویسـتمان، بـەو هیوایـە بەزیندوویانـە وەریـان گـرین و، پاشـانیش دیینـی خـوا تێکـەڵ بـە عەلمانیـەت نەکەین و، عەلمانیەت وەك ماناو مەبەسـتە ئەسـڵەکەی خـۆی وەرگـرین و، ئیسـلامیش

بەمانا فـراوان و ڕاسـتیەكەی خـۆی قبـووڵ بكـەین، بـەڵێ ڕاسـتە كـە ئیسـلام كۆمـەڵێ (مەبادئ) و بنەمای خواپـەرستی لەخۆ گرتـووە: نوێـژو ڕۆژوو حـەج و زەكـات... بـەڵام لەهەمانكاتــدا سیاسـەت و ئـابووری و عـەلاقات و پەیوەنـدی دەرەوەو نـاوە لەگـەڵ دەوڵەتان و، ڕێككەوتننامەو یاسای جەنگ و ئاشتیی و (تـەعامول) لەگـەڵ هەمسـایانی خۆیـدا، ئـەوجا هێـزو دەسـەڵات و سـوپاو لەشـكرو ئیـدارەی وڵات و حكوومـەتی و، سەرەڕای ئەمانەش هەموو ئیمان و باوەڕە بەخواو بـەڕۆژی دوایـی و، بەپێغەمبـەران و بەكتێبـەكان و بەگشــت بڕیـارە ئەزەلییـەكانی خـوا (خێریــی و شــەڕی) و حـوكم و بڕیارەكانیش -سەرجەم، گەورەو بچوك- هـەر بـە بەرنامـەو یاسـاكانی خـوای گـەورە، دەبێ ئاوا ئیسلاممان قبووڵ بێت، ئەگینە هەر شتێك، هەر فیكرەو بۆچوونێكی نوێی - بـەدەر لـە ئیسـلام- سـەر هەڵبـداو ڕاكێشـرێتە وڵاتـی ئیسـلامییەوەو موسـڵمانانیش بەخێرایی شان بدەنە بەری و ببنە سەربازو نۆكەری، بێگومانبن هەرگیز دینی ئـاوا لای خـوا وەرنـاگیردرێ، بـۆ نموونـە: موسـڵمانی عـەلمانی، موسـڵمانی دیموكراسـیخواز، نیشتمانی، سۆشیالیستی، بەعسی، لیبراڵی، ماركسی.. هتـد، ئەمانـە دەدرێنـە دواوەو هەڵگری فیكرەكەشی بە موسڵمان حسێب نـاكرێ ((مـن أحـدث في أمرنـا هـذا مـا لـيس فيه، فهو رد))[١٥] ئەو ڕاستیەمان پێدەڵێت، ئێمە خوا ناوی ناوین موسڵمان: (هو سماكم المسـلمين مـن قبـل وفي هـذا..) تـەنها موسـڵمان، بـێ هـیچ (ئیزافـە)و (وەصـف)ێـك: موسڵمانی عەلمانی، یان ماركسی، یان.. یان.. خـوا وەری نـاگرێ، دینەكـەشمانی نـاو نــاوە (ئیســـلام): ﴿ إِنَّ ٱلدِّينَ عِندَ ٱللَّهِ ٱلۡإِسۡلَٰمُۗ ... ﴾ (آل عمـران: ١٩) ﴿ ....وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلۡإِسۡلَٰمَ دِينٗاۚ ... ﴾ (المائدة: ٣)﴿ وَمَن يَبۡتَغِ غَيۡرَ ٱلۡإِسۡلَٰمِ دِينٗا فَلَن يُقۡبَلَ مِنۡهُ ... ﴾ (آل عمران: ٨٥)، دیارە دینێكی وا بەرنامەی چڕوپڕیشی هەیە، بـۆ گشـت بـوارو لایەنـەكانی ژیـان، (٢٣) ساڵ ژیـانی پێغەمبـەر ﷺ و پـاش ئـەویش خەلیفـەكانی و بەهـەموو دەسـەڵات و دام و دەزگایەوە بوویان: ڕاگەیاندن، دارایـی، ڕێكخسـتن، سـەربازیی و ئـەو هـەموو جـەنگ و (فتوحات)و، ڕێككەوتن و پەیمان لەگەڵ جولەكەو نەیارەكانی، ئاخۆ ئـەو شـێوە جـم و

---

(١٥) صحيح البخاري – كتاب الصلح، باب إذا اصطلحوا على صلح جور فالصلح مردود – حديث : ٢٥٧١

جووڵ و بەدەستگرتنی دەسەڵاتە لەگەڵ ئەو هەموو ترسە لە خوا مانای جۆشدانی (دین) و دەوڵەت پێکەوە نیە؟ مانای بەڕێکردنی دین و دنیا پێکەوە نیە..؟ دەسا بۆ ئیتر پاش ئەو تەجروبە سەرکەوتووە، پڕووپاگەندەی لێکبڕانی دین و دەوڵەت بکرێت، داخ ئەو داخەیە ئەمڕۆش دەیانەوێ بەفەتوای هەندێ مامۆستاکان (عەلمانیەت) بشەرعێنن و (بیقەولێنن) و بیکەنە بەدیلی ئەو ئیسلامەی سەدان ساڵ حکوومەت و دەسەڵاتداری کردووە.

پاش ئەم کورتە باسە لەسەر (عەلمانیەت) ئەوسا دەچمەوە ناو باس و مەبەستەکەی خۆمەوە:

**زانایانی ئیسلام و کاری سیاسەت**، کە بەداخەوە هەندێ کەس داوای دوورکەوتنەوەی (مەلا)یان دەکا لەسیاسەت و ئۆقرە گرتنیان لەچوارچێوەی مزگەوتەکاندا!

خوای گەورەش لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرمووێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَأُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنكُمۡۖ فَإِن تَنَٰزَعۡتُمۡ فِي شَيۡءٖ فَرُدُّوهُ إِلَى ٱللَّهِ وَٱلرَّسُولِ إِن كُنتُمۡ تُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِۚ ذَٰلِكَ خَيۡرٞ وَأَحۡسَنُ تَأۡوِيلًا﴾ (النساء: ٥٩).

(ئیبن کەسیر) دەڵێ: (وقال علی بن ابي طلحة، عن ابن عباس: ﴿وَأُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنكُمۡۖ﴾ يعني: العلماء. ئیبن عەباس لە تەفسیری ﴿وَأُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنكُمۡۖ﴾دا دەڵێت: خوای گەورە کە دەفەرمووێ: ئەی خەڵکانی خاوەن باوەڕ! بەرفەرمانی خواو پێغەمبەری ئەوو کاربەدەستانی خۆتان بن، مەبەست بەو کاربەدەستانە خەڵکانی فیقهزان و دیندارن (موجاهیدو عەتاو حەسەنی بەصری و ئەبو العالیە)ش تەفسیری بەزانایانی دیینی ئیسلام دەکەنەوە، ئەگەرچی دەشکرێ گشت کاربەدەستە صالح و زانا بەرجەستەکان بگرێتەوە، کەوابوو پێویستە کاربەدەستانی موسڵمانان شەرعزان و دیندار بن، چونکە ئەوان دەزانن لەکاتی پێشهاتنی رووداوو کێشەیەك چۆن بیگێڕنەوە لای (قورئان و فەرموودە)کان و بەپێی بڕیاری ئەوان چارەسەری بکەن.

ئەگەر ئێمە بەویژدانەوە سەیرێکی مێژووی پاك و خاوێنی موسڵمانان بکەین، زۆر بەباشی بۆمان دەردەکەوێ کە هیچ کاتێ (تەقسیم) بەندی نەبووە لەناویاندا: دەستەی کاربەدەستان جیا بکرێتەوەو، زاناکانیش هەڵبوێردرێن و کارو وەزیفەی سەرەکی و گرنگیەکانیان پێنەدرێ، ئەو دەمەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ لەژیاندا بووە فەرمان بەریکراوەو، بۆ هەر ئیش و کارێکی تریش پیاوی گونجاوو شیاوی دیاری کردووە وەکو دەگوترێ: (الرجل المناسب للمكان المناسب)، هەر لەدانانی (والی) بۆ وڵات و ناوچەکان، هەتا دیاریکردنی ئامیر هێزو سەر لەشکرو فەرماندە سەربازییەکان، وەیان ناردنی شاندێك بۆلای دەستەڵاتدارێك، پاشانیش سەردەمی خەلیفەکان هەروا، دوای ئەوانیش -بەتایبەتی سەردەمی ئەمەویی و عەبباسیەکان- زۆرێکی زۆرینەی کاربەدەستان زاناو دیندار بوون، ئەگەرچی لەو دواییەدا -بەداخەوە- دنیاداری زاڵبوو بەسەر دینداریداو ئێستاش دوژمنانی دیینی خوا مێژووەکەیان شێواندوون و هەریەکەیان کۆمەڵێ تێبینیان کەوتۆتە سەر، هەرگیز ئەم بیروو بۆچوونە ڕەواجی نەبووە کە زاناکان لەکارە گرنگەکان وەدەرنێن و خەڵکانی نەزان کارە سەرەکیەکانیان پێ بسپێرێ، بەڵام ڕێککەوتووە (هارونە رەشید) بۆتە خەلیفەو، ئیمامی شافیعی نەبووە، ئیتر هەر هۆو سەبەبێك بووبێ بەبەرهەڵسکار، خۆ ئاشکرایە یەکێ لەمەرجەکانی (خەلیفە) ئەوەیە لێزان و سیاسی بێ، ئیتر مەلابێت، یان غەیرە مەلابێ، هەر کات مەرجەکانی تری (ویلایەت) یان بڵێین (خەلافەت) جێبەجێ بوون و ئەمەش هەبوو، هەر دەبێ کاروبار بەو بسپێردرێ، تەنانەت ئەگەرچی (تەقوا)یشی کەم بێ، چونکە لەو جۆرە کارانەدا لێزانی و لێبڕان گرنگترەو بەرژەوەندی گشتیی ڕەچاو دەکرێت، نەك (تەقوا)و (وەرع) و (زوهد) و نەشارەزا لە ڕەوتی دنیای سەردەم، وادەبێ مامۆستایەك زانای ئایینی زۆر سەر لێدەرچووو سەلیقەدارە لە بەڕێوەبردنی ئیش و کارەکاندا، هەیشیانە سەری لێدەر ناکا، دیارە هیچ کەسێك ناڵێت ئەمەی دووەمیان هەر دەبێ (ویلایەت)ی گشتی پێبسپێردرێ، لەولایشەوە دەشێ

موسڵمانێكی سادەو كەمزانست زۆر ژیرو بەئیدارەو بەتوانابێ، ئەگەرچی (مەلا)ش نەبێ، بێگومانە ئێمە كاروباری گشتی وڵات، وەیان ناوچەیی بەم دەسپێرین، بەڵام دەبێ هەمووشمان ئەو ڕاستی و حەقیقەتە بزانین كە مامۆستاكان زۆر حەزیان لە ململانێ و چەلەحانێ نەبووە، كاتێ زانیبێتیان -لە هەركارێكدا- ڕێزو حورمەتی خۆیان ناگیردرێ، وەیان هەر لەسەرەتاوە زانیبێتیان حەق و عەداڵەتیان بۆ ناچەسپێ، ئیدی لەو كارە پاشەكشێیان كردووە، وەیان وەریان نەگرتووە لەترسی خوا، نەوەكو دەرفەت نەدرێ بڕیاری دادگەرانە بدەن.. كاتی خۆیشی ڕاكردن لەقەزاوەت هەر ئەوە بووە، نەك لێیان نەزانیبێ، بەتایبەتی سەردەمێك كە بەزۆرو ناهەق دەستەیەك بچنە پێشێ و بەزۆر دەستبگرن بەسەر كاروباری وڵاتداو، بێدینیشبن، وەیان كەم دینبن، ئاشكرایە كاربەدەستی ئاوا بەگەزو پێوانەی خۆی دەیكاو بەرژەوەندی خەڵكەكانی خۆی پێشدەخات نەك لایەنە شەرعییەكەی، كاتێكیش دنیای ئیسلام گەورەو فراوان بوو كار كەوتە دەستی ئەمەویی و عەباسییەكان -ئەگەرچی گشتیان موسڵمان بوون، بەڵام بازاڕی دنیا زاڵبوو بوو- زانا پسپۆڕە موسڵمانەكان وردە وردە خرانە ئەو لاوەو تەمەحی ئیدارەی وڵاتیان نەماو بێ هیواشبوون ئەوكاربەدەستانە گوێیان بۆ بگرن، بۆیە بەناچاری هەریەكە چوویە قوژبنێكەوەو دەستی دایە كتێب نووسین و لێكۆڵینەوەو لەسەر ئەو باس و مەسەلانەی باسی سیاسەت و شێوەی حوكمڕانی ناكەن و زیان بەئیدارەی كاربەدەستەكان ناگەیەنن، ئەگەر كەسێكیشان شتێكی ئاوا لەمێشكا بووبێ، خێرا بڕیار دەرچووە بۆ گرتنی و، لاوانەشە لەسێدارە درابێ، ئیمامی شافیعی یەكێك بوو لەوانە كە ڕزگاری بوو.

دەشكرا بڕێ كات ئەو (والی)یە لاوێكی كاڵ و كرچ و دنیا ویست بووبێ و حەزی لە باسكردنی حەڵاڵ و حەرامی مەلایان نەكردبێت، بەتایبەت لەو سەردەمانەدا كە منداڵی سەربێشكەش دەكرا بەوەلیعەهدو جێنشین و هێزو دەسەڵاتی سەربازیشیان بەدەست بووە، ئیتر زانایان لەبارودۆخێكی ئاوا چ بكەن و چ بڵێن لەگەڵ ئەو جۆرە

بنیادەمانەدا؟! ئەوسا ئەو گوشارو زۆرە ملێیە وای لەزانایان کرد هەرکەسە بڕواتە مزگەوتێکەوەو دەرگای حوجرەکەش توند توند پێوە بدا لەداخ و حەسرەتی کاربەدەستانی زەمان، کاربەدەستانیش بەئارەزووی خۆیان –بێ ڕەچاوکردنی لایەنی شەرعی- دەستیان دایە بەڕێوەبردنی وڵات و بوونە پێشەنگی سەرفرازیی و بەختیاری، مەلاش جگە لەوە کە جێگەی پێغەمبەرەو دەبێ ئەو حاکم بێ و جڵەوی وڵات بەدەست ئەووەوە بێت، هێشتا دەشترسا بینێرن لەحوجرەکەیدا باڵبەستی بکەن و بیگرن، ئیتر ئەو جۆرە کردەوانە وایان کرد کە زانا بەڕێزەکانمان لەئیدارەی وڵات بەشبڕاو بن و لەڕەوتی دنیاش بێ ئاگابن و، بێجگە لەهەندێ مەسەلەی دەستنوێژو ڕۆژوو.. هتد، هیچ پرسیارێکیان لێنەکرێت، وەیان لەلادێ و گەڕەکەکانی شاردا پێشی خۆیانیان بدەن بۆ سەرەخۆشی نەخۆش و تەعزییەو ئاشتەوایی خەڵکانی کێشەدارو هەندێ کاری زۆر بچووکتر..! بەڵام لەولاوە کێ بەڕێوەبەری وڵاتە؟ کێ وەزیری دەرەوەیە؟ دارایی بەدەست کێوەیە؟ مەنهەج و بەرنامەی وەزارەتی پەروەردە چۆن دەنووسرێ؟ ئەوانە کاری سیاسەتن نابێ بیریان لێبکاتەوە!!

هێندێ دەڵێن: مەلا یان دەبێ هەر لەمزگەوتەکاندا کاری خۆیان بکەن و نابێ بچنە ناو سیاسەتەوە، تەنانەت حیزبایەتیشیان پێ ڕەوا نادەن، ڕازی نین لەحیزبێکی چکۆلەی ئیسلامیشدا -کە تۆمەتبارە بەئیرهابی و وەهابی و کۆنە پەرست!- کار بکەن لەگەڵ ئەو هەموو مەحروومیەتەو بێبەشبوونەیان لەئیدارەو خێرو خێراتی وڵات، ئەوانە دەڵێن: دەبێ زاناکان لەمزگەوتەکانەوە هەر خەریکی ئامۆژگاریی و نەسیحەتی کار بەدەستەکان بن و نابێ بیر لەسیاسەت بکەنەوەو ببنە ئەندامی مەکتەبی سیاسیی و شوراو ڕابەر! چونکە پسپۆڕ نین و نازانن چۆن ئیدارەی وڵات بکەن؟ سەرم سوڕ دەمێنێ لەو کەسەیە کە ڕازی نابێ مەلایەك بەو هەموو خوێندن و گەشت و گەڕو ئەخلاقیاتەوە ببێتە ئەندامی حیزبێکیش، نەك ڕابەرایەتی وڵات، بەڵام کاروبار دەسپێرێ بەخەڵکانێ کە زۆربەیان بڕوانامەیان هەر نیەو بێ تەجروبەشن، من وادەزانم

ئەو فیکرەو بۆچوونە تەنیا خزمەتی فیکرەو بۆچوونی عەلمانیەکانی ئەمڕۆی دنیا دەکا، چونکە ئەوانن دەڵێن: زانایان دەبێ هەر لە مزگەوتەکاندا خزمەتی خەڵکی گەڕەك بکەن و، جەنابیشیان بۆخۆیان دەمڕاس و سەرۆکی وڵاتبن هەر لەمەیشەوە دابڕینی (دین) لەدنیا سەری هەڵداوە.

خاوەنانی ئەو بۆچوونانە دەبێ بە ئاشکرا تەوبەو پەشیمانیەکی چاك و پاك بکەن و جارێکی تر ئەوەی عەلمانیەکان شەرمیان دەکرد بینووسن، وەیان لەسیمینارێکدا بیڵێن بیری لێ نەکەنەوە..، زانایان و شارەزایانی دینی خوا میراتگرو جێنشینی پێغەمبەرانن، دەبێ پێغەمبەری خوا چۆن کاری کردبێت بۆ سەرخستنی ئەو دینەیە، ئەمانیش هەر لەو ڕێبازەوە هەوڵ بدەن و تێبکۆشن، دیارە کە پێغەمبەری خوا ﷺ (قودوە) و (ئوسوە)ی موسڵمانانە، بەتایبەتی زاناکانیان، بۆ ئەمەش ئایەتی:﴿ لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِّمَن كَانَ يَرْجُوا۟ ٱللَّهَ وَٱلْيَوْمَ ٱلْـَٔاخِرَ وَذَكَرَ ٱللَّهَ كَثِيرًا ﴾ (الأحـــزاب: ٢١).

باشترین بەڵگەی ئەو ڕاستیەیە، پێغەمبەر ﷺ خۆی قیادەو ریادەی گشت موسڵمانانی دەکرد، کاروباری سەربازی گەلێ جاریش خۆی نەخشەی بۆ دا دەناو، هەر خۆیشی سەرکردەی بەرەی جەنگەکانی دەکرد، پەیوەندی بەدەرەوەو ناوەوە هەر خۆی هەڵیدەسووڕان، نامەو شاند ناردن بۆلای پاشاکان و سەرۆك عەشیرەت و قسەو دانیشتن لەگەڵ خاوەن نامەکاندا هەر بۆ خۆی بوو، لەلایەکەوە وەحیی و نیگای وەر دەگرت، لەلایەکی ترەوە سەرپەرشتی باروو حاڵی گشتی موسڵمانانی دەکرد، ئیمام و خەتیبی موسڵمانان بوو، هەروەکو داوەریی خەڵکیشی دەکرد، مەبەست ئەوەیە کە (دین)، وەیان بڵێین زاناو شارەزایانی ئیسلام دەبێ لەتەواوی کاروباری ژیانی وڵاتدا دەستیان هەبێت، نابێ ئەوەندە بەکەم تەماشا بکرێن، وەیان ئەوەندە دوور بخرێنەوە لەڕەوتی دنیای سیاسەت و ئاگایان لەهیچ شتێك نەمێنێ، ئێمە ڕامان وایە دەبێ زاناکان پێشەنگ و سەرقافڵەی بەڕێوەبردنی کاروباری ئایین و دنیابن، چونکە ئەوکاتە کە پێغەمبەری خوا، پێغەمبەر بوو وەحیی بۆ دەهات، لەهەمانکاتدا دەهاتە بازاڕیش

تا بزانێ چ باسەو خەڵكی چی دەكا؟ بۆیە دەست دەخاتە ناو گەنمە خوساوەكەی كابراو پێی دەفەرموێ:((من غشنا فليس منا..)). أخرجه مسلم من حديث سهيل عن أبيه عن أبي هريرة أن النبي ﷺ قال: "من غشنا فليس منا" وأما شرح الحال في هذا الأحاديث فلم يخرجاه، وكلها صحيحة على شرط مسلم". ووافقه الذهبي! وقد وهم الحاكم في هذا ونسى. تعليق أحمد شاكر في كتاب مسند الامام احمد رقم الحديث: ٧٢٩٠. وەشێخی ئەلبانی ئەم رووداوە بە فەرموودەیەكی (حسن لغيره) دادەنێ/ صحيح الترغيب والترهيب ١٧٦٦.

ئێمە ئەو سیاسەتەی دوورخستنەوەی زانایان لە گۆڕەپانی ژیان و ڕابەرایەتی ئوممەت، بە سیاسەتێكی گەندەڵی دادەنێین، بۆچی ئەگەر مەلایەك و نا مەلایەك لەیەك كۆلێژدا بخوێنن و دەربچن، خۆ -گومانیش نیە كە مەلاكە زۆر زرنگترو دڵسۆزترە- كەچی نا مەلاكە كارو وەزیفەی شیاوو بەرزی دەدرێتێ و بەڕۆشنبیریش دادەنرێت، بەڵام مەلاكە نەخۆیی و، نە بڕوانامەكەی ڕەواج و بازاڕی نابێ! مەلاش ئەگەر باسی سیاسەت بڤە نەبێ بۆی، وەك ئەو خەڵكانەی ترە بەهاوڵاتی پلە یەكەم دابنرێت و سەرو سیماو بڕوانامەی بخوات، دەبێ چی كەمتر بێ لەو خەڵكانەی ترە..؟! خۆ بێجگە لەوەش ئەگەر ویژدان هەبێت چاوێك بگێڕدرێ -هەر هیچ نەبێ- بەشۆڕشەكانی گەلی كورددا، چاك دەزانرێ كە هەر مەلا بووە جەماوەری بێدارو وشیار كردۆتەوەو پاشانیش خۆی قیادەی ڕاپەڕین و شۆڕشێكی دوورو درێژی كردووە: لەكوردستانی عێراقدا سەركردەو فەرماندەی زۆر دیاری ناو مێژوو، شێخ مەحموود، دواتریش مەلا مستەفای بارزانی، لە كوردستانی توركیەیش شێخ سەعیدی پیران، دیارە كە جوامێرانە هەڵساو بووە بە خەمخۆری ئەو میللەتە ستەمدیدەیە، لەكوردستانی ئێرانیش پیاوی وەكو قازی محمد ریادەی ئەو شۆڕشەی كردووە، بەشایەتی مێژووش زۆر سەركەوتوانە خزمەتی شۆڕشەكەیان كردووە و نزیك بەئەنجام بەدەستهێنان بوونەتەوە، ئەگەر سیاسەتی نێودەوڵەتی هێشتبای، بەڵام بەداخەوە كورد هەركات نزیك بووبێتەوە لە هەدەف و ئامانجی خۆی كراوەتە قوربانی سیاسەتە

گەندەڵەکانیان و بەزەییان پێیا نەهاتووەتەوەو هەرەسیان پێ هێناوە، وا دەزانم هەرەس هێنانەکەی هی ئەوە نەبووە پیاوە دیندارەکە، یا زاناکە لێی نەزانیبێ، بەڵکو لەوانەیە خۆی و گەلەکەی تەسلیم بەوان نەکردبێت و باش بەئارەزووی ئەوان ملی ڕانەکێشابێت، ئەوەتە ئێستاش پاش ئەو هەموو تەسلیم بوونەیە ئاییندەی کورد هەر نادیارەو کەس نازانێ چارەنووس چۆن دەبێ؟ ئومێدەوارین ئەمجارەش وەکو جارانی پێشوومان پێنەکەن و نەماندەنە بەیعی کڕین و فرۆشتنێك، وەکو شۆڕشەکانی تر.

ئەگەر ئاماژەیەکیش بۆ سەرهەڵدانی بزووتنەوەی ئیسلامی لەکوردستان/ عێراق بکەین، دووبارە دەبینین لەژێر ریادەی مامۆستا مەلا عوسمانی ڕەحمەتیدا، لە ماوەیەکی زۆر کەمدا قۆناغی زۆری بڕی و، زۆر سەرکەوتوانە لەدەرەوەو ناوەوەی کوردستاندا بەپەلە گەشەی دەکردو قبوولی جەماوەرو گەل بوو، وەشان بەشانی ڕووداوە نوێیەکان سەرکەوتوانە هەنگاوی دەناو تووشی تەنها هەڵەیەکی سیاسیش نەبوو، لای جەماوەری کوردستان، بگرە لای سیاسی و لایەنە سیاسیەکانی کوردستانیش جێی ڕەزامەندی بوو، لای دراوسێکانمان سیاسەتی ڕۆشن و پەسەندی هەبوو، بەڵام بۆ دوایی کە ناحەزان نەیانویست ئەو بزووتنەوەیە ئا بەو پێیە گەشە بکاو کۆنترۆڵی کوردستان بکا، هەڵسان دەیان گیرو گرفتیان بۆ نایەوە، بچوکەکەیان تەفرەقەو ماڵ ماڵۆکێ و منوو تۆیی و، دەرەنجامیش بەو شێوەیە دیتمان چی بەسەردا هات، هەروەکو شۆڕشەکانی تری گەلی کوردی لێهات، خۆ دیارە بێ هەڵەش هەر نەبووە، دیسانەوە ئەگەر سەرنجێکی شۆڕشی کۆماری ئیسلامی ئێران بدرێت، پاش لەبنهێنانی (٢٥٠٠) ساڵەی ڕژێمی شاهنشایی، بەقیادەی ئیمام خومەینی، چاك چاك دەزانرێ کە زانایان نەك هەر ئەندامێتی حیزبێکیان پێ ڕەوا نەبینرێ، بەڵکو توانیویانە گەورەترین زلهێزی دنیای سەردەمی خۆی لەبنبێنێ و، لەجێی ئەویشدا دەستووری ئیسلامیی ڕابگەیەنێت و، پاشانیش جێگا زۆر گرنگەکانی ئێستاش –پاش (٢٤) ساڵ هەر بەدەستی (مەلا)کانەوەیە، رابەرایەتی هەر مەلا، سەرۆکایەتی هەر مەلا، وەزارەتە گرنگەکان هەر مەلا، وەزیری اطلاعات هەر مەلا، وەزیری ناوخۆ هەر

مەلا هێزی قەزایی هەر مەلا.. وە هەروەها، لەگەڵ ئەو ململانێیەدا لەگەڵیاندا دەکرێت لەلایەن زلهێزەکانەوە توانیویانە خۆیان و جەماوەرەکەیان لەو هەڵدێرانە بپارێزن، جەنگی سەپێنراوی (٨) ساڵەی عێراق، کە هەموو چەکێکی حەرام و کۆ کوژیی هەبوو لەبەرامبەر ئێرانەوە درایە (صدام)، بەڵام زۆر بەژیرانەو بەرپرسانە -پاش ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ هەموو دەسەڵاتدارانی دنیادا- خۆیانیان هێنایە دەرێ و، سەدامی نۆکەرو بەکرێگیراوی ئەم لاو ئەولاش، هەر درێژەی بەتاوانەکانی خۆیدا، تا دەرەنجام خەیانەتی بە خۆیی و سوپای دلێری عێراق و گەلی عێراق و خاکی عێراق و دینی عێراق کردو، ئەو وڵاتە (دار الخلافە)یەی تەسلیمی بێگانە کردو ئەو هەموو سەربازە بێ دیفاعانەی خستە بەر کرۆزو هۆك و فرۆکەی شەبەح و (بی ٥١) و (بی ٥٢) ئینگلیزو ئەمریکا، دە ئاخۆ سیاسەتی ئەو مەلایانە باشبوو، یان سیاسەتی ئەو (عەمیلە)..؟

دەکەوابوو ئەو قسەیە زۆر هەڵەیە کە بەگشتی بگوترێ: سیاسەتی مەلایان بەکەڵك نایەت، ئەوەش هەر هەڵەیە کەسێ پێی وابێ هەرکەسێك لەزانکۆکانی خۆرئاوا، یان خۆرهەڵات دەرچێ، وەیان ئەڵقە لەگوێی ئەوان بێت -ئەگەرچی بڕوانامەشی نەبێ- سیاسەتی سەرکەوتووەو دەتوانێ سەرکەوتوانە وڵاتەکەی وەپێش بەرێ..! دەکرێت ئەمە بگوترێ: کە (مەلا) چونکە عەمالەت و خۆ فرۆشی و دینفرۆش و نیشتمانفرۆشی پێناکرێ و ناتوانێ تەسلیمی ئەو زلهێزانە ببێ، لێی قبووڵ نەکرێ و بڕێ جار زوو لەناو ببرێ، بەڵام عەمیلێك -ئەگەرچی زیانیش بە هەموو خەڵکانی دنیا بگەیەنێت- چونکە جێگای رەزامەندی ئەوانە هەر بمێنێتەوە هەتا بەرژەوەندییان تەواو دەبێ! ئەمەش زۆر جێگەی خەم و خەفەتە کە لەلایەن ئیسلامیەکانیشەوە هەر ئەو ڕێزەی بگیرێت و بگوترێ کە: زانایان مافی بەشداربونی سیاسەتیان نیە، زۆر بەزەقیش لەناو هەندێ حیزبی ئیسلامیشدا ئەو سیاسەتە پیادە دەکرێت، مەلایەکی زۆر باش و بەتەمەن و بەعیلم و بەتەقواو وریاو شارەزا لەمزگەوتێکدا هەر کارو وەزیفەی پێش نوێژی و وتاری

هـــەینی و وانـــە وتنـــەوەی پـــێ دەدرا، بـــەڵام خـــەڵكانێكی زۆر لـــەخواری ئـــەوەوە، كەمزانست، كەم تەجروبە، نەناسـراو دەبرایـە سـەری سـەرەوەو سیاسەتیشـی قبـووڵ بوو، لەولایشەوە عەلمانیەكان هەرگیز ڕازی نابن مـەلاكان لـەژێر سـێبەری خۆیانـدا بـۆ خۆیان كار بكەن و وەزیفەی گرنگ و بەرزیان بدرێتێ، بەڵام بۆ خۆیان و لەژێر سێبەری خۆیاندا هەموو كارێكی سیاسییانە بەمەلاكان دەكەن و تەنانەت بۆ (پەرلەمان)یش هەر شیاون و رایان وەر دەگرن، ئەوەیە بـە دوو (كـەیل) پێوانـە دەكرێـت، ئەگـەر مـەلا بـۆ خۆی و، بۆ ئیسلامەكەی -سەربەخۆ- حیزبێك دابمەزرێنێ -هەرگیز لێی قبووڵ نـاكرێ و، سیاسەتی جێگەی ڕەزامەندی نیە، كەچی ئەگەر بۆ حیزبێكـی عـەلمانی، وەیـان بـۆ حكومەتێكی عەلمانی كار بكا، زۆر بلیمەت و زرنگ و سیاسەتمەدارە..!!

ئـــەركی مزگـــەوت و دەرەوەی مزگـــەوت هـــەر لەسەرشـــانی ئیمـــامی ئـــەبوو بـــەكرە! مەبەستم ئەوەیە دەبوو بە ئەبوو بەكریان گوتبا: لەبـەر ئـەوە ئـەو حورمـەت و ڕێـزەی پێشـنوێژی مزگەوتـەت لەدەسـت نـەدەیت دەخیـل سـەد دەخیـل لەبازنـەی مزگـەوت مەچۆرە دەرێ و تێكەڵی سیاسەت مەكە، ئەگینا مەردم وەك جاری جـاران -بـەر لـەوە ببیتە خەلیفە- گوێبیستی قسەو گوتارت نابن، چونكە پێشنوێژ هەر دەبێ لە میمبەری مزگەوتەكانەوە فەرمان بەچاكە بداو، ڕێ لەخراپە بگرێت، لـەوە بـەولاوە ئەگـەر خـۆی بخاتە ناو ململانێی (ئەنصار) و (مهاجر)ەوە بۆ دامەزراندنی (خەلافەت)ـەكەی، وەیـان دواتر ئەگەر ببێتە سەركردەی (سوپا)و ڕووبەڕووی عەرەبـە هەڵگـەڕاوەكان ڕاوەسـتێ، بەتایبـەتی ئەگـەر لـەو نێوانـەدا خـەڵكێكیش بكوژرێـت، جێگـەو پێگـەی خـۆی لای جەماوەر لەدەست دەداو لای خەڵكی بەپیاوێكی سیاسی و دڵڕەق دەدرێتە قەڵەم، بەر لەوە بەپیاوێكی ڕۆحـی و پەپوولـەی نـاو مزگـەوت دابنرێـت، چـونكە ئەگـەر جـەماوەر تێگەیەنرابێ و پێگەیەنرابێت كە ئیسلامی میحرابـی مزگـەوت و گۆڕەپـانی جیهـاد هـەر یەك ئیسلامە ئیتر هەرگیز هەڵەی ئاوا ناكاو دوێنێ و ئەمڕۆی ئەو پێشنوێژە بەدووچـاو سەیر ناكا، ئەو بیرو بۆچوونانە هی پەنجا ساڵ لەمەو پێشەو ئێكسپایەر بـوون، بـەدەر

لەوەش مەلا ڕێزو حورمەتی بۆ یەكراوو (موزەییەفی)ی بۆچییە؟ مەلا نەتوانێ باسێكی كاروباری نێودەوڵەتی سەردەم بكاو، حاكمیەتی خوا بخاتەوە گەڕ، دەبێ چ ڕێزێكی مابێ هەم خۆی و، هەم بیرو باوەڕەكەی؟

كەوابوو چار ئەوەیە كە گەل و جەماوەر ئاستی ڕۆشنبیری ئیسلامییانەی پەرە پێبدرێت و مەلا بخرێتەوە جێگە ئەسڵەكەی خۆی (پێشنوێژی مزگەوت) و بەرپرسی كاروباری دەوڵەت لەو ناوچەیەدا، وا دەزانم بەتەنها دوژمنانی دینی خوا ڕازی نین مەلاو زانای ئایینی لە مزگەوت بێتە دەرێ و خۆی بدات بەدەم سیاسەتی دنیای ئەمڕۆوەو نەهێڵێ كارە سەرەكیە ئیسلامییەكان بكەونە ژێر دەستی ئەوان، ئەگەر دیینی خوا ڕیسواو كەمقەدر بوو، وەیان فڕێدرایە زاویەیەكی مزگەوتەوە، ئەگەر مەلا نەیەتە دەر، دەبێ كێ بێتە دەرو دەنگی ئەو شتە ناپەسەندانە بدا؟ ئەمە لە لایەكەوە، لەلایەكی دیكەشەوە ڕێزو حورمەت تەنها لەپاڵ ڕێزو حورمەتی ئیسلامدایە، كەئیسلامەكە ڕێزی نەما، دەبێ كێ ڕێز لەو مەلاو زانایانە بنێ..؟ خۆ بەگژاچوونی كاری ناشەرعیی و پێچەوانەوەی دیینی خوا، جیهادە لەڕێی خوادا: ﴿...يُجَٰهِدُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلَا يَخَافُونَ لَوۡمَةَ لَآئِمٍۚ﴾ (المائدة: ٥٤).

هیوادارم بەرەو تێگەیەشتنێكی لووتكەو، بەرەو ئاسۆیەكی ڕۆشن
گشتمان بێ وچان و بێماندووبوون ڕێ بگرینە بەر
هەتا دەگەینە پیرۆزیی و پیرۆز دەبین.
جومادی دووەمی ١٤٢٣ك – ئابی ٢٠٠٣ز



# وەڵامێـــکی پێـــویست بۆ بابەتی:

# (مەزهەبەکان چۆن لە ژنان دەڕووانن)

**لە نووسینی: سامان نووری – سویسرا**

**وەڵامی مامۆستا ئەحمەد کاکە مەحموود**

١٤١٩/١/١١ کۆچیی

٥/٨/ ١٩٩٨ زاییینی

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

*﴿ ...فَمَالِ هَٰٓؤُلَآءِ ٱلۡقَوۡمِ لَا يَكَادُونَ يَفۡقَهُونَ حَدِيثٗا ﴾ (النساء: ٧٨).

*﴿ يَعۡلَمُونَ ظَٰهِرٗا مِّنَ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَهُمۡ عَنِ ٱلۡأٓخِرَةِ هُمۡ غَٰفِلُونَ ﴾ (الروم: ٧).

*﴿ وَلَقَدۡ ذَرَأۡنَا لِجَهَنَّمَ كَثِيرٗا مِّنَ ٱلۡجِنِّ وَٱلۡإِنسِۖ لَهُمۡ قُلُوبٞ لَّا يَفۡقَهُونَ بِهَا وَلَهُمۡ أَعۡيُنٞ لَّا يُبۡصِرُونَ بِهَا وَلَهُمۡ ءَاذَانٞ لَّا يَسۡمَعُونَ بِهَآۚ أُوْلَٰٓئِكَ كَٱلۡأَنۡعَٰمِ بَلۡ هُمۡ أَضَلُّۚ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡغَٰفِلُونَ ﴾ (الأعراف: ١٧٩).

الحمدلله، نحمده، ونستعينه، وأؤمن به، وأتوكل عليه، وأشهد ان لااله الا الله وحده لاشريك له، وأن محمدا رسول الله الى الثقلين – الإنس والجن – ليعلمهم شئون حياتهم الدينية والاجتماعية، والسياسية وغير ذلك، فصلوات الله وسلامه على من سعى وحاول طوال سني حياته لإنقاذ البشرية من الأساطير والخرافات والترهات.

## پاشان:

ڕۆژی ١٤١٨/١٢/٢٥ك، بەرامبەر بە ١٩٩٨/٤/٢٢ز، نووسینێکم بەرچاوکەوت لەژێر ناونیشانی (مەزهەبەکان چۆن لە ژنان دەڕوانن). لە خوار ئەم نووسینەوە نووسراوە (نووسینی: سامان نووری – سویسرا). لە بەرگەکەی دەڵێت: (دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی کوردی سویسرا).

وە ئەو نووسینە کراوە بە دوو تەوەرەوە:

**تەوەرەی یەکەم:** چۆنییەتی سەرهەڵدانی ئایینی ئیسلام.

**تەوەرەی دووەم:** ئایینەکانی (جوولەکەو مەسیح و ئیسلام) یان زنجیری کۆیلایەتی لە دژی مافەکانی ژنان، وە لە ١٩٩٧/١٠/١٥ز بڵاوکراتەوە.

دڵم پێ خۆش بوو. ! بەڵکو دەستەیەك لە ڕۆشنبیرانی گەلەکەمان لە دەرەوەی وڵات و لە (غوربەت)دا لەسەر مەسەلەو کێشەی گەلی کورد دوابن و خامەیان وەدەست گرتبێ، وە ویستبێتیان ئەو قەزیە پتر بە قەڵەم لە ئەوروپادا بناسێنن و باسی (مظلوم)بیەتی نەتەوەیەکی (٣٠ – ٤٠) ملیۆنی تیا کرا بێت، کە چۆن پاش (١٣) سەدە ئەو گەلەیە بەش بەش کراوەو خێرو بەروبوومی دەڕفێنرێ بۆ ئێرەو ئەوێ، زمان و کالاو بالای یاساغ کراوە، فەرهەنگ و کلتووری پێچراوەتەوەو لە (ڕەفە) نراوە...؟!

پێم وابوو دەڵێن بۆچی نەتەوەیەکی ڕەسەنی ئاوا خاوەنی تەنها بوستێك خاك نەبێت و، کرابێت بە شەڕگەی ئەم و ئەوو سیاسەتی خۆیانی تیا بلاو بکەنەوە.. وام پێ چاکبوو سکالای ئەوە بکەن.

بەلام.... بەلام.... بەلام بەداخەوە – وەك باوی بێ ناوچاوی کورد– سەیر ئەکەم دەستەیەکی (ئارەزوو) پەرست، هەموو فیکرو بیرو هۆشێکیان ئازادکردنی ژنان و حەلاڵ کردنییەتی بێ دانانی هیچ (شەرت و قەید)ێك لەبەردەم ئارەزووی (جینسی) بێ سنووریاندا... نێرو مێ بە یەکەوە بێ سنوور، لەسەر شەرەفی ئەم و ئەو ڕابوێرن، وەك گۆمی مەلەکردن هەرکات ویستیان خۆیانی تێ فڕێ بدەن، تیرەو نەوەو وەچەو بنەڕەت نەناسرێتەوە...

زۆر جێگەی سەرسوڕمانیش نییە چونکە کۆمەڵە خەڵکێکی ئاوا بەنج کراو لە ئاستی قەزییەی سەرەکی خۆیان لەناو هەموو نەتەوەو گەلێکدا هەیە. بە هەرحاڵ لەو نووسینەدا بە سەدان خاڵی ژەهراوی نووسراوەو تۆمار کراوە لەسەر ئیسلامی پیرۆز..!

نە هەر ئەوەندە بەڵکو زۆر بە ڕاشکاوی دەڵێت: (ئایینی ئیسلام وەك هەموو ئایینەکانی پێش خۆی سوودی لە هەل و مەرجی ماددیی و مەوزوعی کۆمەڵگا وەرگرت بۆ بلاوکردنەوەو فراوانبوونی، دەست بردن بۆ کێشە کۆمەلایەتییەکان فاکتەری

سەرەکی بلاْوبوونەوەی ئایینی (محمد) بوو، لەگەڵ ئەوەی (محمد) خۆی کردە ئەو فریا گوزارە چاوەڕوانکراوەی کە نیوە دوورگەی عەرەب خەونی پێوە دەدی).

منیش دەڵێم: بەڕاستی ئەوانە ستەمێکی زۆر گەورەیان لە خۆیان کردووە کە باسی ئایینی (محمد) دەکەن بێ ئەوەی (سەرە واو)ێك لە ورگیاندا بێت.. ! چونکە ڕەخنەو ڕەخنە سازی لە هەر بابەتێك دەبێ شارەزاییەکی قووڵت هەبێ لەسەریی و ئەوجا دەبێت بڕیار بدەیت، هەروەك دەبێت پسپۆڕ بێت لەو بوارەدا.. ئەگینە دەشکێتەوە سەر خاوەنەکەیی و بیر تیژان بەرپەرچی دەدەنەوەو خەڵکیش کوێرانە وەری ناگرن.

نازانم مەبەست لە کام کێشەی کۆمەڵایەتییە کە بەلای نووسەرەوە دەست بردن بۆ چارەسەرکردنی کێشە کۆمەڵایەتییەکان عەیب و نەنگێکی ئابڕوو بەرە.. کاتێك دەڵێت فاکتەری سەرەکی بلاْو بوونەوەی...هتد، خۆ بە لای هەموو جیهانیانەوە چاکترین مرۆڤ و ڕێباز ئەوەیە خۆی گێل نەکات لە ئاستی گیروگرفتەکانی جەماوەر، مێژوو هەموو کات بۆ ئەوانە نووسراوە خۆیان کردووە بە بالاگەردانی کۆڕو کۆمەڵ و کۆمەڵگەو خەباتیان کردووە بۆ ڕزگارکردن و نەهێشتنی باری لاری کۆمەڵ، ئەو شتانەی دەبنە هۆی جیاوازی نێوان ئادەمیزادەکان... چ عەیبێکی تیایە کە پیاوێك - وەك محمد ﷺ بێ و کێشە کۆمەڵایەتییەکانی ئەو سەر دەمەی چارە کردبێت و نەخشەیشی بۆ ئێستا دانابێت..؟!!

چ عەیبێکی تیایە ئاژاوەی (١٢٠) ساڵەی دوو تیرەی دەسەڵاتداری مەدینە (ئەوس و خەزرەج) بکوژێنێتەوە..؟!

چ عەیبێکە بکەوێتە نێوان تیرەکانی عەرەبی ئەو سەردەمە کە لەوانە بوو خوێن هەڵسێ لەسەر دانانی (بەردە ڕەش = حجر الأسود)...؟!!

چ عەیبێکی تیایە هەوڵدان بۆ ڕزگارکردنی بەندەو کۆیلەکان، جارێ بە پارەو، جارێ بە خۆڕایی و منەت، جارێکی تر بە فێرکردنی خوێندەواریی بۆ نەخوێندەواران..؟!!

چ عەیبێکی تیایە هەموو مرۆڤەکان بکات بە هاوبەشی ژیان و، تێیان بگەیەنێت کە کەس لە کەس گەورەتر نییە بە دەست پاکی و داوێن پاکی نەبێت..؟! ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَٰكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَىٰ وَجَعَلْنَٰكُمْ شُعُوبًا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓا۟ ۚ إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ ٱللَّهِ أَتْقَىٰكُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ ﴾ (الحجرات: ١٣).

چ عەیبێکە بڵێت: کەس لاقرتێ بە کەس نەکات و مافی سیاسیی و کۆمەڵایەتیی و ئابووریی و... هتد. پێشێل نەکات...؟!

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا يَسْخَرْ قَوْمٌ مِّن قَوْمٍ عَسَىٰٓ أَن يَكُونُوا۟ خَيْرًا مِّنْهُمْ وَلَا نِسَآءٌ مِّن نِّسَآءٍ عَسَىٰٓ أَن يَكُنَّ خَيْرًا مِّنْهُنَّ ۖ وَلَا تَلْمِزُوٓا۟ أَنفُسَكُمْ وَلَا تَنَابَزُوا۟ بِٱلْأَلْقَٰبِ ۖ بِئْسَ ٱلِٱسْمُ ٱلْفُسُوقُ بَعْدَ ٱلْإِيمَٰنِ ۚ وَمَن لَّمْ يَتُبْ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴾ (الحجرات: ١١).

چ عەیبێکە بڵێت: جاسووسی و سیخووڕی مەکەن ﴿ وَلَا تَجَسَّسُوا۟ ﴾ (الحجرات: ١٢).

چ عەیبێکە بڵێت: هاوکاری یەکتر بکەن و بە هەرەوەزی گرفتەکانتان چارە بکەن..؟! ﴿ ..وَتَعَاوَنُوا۟ عَلَى ٱلْبِرِّ وَٱلتَّقْوَىٰ .. ﴾ (المائدة: ٢).

چ عەیبێکە بڵێت: هاوکاری شەڕو خراپەو ئاژاوە مەکەن: ﴿ ... وَلَا تَعَاوَنُوا۟ عَلَى ٱلْإِثْمِ وَٱلْعُدْوَٰنِ ... ۚ ﴾ (المائدة: ٢).

چ عەیبێکە بڵێت: لەگەڵ دایك و باوکتاندا پیاوبن و کاری جوامێریان لەگەڵ بکەن: ﴿ وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَانًا ﴾ (البقرة: ٨٣).

چ عەیبێکە بڵێت: کچۆلەکانتان زیندە بە چاڵ مەکەن..؟! ﴿ ...وَلَا تَقْتُلُوٓا۟ أَوْلَٰدَكُم مِّنْ إِمْلَٰقٍ ۖ ... ﴾ (الأنعام: ١٥١).

چ عەیبێکە بڵێت: ﴿ ...وَلَا تَقْتُلُوا۟ ٱلنَّفْسَ ٱلَّتِى حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلْحَقِّ ... ﴾ (الأنعام: ١٥١)..؟

چ عەیبێکە بڵێت: هەموو کات هەق بێژ بن ئەگەر بە زیانی خۆتان و کەس و کاریشتان تەواو بێت: ﴿ ...وَإِذَا قُلْتُمْ فَٱعْدِلُوا۟ وَلَوْ كَانَ ذَا قُرْبَىٰ .... ﴾ (الأنعام: ١٥٢).

چ عەیبێکە بڵێت: ئەو خزمانەی ئەگەرچی بەشە میراتیشیان نەبێت بێ بەشیان مەکەن: ﴿ وَإِذَا حَضَرَ ٱلْقِسْمَةَ أُوْلُواْ ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْيَتَٰمَىٰ وَٱلْمَسَٰكِينُ فَٱرْزُقُوهُم مِّنْهُ وَقُولُواْ لَهُمْ قَوْلًا مَّعْرُوفًا ﴾(النساء: ٨).

چ عەیبێکە بڵێت: ژنان وەك كەل و پەل سەیر مەكەن، بەتایبەت پاش مردنی مێردەكانیان بە زۆرو پێ ناخۆش بوون داگیریان مەكەن: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا يَحِلُّ لَكُمْ أَن تَرِثُواْ ٱلنِّسَآءَ كَرْهًا ... ﴾ (النساء: ١٩).

چ عەیبێکە بڵێت: ژنان تەنگەتاو مەکەن، بۆ ئەوەی ناچاریان بکەن دەست لە مارەیی خۆیان هەڵگرن و داوای تەڵاق بكەن ..؟! ﴿ ..وَلَا تَعْضُلُوهُنَّ لِتَذْهَبُواْ بِبَعْضِ مَآ ءَاتَيْتُمُوهُنَّ .. ﴾ (النساء: ١٩).

چ عەیبێکە بڵێت: باوەژن و پوورو خوشك و دایك و خوشكەزاو برازاو كوڵ بەسەكانتان مارە مەكەن.؟! ﴿ وَلَا تَنكِحُواْ مَا نَكَحَ ءَابَآؤُكُم مِّنَ ٱلنِّسَآءِ إِلَّا مَا قَدْ سَلَفَ إِنَّهُۥ كَانَ فَٰحِشَةً وَمَقْتًا وَسَآءَ سَبِيلًا ﴿٢٢﴾ حُرِّمَتْ عَلَيْكُمْ أُمَّهَٰتُكُمْ وَبَنَاتُكُمْ وَأَخَوَٰتُكُمْ وَعَمَّٰتُكُمْ وَخَٰلَٰتُكُمْ وَبَنَاتُ ٱلْأَخِ وَبَنَاتُ ٱلْأُخْتِ وَأُمَّهَٰتُكُمُ ٱلَّٰتِيٓ أَرْضَعْنَكُمْ وَأَخَوَٰتُكُم مِّنَ ٱلرَّضَٰعَةِ وَأُمَّهَٰتُ نِسَآئِكُمْ وَرَبَٰٓئِبُكُمُ ٱلَّٰتِي فِي حُجُورِكُم ﴾ (النساء: ٢٢– ٢٣).

چ عەیبێکە بڵێت: هەموو كات هۆشیارو وریا بن، نەوەك دوژمن هێرشتان بۆ بێنێت..؟! ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ خُذُواْ حِذْرَكُمْ ... ﴾ (النساء: ٧١).

چ عەیبێکە بڵێت و سەرزەنشتیان بكات لەسەر ئەوەی جیهادو خەبات نەكەن بۆ ڕزگاركردنی چینی چەوساوەو لاواز لە پیاوان و ژنان و منداڵان..؟! ﴿ وَمَا لَكُمْ لَا تُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱلْمُسْتَضْعَفِينَ مِنَ ٱلرِّجَالِ وَٱلنِّسَآءِ وَٱلْوِلْدَٰنِ ... ﴾ (النساء: ٧٥).

چ عەیبێکە بڵێت: لە ژێر سیستەمی ستەمكاراندا دامەنیشە..؟! ﴿ وَمَن يُهَاجِرْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ يَجِدْ فِي ٱلْأَرْضِ مُرَٰغَمًا كَثِيرًا وَسَعَةً ... ﴾ (النساء: ١٠٠).

چ عەیبێکە: پەیمان نامەیەك مۆر بکرێ بۆ دیفاع و بەرگری لە مافی ماف خوراوان، کە ئەو کاتە بە (حلف الفضول) ناوبراوە..؟! ئەبێ بۆچی جێگەی ڕەخنە بێت هەوڵ بدرێ (کەرامەت)ی مرۆڤ بگەڕێتەوە، پاش ئەوە لە بازاڕەکاندا دەفرۆشرا بە بەهایەکی سووك و کەم..؟! ﴿ فَلَا ٱقۡتَحَمَ ٱلۡعَقَبَةَ ﴿١١﴾ وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا ٱلۡعَقَبَةُ ﴿١٢﴾ فَكُّ رَقَبَةٍ ﴾ (البلد: ١١ – ١٣). لە کاتێکدا کۆیلایەتی "محمد" دای نەهێناوە، بەڵکو ئەم دەیەوێت لە ڕیشەی بێنێت..؟! ئەی بۆچی ڕەخنە بگیررێت لە ﴿ وَيُطۡعِمُونَ ٱلطَّعَامَ عَلَىٰ حُبِّهِۦ مِسۡكِينٗا وَيَتِيمٗا وَأَسِيرًا ﴾ (الإنسان: ٨) ..؟!!

ئەی بۆ پێیان هەزم ناکرێ ئەو یاسایەی پێشی چواردە سەدە لە سەرو سامانی دەوڵەمەندەکان ڕێژەیەکی ٢٥٪ ی لە دراوو، وە لە گەنم و دانەوێڵەدا لە ١٠٪ داو، لە مەڕو ماڵاتدا ڕێژەیەك ئا بەو جۆرە دابنرێ..؟! ﴿ خُذۡ مِنۡ أَمۡوَٰلِهِمۡ صَدَقَةٗ تُطَهِّرُهُمۡ وَتُزَكِّيهِم بِهَا وَصَلِّ عَلَيۡهِمۡۖ إِنَّ صَلَوٰتَكَ سَكَنٞ لَّهُمۡۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴾ (التوبة: ١٠٣). ئەمە لەلایەکەوە... لەلایەکی تریشەوە ئەمڕۆ سیستەمەکانی جیهان هەر ئەو شتانە دەڵێن بە جەماوەر — لە کاتی هەڵبژاردن و (انتخابات)دا... ئەی ئەگەر سەرۆك کۆمارێك پۆستی سەرۆك کۆماری وەرگرێ چ بەڵێنێك دەدات بە گەل و کۆمەڵ؟ پاش سەرکەوتن بۆیان بکات - هەرچەند جیاوازییەکی نێوان ئاسمان و زەوی هەیە لە نێوان محمدو ﷺ سەرۆکەکانی جیهانداو بەرنامەکاندا.

نازانم پەرچەمی پڕوپاگەندەی (ڕووس) چیە..؟ کێیە (٧٠) ساڵە بەناوی ئابوورییەوە خوێنی چینی کرێکارو وڵات و هەژارەکان دەمژێ..؟! کێیە هەژارەکانی کردووە بە دوژمنی دەوڵەمەندەکان.؟!

ئەگەر فاکتەری سەرکەوتنی محمد ﷺ ئەو شتانە بووایە کەوا دەیڵێن، دەبوو کۆمۆنیستەکان بە (١٠ — ١٥) ساڵ سەرکەوتنایە، لەگەڵ ئەوەشدا محمد ﷺ بە (٢٣) ساڵ شۆڕشە خواییەکەی سەرکەوت و هەموو بەڵێنەکانی خۆیشی بردە سەرو گوزەرانی هەژارەکانی بەرز کردەوە، هەر بەو شتانەش ئەوان لاقرتێی پێ ئەکەن..!

ئێستاش ئەگەر ئەوەی محمد ﷺ هێناوییەتی برەوی پـێ بدرێتـەوە، وە وەك دەوڵـەت چاودێری بڕگەکان بکاو پراکتیکیان بکات، وە لە ٢٥٪ی ئەو هەموو پارەو ئیمکانیات و کۆشك و باڵەخانەو ئۆتۆمبێل و کارگەو کۆمپانیایانە بدرێ، هەژاری هەڵدێت و جێگـەی نابێتەوە.

دیسانەوە ئەگەر – محمد –ﷺ مەبەستی فریودانی ئـەوان بووایـەو خـۆش گـوزەرانی خۆی بووایە (عائیشە)ی هاوسەری (خوا لێی ڕازی بێت) نەی دەگوت: خێـزان و کـەس و کاری محمد ﷺ سێ شەو لەسەر یەك لەو کاتەوە هاتووەتە (مەدینە) تا فـەوتی کـرد تێر نانی گەنمیان نەخواردووە.! (قالت عائشة "رضي الله عنها": ((ماشـبع آل محمـد ﷺ منذ قدم المدينة من طعام بُرٍ ثلاث ليال تباعا حتى قبض))[١٦].

وە ئەگەر بیویستایە ڕێبازەکەی سـەرکەوێ و ڕابـوێرێ و هـەژارەکان فریـو بـدات بـە قەرزاری نەدەمرد..!! ((توفي رسول الله ﷺ ودرعه مرهونة عند يهـودي بـثلاثين صـاعا من شعيــر))[١٧] .

تا ئێستا وەك ڕەوان بێژەکان دەڵێن: (ارخـاء العنـان)مـان کـرد بۆیـان کـە ئەگـەر لـە سەرەتایشەوە ئەو شتانەی بۆ هەژارو کۆیلەکانی کردبێت – وەك ئەوان دەڵـێن – هـەر کارێکی پیرۆزو چاکە، ئەگەر زیاتر نەبێت لەو هـەموو ڕێکخـراوە خێـر خـوازە مرۆییانـە کەمتـر نیە.. بۆچی ئێستە ئەگـەر لـە ئـەوروپاوە دۆلارێـك بـدرێ بـە کەسـێك هۆکـانی ڕاگەیاندن باسی دەکات و دەی نرخێنێ... ئەی بۆچـی ئـەوەی محمـد ﷺ فریـو دانـەو فاکتەری ئیشەکەیەتی.؟

هەرچەندە ئەمڕۆ ئەمە هەڵوێستی بیریارانی ئەو وڵاتە ڕۆژئاواییانە نیە کە ئێستا ئـەم جـۆرە برادەرانـەی خۆمـانی تێـدا دەژیـن و ئـەم قسـەو گوفتـارە نـا زانسـتیانەمان بـۆ دەنێرنەوەو ئەوەندەی تر قووڕەکـە بـۆ میللەتەکـەیان خەسـت دەکەنـەوە.. بیریـارانی

(١٦) صحيح البخاري – كتاب الأطعمة، باب قول الله تعالى: كلوا من طيبات ما رزقناكم – حديث : ٥٠٦٤

(١٧) صحيح البخاري – كتاب الجهاد والسير، باب ما قيل في درع النبي صلى الله عليه وسلم – حديث : ٢٧٨٠

ئەوروپا کۆتایی چەرخی بیستەم دوای لێکۆڵینەوەو بە دواداچوونی مێژووی ئیسلامیی و بەتایبەتی ژیانی پرشنگداری پێغەمبەر ﷺ گەیشتوونەتە ئەو قەناعەتەی (بەرنادتشۆ) گوتەنی: (ئەگەر محمد ئەمڕۆ زیندووبایە چارەسەری کێشەکانی جیهانی لەماوەی خواردنەوەی فنجانێ قاوەدا دەکرد). !

هەر بۆیە ئەمڕۆ (ڕۆجیە گاروودی) لەناو جەرگەی ئەوروپادا بانگەشە بۆ ئیسلام و ڕێنوێنییەکانی دەکات و دەیان زاناو بیریاری تری وەك (کۆستۆو مراد هۆغمان و بۆکای ...) پێشتریش باوەڕیان هێناو ئەم ئایینەیان بە وەڵامدەرەوەی کێشەکانی ئەمڕۆی چەرخی تەکنەلۆژیا زانی...

ئەو جۆرە بەناو ڕۆشنبیرە هەڵاتووانەی ئێمە بە گەدەو غەریزە سەرکەشەکانیان بیر دەکەنەوە نەك بە عەقڵیان، دەنا هەڵوێستیان بەم جۆرە نەدەبوو بەرامبەر بە ئایینێك کە ئەمڕۆ لە ئەوروپا زیاتر هەنگاو بەرەو پێشەوە دەنێت و ئەندام و لایەنگرانی زیاتری بۆ پەیدا دەبێت.

پاشان ئەگەر تۆزێك بگەڕێینەوە بۆ مێژووی سەرهەڵدانی ئیسلام لە (مەککە)دا دەزانین کە پێغەمبەر ﷺ نزیکەی (١٣) سێزدە ساڵ باسی بیروباوەڕە بناغەییەکانی دەکرد: (یەکتاپەرستیی، پەیام، زیندوو بوونەوەو پاداشت). جگە لەمانە هیچ یاساو قانوونێکی تری نەبوو، وە هیچ (شەریعەت) و (تشریع)ێك بەیان نەکرابوو... ئیتر لە کوێ فاکتەری ئایینەکەی محمد ﷺ چاککردنی کێشەکان بوو.

هەروەها دەڵێت: (باشترین توێژێك کە ڕووی تێبکرێ و بانگهێشت بکرێ بۆ ئەم ئایینە نوێیە هەژاران و کۆیلەکانە...). ئەم دەستەواژەیش لە ڕاستییەوە زۆر دوورە چونکە پیاوی وەك (ئەبووبەکر) و (عوسمان) کە دەوڵەمەندی ئەو کاتە بوون پێش هەموو کەسێك موسڵمان بوون و دوای محمدیش ﷺ کەوتن، ئاشکرایە نە کۆیلە بوون و نە هەژار (وەك ئەوان ڕەخنە دەگرن)، پاشان ئەگەر دوای ئەوانیش کۆیلەو

هەژارەکانیش شوێنی کەوتبن شتێکی زۆر سرووشتییەو هەمیشە ستەم لێکراوان بە دەم هەر بانگەوازێکەوە دەڕۆن کە مافی ئازادی خۆیانی تیادا ببینن...

گرنگ ئەوەیە محمد ﷺ ئەوەی وەك درووشم بەرز نەکردەوەو دوای بەدیهاتنی ئامانجەکانی پتشیان لێ بکات، بەڵکو تا سەر بەدەمیانەوە بوو، وە پەیامەکەشی تا ئەمڕۆش هەژارو چەوساوەکان بە تاکە هۆکاری ڕزگاری خۆیانی دەزانن، کەواتە ئەو وتەیان پووچەڵەو بێ ناوەڕۆك، ئەمە لەلایەکەوە، لەلایەکی دیکەشەوە سرووشتی ئادەمیزاد وایە کە مرۆی تێرو دەوڵەمەندو خاوەن پلەو پایە زۆر کەم دەجووڵێتەوەو دەست لە دەستکەوتەکانی هەڵ ئەگرێ، وە یان هەر هیچ نەبێت ترسی لە دەستدانی هەیە، هەر بۆیەش لە هەموو سەردەمێکاو لە هەموو جووڵانەوەیەکدا هەڵگرانی پەیامەکەی چینی هەژارو بێ نەوایە، ئاشکرایشە کە ئەگەر خەبات گێڕەکانی ئەو چینە بن لە شانی کەم ناکات، هەرچەند یارانی پێغەمبەر ﷺ دونیایان لا مەبەست نەبووە، بەڵکو بەهەشت و پاشەڕۆژیان پێش چاو گرتووە، بۆیە لە چەند جێگایەکدا سەلماندوویانە کە هیچ تەمەعێکیان نەبووە.

*** نووسەر دەڵێت: (کاتێ ئیسلام بووە بزووتنەوەیەکی فراوان هێزێکی جەسەدی زۆر لە دەوری کۆبووەوەو قۆناغی بڵاوکردنەوەی ئایین لەڕێگەی کاری چاکە خوازییەوە گۆڕاو قۆناغی دووەم دەستی پێ کرد، واتە: هاندانی موسڵمانان بۆ کاری توندو تیژی لەدژی ئەوانەی کە نەدەهاتنە ڕیزەکانی ئایینی ئیسلامەوە، وە چەند ئایەتێکی بڵاوکردەوە بۆ ئەوەی شەرعییەت بدات بەو کارەی کە دەیەوێ بیکات لەژێر ناوی ڕزگارکردنی کۆمەڵگا لە چەوساندنەوە، وەك ئەم چەند ئایەتە وەك:**

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ جَٰهِدِ ٱلۡكُفَّارَ وَٱلۡمُنَٰفِقِينَ وَٱغۡلُظۡ عَلَيۡهِمۡۚ وَمَأۡوَىٰهُمۡ جَهَنَّمُۖ وَبِئۡسَ ٱلۡمَصِيرُ ٩ ﴾ (التحريم: ٩) ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ جَٰهِدِ ٱلۡكُفَّارَ وَٱلۡمُنَٰفِقِينَ وَٱغۡلُظۡ عَلَيۡهِمۡۚ وَمَأۡوَىٰهُمۡ جَهَنَّمُۖ وَبِئۡسَ ٱلۡمَصِيرُ ﴾ (التوبة: ٧٣)، دواتر ئایەتی: ﴿ يَسۡـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلۡأَنفَالِۖ ... ﴾ (الأنفال: ١). بۆ

ئیبادەکردنی غەیرە ئیسلامییەکان. لەگەڵ ئایەتی: ﴿ قَـٰتِلُواْ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَلَا بِٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ ... ﴾ (التوبة: ٢٩).

وا دەزانم هەر کەسێك تۆزقالەیەك شارەزایی مێژووی ئیسلامی هەبێت دەزانێت لە ئایینی ئیسلام هیچکات توندو تیژی نەکراوە بەرامبەر کەسێك کە موسڵمان نەبووبێت، وە شیرو چەقۆی بۆ هیچ کەس نەکێشاوە بە ناهەق. وە ئیسلام نایەوێ زۆرو زۆرداری بکات بەرامبەر ئەوانەی بڕوا ناهێنن، وەك ئەم چەند ئایەتە ئەم ڕاستییە دەسەلمێنن: ﴿ لَآ إِكْرَاهَ فِي ٱلدِّينِ ... ﴾ (البقرة: ٢٥٦).﴿ ...فَمَن شَآءَ فَلْيُؤْمِن وَمَن شَآءَ ... ﴾ (الكهف: ٢٩). واتە: هیچ کات لە بیری ئیسلامدا نیە زۆر بکات لە خەڵکانێك موسوڵمانیان بکات.. بەڵکو مرۆڤ ئازادە لە بیروباوەڕدا چی هەڵدەبژێرێ بۆ خۆی لە ژیانییدا.، ئەمەیە مانای ڕاستەقینەی ئایەتەکە، هەرچەند خەڵکێکی زۆریش لەم ئایەتەوە مانای (جیهاد)یان لە ئیسلام دوور خستووەتەوەو بەو حیسابە کە (لا إكراه في الدين). ئیسلام هاتووە بۆ ئەوەی ئازارو ئەشکەنجە لە هەڵگرانی پەیامەکەی دوور بخاتەوە هەتا بە ئەمن و ئاساییش بژین، بیروباوەڕو سەرو سامانیان پارێزراو بێت، هەروەك دەیەوێ بانگەوازەکەی ئازاد بێت و بتوانێ ئەو یاساو دەستوورانەی هێناوییەتی ڕاڤەیان بکات، ئیتر هەموو کەسێ ئازادە وەری بگرێ یا نە .؟!

بەڵام دەبێ ڕێی لێ نەگیرێ لە باس کردنەکەیدا.. ئیسلام جیهاد دەکات بۆ ئەوەی گیانی هەڵگرانی پەیامەکەی سەلامەت بێت ئیتر بە زەبرو توندو تیژی لە دژی ئەوانەدا ناوەستێ کە نایەنە ڕیزەکانییەوە — وەك نووسەر دەڵێت - ...!!

مرۆڤ چی لە دڵیایەتی زۆری لێ ناکرێ بۆ گۆڕینی، بەڵام لە چوارچێوەی (أخلاق) و (قیم)دا بێت.، ئەو ئایەتەش دەفەرمووێت: ﴿ وَأَعِدُّواْ لَهُم مَّا ٱسْتَطَعْتُم مِّن قُوَّةٍ وَمِن رِّبَاطِ ٱلْخَيْلِ تُرْهِبُونَ بِهِۦ عَدُوَّ ٱللَّهِ وَعَدُوَّكُمْ ... ﴾ (الأنفال: ٦٠). ئەگەر کەسێك تۆزێك ورد بێتەوە لە ئایەتەکە دەزانێت کە مەبەست لەو خۆ ئامادەکردنە هێرش بردنە سەر ئەم و ئەو نییە، بەڵکو بۆ ئەوەیە دوژمنان و ناحەزان شەرمی لێ بکەن، هێرش نەهێننە

سەری، وە ئەگەر هەر شەڕی پێ فرۆشرا، کە گەلێ جار سرووشتی ئادەمیزاد وایە خوارتر لەخۆی ئەچەوسێنێتەوە، بەتایبەت کاتێ بزانێ هێزی نیە بەرگری بکات لەخۆیی و بیروباوەڕەکەی.. جا لەو کاتەدا دەبێ ئامادە بێت. ئەوانەی لە خۆیان دەترسن ئەوە مانای ئایەتەکەیان سەرەو خوار کردووەتەوە، ئەگینە ئەگەر ڕێز لە ئادەمیزادییەتی خۆی بگرێ و دەست درێژی نەکاتە سەر بیروباوەڕی موسڵمانان ئەوە بۆ خۆی دادەنیشێ بە ئازادیی و کەسیش دەستی بۆ نابات، خۆ ئەگەر بیروباوەڕی موسڵمانان بریندار بکات و وە پێشی وابێت کەسیش قسە ناکات، ئەوە بە هەڵە گەیشتووە، چونکە ﴿ ...وَٱلۡفِتۡنَةُ أَشَدُّ مِنَ ٱلۡقَتۡلِۚ ... ﴾ (البقرة: ١٩١)، ﴿ يَسۡـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلشَّهۡرِ ٱلۡحَرَامِ قِتَالٖ فِيهِۖ قُلۡ قِتَالٞ فِيهِ كَبِيرٞۖ وَصَدٌّ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ وَكُفۡرُۢ بِهِۦ وَٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡحَرَامِ وَإِخۡرَاجُ أَهۡلِهِۦ مِنۡهُ أَكۡبَرُ عِندَ ٱللَّهِۚ وَٱلۡفِتۡنَةُ أَكۡبَرُ مِنَ ٱلۡقَتۡلِۗ ... ﴾ (البقرة: ٢١٧).

خۆ ئەگەر سەیری ئەملاو ئەولا بکرێت دەزانرێ کە هەر کەسێك بگاتە ئاستی حکومەت و دەوڵەت دوژمنی بۆ پەیدا دەبێت و تەمەحی تێ ئەکرێ، با ئەگەر تەنها لەبەر ئەوەیش بێت بۆی هەیە خۆی ئامادە بکات بۆ بەرپەرچ دانەوەی هەر هێرشێکی ئاوا، وە جەماوەرەکەی کۆبکاتەوەو مەشقی سەربازیشیان پێ بکات، وە سنوورەکانی خۆی بگرێ، ئەمە لەلایەکەوە لەلایەکی تریشەوە دیفاع کردن و بەرگری لە خۆکردن شتێکی (مشروع)ە لەناو دەوڵەتاندا، مەگەر بۆ ئیسلام یاساغ بێت، هێزو پێز ئامادە بکات..؟!!

*** ئایەتی (الأنفال)یش کە ئەوان تەفسیرەکەی (حیزبی بەعس)ی بۆ دەکەن کە گوایە کوشتن و تۆقاندن و داپڵۆساندن و گواستنەوەی خەڵکیی و نیشتەجێ کردنیانە بە زۆرە ملێ لێرەو لەوێ.. ئەوە پێم چاکە بگەڕێینەوە بۆ مێژووی هاتنە خوارەوەی ئەو سوورەتەو پاشان ماناکەیشی.**

سوورەتی (الأنفال) ساڵی دووەمی کۆچی – پاش ١٩ نۆزدە مانگ – هاتە خوارێ، سەبارەت بە جەنگی (بەدر). جەنگی (بەدر)یش لە بەرنامەی موسڵماناندا نەبوو، بەڵکو

ئەوەبوو کاتی خۆی (قورەیش)ییەکان ئەشکەنجەو ئازارێکی زۆری موسڵمانانیان دابوو لە (مەککە)دا، وە هەرچی ماڵ و سامانیان بوو لێیان داگیر کردبوون و بە ڕووتی بەرەڵڵایان دەکردن و ئەوانیش ڕێگەی (مەدینە)یان گرتەبەر، جا پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموون: قووڕەیش ڕووتی کردنەوەو سامانەکەی لێ زەوت کردن، وا ئێستایش کاروانە بازرگانییەکەیان دەگەڕێتەوە، بۆتان هەیە بڕۆن ڕێگەی پێ بگرن و ماڵ و سامانەکەتانی لێ وەرگرنەوە...، ئەمانیش بەو نیازەوە ڕۆیشتن، وە هیچ جۆرە وەسیلەیەکی جەنگییان پێ نەبوو، جگە لەوەیش کە ژمارەیەکی کەم بوون لە چاو ئەواندا، دەرەنجام قافڵەکە دەرچوو و ئەمانیش ویستیان بگەڕێنەوە، بەڵام قورەیش بەو هێزەوە هات کە هەموو کەس دەزانێ چۆن بوو، ئەمانیش (دەست لە دەست و قووەت لە خودا) بەرپەرچی هێزەکەیان دانەوەو قورەییش لوتی شکا.

ئا لە حاڵەتێکی ئاواداو بە بۆنەیەکی ئاواوە بۆچی یاساغە چەوساوەکان بەرگری لە خۆیان و سەروەت و سامانیان بکەن.؟!

وە بێگومان لەو جەنگە بە زۆر سەپێنراوەدا (غەنیمەت)و دەستکەوت دەبێت (وەك یاسای جەنگی ئەمڕۆو کۆن) جا بۆ شێوەی دابەش کردنەکەو هەندێ (تەوجیهات)ی گۆڕەپانی جەنگەکە ئەو سوورەتە هاتە خوارەوە..

ئەوەیە مانای (الأنفال)، واتە: دەست کەوتە جەنگییەکان، نەك ماناکەی ئێوەو ئاغاکانتان (حیزبی بەعس)!!. جگە لەوەیش پێغەمبەر ﷺ لە سەرەتاوە بەم شێوەیە هاتووە: (إقرأ باسم ربك الذي خلق، خلق الإنسان من علق، إقرا وربك الأكرم، الذي علم بالقلم)، بخوێنەو قەڵەم بەکاربهێنە، پاشان ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمُدَّثِّرُ ۝١ قُمۡ فَأَنذِرۡ ﴾ (المدثر: ١ – ٢). هات. فەرمانی پێکرا بە خەڵکی ڕابگەیەنێت. بۆ دواتر ﴿ وَأَنذِرۡ عَشِيرَتَكَ ٱلۡأَقۡرَبِينَ ﴾ (الشعراء: ٢١٤) هات، ئەویش دەستیکرد بە ئامۆژگاری خزمەکانی خۆیی و، پاشان عەرەبەکانی ناوچەکە..

نزیكەی (١٣) سێزدە ساڵ مایەوە بێجگە لە ڕاگەیاندن و ئامۆژگاری هیچ ڕێگەیەكی تری نەگرتە بەر (نە جەنگ و نە سەرانە)، هەمووكات فەرمانی خۆگرتن و ئارامی پێ دەكرا، دوای ئەوە مۆڵەتی كۆچكردن و جەنگاندنی بۆ هات.

بەلاّم نووسەر زۆر بێ ئاگایە لە حەقیقەتی مێژووی ڕووداوەكان كاتێ دەست پێشخەری لە توندو تیژیدا دەداتە پاڵ موسڵمانان، مەگەر موسڵمانان لە مەككەدا كێ ئەیچەوساندنەوەو ئافرەتێكی بێ تاوانی وەك (سومەییە)و پیرەمێردێكی وەك (عەممار)ی شەهید كرد..؟! دوای ئەمانەو چەندین كاری تری لەناوبردنی جەسەدیی و سزاو تۆقاندن، كێ بوون ئەوانەی سەریان كرد بەیەكداو پیلانی تیرۆركردنی پێغەمبەریان داڕشت..؟!! پاشان موسڵمانان ناچار كران كۆچ بكەن و نیشتمانی خۆیان بەجێ بهێڵن، دوای ئەو كۆچەو ڕاگەیاندنی قەوارەیەكی ئیسلامی لە مەدینەدا هێشتا هەر ڕێگە نەدرابوو كە ڕووبەڕوو بوونەوەو توندو تیژی بەرامبەر بێ باوەڕان بكرێت.

ئیتر بۆچی ئەم نووسەرە بێ ئاگا لە مێژووە ئەم حەقیقەتە پێچەوانە دەكاتەوە، وەك ئەوەی بیەوێ گەلێكی نەشارەزا لەمێژووی پێشینە خواناسەكانی خۆی بخەڵەتێنی، لەكاتێكدا ئەوان زۆر لەوە بە ئاگاترن.، پاشان دوای ئەوە فەرمانی پێكرا كێ جەنگت لەگەڵ دەكات، جەنگی لەگەڵ بكە، كێیش جەنگت لەگەڵ ناكات جەنگی لەگەڵ مەكە وەك ئایەتەكانی سوورەتی (النساء) ئەم ڕاستییە ڕوون دەكەنەوە.

پاشان بێ باوەڕەكان بوونە سێ بەشەوە، بەشێكیان (صلح)و سازو ڕێكەوتننامەیان مۆر كردوو بۆ خۆیان دانیشتن، هەندێكیشیان سەنگەریان گرت لە موسڵمانان، ئەوانی تریشیان (ئەهلی زیممە) بڕیاریدا خاوەن پەیمانەكان و ڕێكەوتننامەكان ڕێزیان لێ بگیرێ، مەگەر خیانەت بكەن، ئەوكاتەیش دەبێ بە ئاشكرا پەیمانەكەیان بۆ هەڵوەشێنێتەوە: ﴿ وَإِمَّا تَخَافَنَّ مِن قَوْمٍ خِيَانَةً فَانۢبِذْ إِلَيْهِمْ عَلَىٰ سَوَآءٍ ... ﴾ (الأنفال: ٥٨).

فەرمانیدا ئەوانەی پەیمانەکەیان هەڵدەوەشێننەوەو نیازو نیەتییان خراپەیە جەنگیان لەگەڵ بکەن.. پاشان کاتێ سوورەتی (براءة) هاتە خوارێ شێوەی مامەڵەکردنی لەگەڵ هەموو بەشەکاندا ڕوون کردەوە.، فەرمانیدا لەگەڵ جوولەکەو هاو کافرەکانیان بجەنگێن تا (جزية = سەرانە)[١٨] دەدەن، پاشان ئیتر ڕەوا نییە جەنگیان لەگەڵ بکرێ.، فەرمانیدا لەگەڵ بێ باوەڕەکاندا، لەگەڵ دوو ڕووەکاندا توندو تیژ بن. !

ئەوەیش کە دەڵێن: (چەندین ئایەتی تر بەیان کراوە بۆ حەلاڵکردنی تاشینی بڕۆی ئەو کەس و خێڵانەی کە نایەنە ژێر ئالای ئیسلامەوە، بۆ ئەوەی جەنگاوەرەکانی زۆر بە جددی هەوڵ بدەن بۆ جێبەجێکردنی خواستەکانی محمد..).

ئەڵبەتە تەنها بیروبۆچوونی کەسانی ماددە پەرستە کە بە چاویلکەی سوودو بەرژەوەندی دابڕاو لە هەر بەهاو ڕەوشتێك دیاردەو کارو چالاکییەکانی مرۆڤ دەبینن، دەنا چی دەکەن لەو موسڵمانانەی خواردنی چەند دنکە خورمایەك لە گۆڕەپانی شەڕدا بەکات کوشتنی دەزانێت لەبەردەم زوو گەیشتنی بە مردن و گەڕانەوە بۆلای پەروەردگاری، خۆ ئەمەش هەر بۆ تالان و بڕۆ نیە وەك ئەو نووسەرە دەیڵێت؟! بەڵکو مردنە لە پێناوی بیروباوەڕدا.، پاش ئەوەی لەسەرەوە ڕاڤەی ئایەتی: ﴿ لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِۖ .... ﴾ (البقرة: ٢٥٦) مان کرد.، وا دەزانم پێویست نەکاتەوە بگەڕێینەوە سەر بەرپەرچ دانەوەی درۆو فیشاڵەکانیان و (تحدا)یان دەکەین کە تەنها ئایەتێك بێنن بۆ حەلاڵکردنی تالان و بڕۆو خواردنی ماڵ و سامانی بێ تاوان. !

*** هەروەها کاکی نووسەر دەڵێت: (محمد ئەوەی باش دەزانیی ئەو کەسانەی کە هاتوونەتە سەر ئایینەکەی لە عەقیدەیەکی کامڵەوە نەبوو، بەڵکو زیاتر بۆ**

---

(١٨) سەرانەیش – وەك زەکات وەرگرتنە لە موسوڵمان بۆ پڕکردنەوەی کەم و کوڕییەکانی کۆمەڵگە – بەڵام "غەیرە موسڵمان" زەکاتییان لەسەر نییە، بەڵام بەو ناوەوە بەشێکی کەمیان لێ وەردەگیرێ، ئەویش تەنها لەسەر پیاوە دەوڵەمەندەکانە، ئەگینە ئافرەت و منداڵ و پیرو پەککەوتە ئەمەی لەسەر نییە..

**بەدەستهێنانی دەست کەوتی ماددییە، بۆیە بە ئاشکرا بۆ جەنگاوەرەکانی بەیانکرد ئەوەی لەشەڕدا بەدەستی دەهێنن حەڵاڵە بۆ خۆتان..).**

ئێمەیش دەڵێین: پاش ئەوەی کە هەموو دونیا دەزانێت هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ دونیا خۆر نەبوون، ئەگەر هەر گەل و فەرماندەیەك ولأت و نیشتمانیی و، مالٚ و سامانی لیٚ زەوت بکریٚ، وە بە دەیان جۆر ئەشکەنجەو ئازار بدریٚ و، سەرەڕای ئەوەیش هێشتای لەشکرکێشی بۆ بکرێت بۆ پەناگەکەی، وە سیٚ بەرامبەر بەو، سەربازو سوپاو چەك و تەقەمەنی ئەو سەردەمەی بۆ بێنن، دەرەنجام جەنگێکی قورس، وەك (بەدر) بسەپێنن بەسەریا، مافی خۆیەتی بلٚێت: ((من قتل قتيلا فله كذا وكذا، ومن أتى بأسير فله كذا وكذا)). بۆ ئەوە هەرگیز مافی ڕەوای خۆیانیان لە بیر نەچێتەوەو، بێتەوە یادیان کە مالٚ و سامانیان ئەم دەست درێژکارانە زەوتیان کردووەو وائێستاش شەڕیشیان لەگەلٚ دەکەن...!!

ئەو فەرماندەیە مافی خۆیەتی بلٚێت: دە دەستتان خۆش بێت تۆڵەی خۆتان بکەنەوە ئەو سامانەی لێیان زەوت کردن، ئەمڕۆ ڕۆژییەتی لێیان وەرگرنەوەو نە هەر ئەوەندە، بەڵکو زیاد لەوەیش هەر سەربازیٚ زیاتر کاری قارەمانانە ئەنجام بدات و هێرش بباتە سەر دوژمن و یەکێکیان لیٚ بکوژیٚ و تەواوی کەل و پەل و چەکەکەی بۆ خۆیەتی...

ئەمە چی تیایە ئەگەر گەلێکی (مظلوم) هەوڵی ئاوا بدات، وە یان فەرماندەیەك وەك محمد ﷺ ..؟!!

ئەو سوورەتەی (الأنفال)و ئەو شتانەی ئەوان کردوویانە بە ڕەخنە لە موسڵمانان وا دەزانم ڕەمزی قارەمانییەتی نەپساندنی گەلێکی (مظلوم)ی تێدایە، دەبیٚ هەر گەلێك لە ولأت و نیشتمان بکرێتە دەرەوە، لە دەرەوەی ولأت خۆی ئامادە بکات بۆ ئەوەی ڕۆژێك بێت مافی خۆیان وەربگرنەوە.!

پێم وایە ئەو کارە ئەگەر موسوڵمانەکان نەیان کردایە بە گەلێکی شۆڕشگێڕو خەباتگێڕ دەدرانە قەڵەم.! ئەمەیە مانای ((من قتل قتيلا..))، نەك بەو شێوەی کە

ئـەو مرۆڤـە بـاوەڕ نەخۆشـانە دەڵـێن: کـە هەرکەسـێك پێـی بگـەیت دای پڵۆسـێنیی و سەری لەلاشەی بکەیتەوە لەپێناوی کەل و پەلەکەیدا..!! گـەلێك کـە فەرماندەکـەی، وە یـان بیـــروباوەڕەکەی سـەدان جـار پێـی وتبێـت: ﴿ وَلَا تَقْتُلُوا۟ ٱلنَّفْسَ ٱلَّتِى حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلْحَقِّ... ﴾ (الإسراء: ٣٣). پێی بلێـت: ﴿من قتل نفسا بغير نفس او فساد فی الأرض فكأنما قتل الناس جميعا ومن أحياها فكأنما أحيا الناس جميعا﴾. هەرگیـز لە خۆیەوەو بەناهـەق سـواری سەری کەس نابێت.!

*** دەڵێت: ( .... تا ئەو ژنانەی کە بە دیلییەتی دەیگرن...) لێرەدا باسی بەندە دێتە پێشەوە، بەڵام ئێمە نامانەوێ ئەو مەسەلە دوورو درێژەیە بخرێتـە بـەردەم، چـونکە ئەوە زۆر زۆری دەوێت، قەناعەتیشم وایە کەسانێك لە گۆمی بێ باوەڕییـدا چـەقیبن زەحمەتە بە ئاسانی مل ڕابکێشن.! جگە لەوەیش هەر لەساڵەکانی هەشتادا کتێبێکم لەسەر ئەو مەسەلەیە نووسیوە بەناوی (سەربەستی لە ئیسلامدا).! بەڵام بە کورتە: پێش ئیسـلام مەسـەلەی "بەنـدە" دونیـای گرتبوویـەوە، بەتایبـەت نیـوە دوورگـەی عەرەبی، کاتێکیش ئیسلام پێی گرت، ئیتر موسڵمانەکان لەسەر داواو هەڵنانی ئیسلام بۆ ئازادکردنیان، دەستیان دایەو صەدان و هەزاران بەندەیان کڕیی و ئازادیان کردن، وە ئیسـلام هەرگیـــز ددانـی نـەناوە بـە (بەنـدە)داو یاسـایەکی بـۆ دابنـێ و بیکـات بەشتێکی بنەمادار، بەڵکو بە مەسەلەیەکی ناچاریی و کاتی سەیری کردووە..**

بەتایبەت لەو جەنگانەدا دەسەپێنران بەسەر موسڵماناندا، وابـوو دوژمـن ژن و پیـاوی لێ دیـل دەکـردن و دەیکـردن بـە (کۆیلـە)، پاشـان موسـڵمانەکانیش لەبەرامبـەر ئـەو کردارەی ئەوانەوە هەرکەسێکیان بگرتایە لێیـان، دەیـانکرد بـە کۆیلـە، بـەڵام ئەڵبـەت هـەر بـەناو نـاوی (بەنـدە) بـوو، ئەگینـە بـە (بـرا) ناسـرابوون لـەناو موسـڵمانەکاندا: ((..إخوانكم خولكم...))[١٩] بەندەکانتان براتانن، چـی دەخـۆن، چـی لەبەردەکـەن، بـۆ

(١٩) أخرجه البخاري (٣٠)، (٢٥٤٥)، وفي "الأدب المفرد" (١٨٩)، ومسلم (١٦٦١) (٤٠)، وأحمد (٢١٤٣٢)، من طرق عن شعبة، عن واصل الأحدب، عن المعرور بن سويد.

ئــەوانیش ئــەنجامی بـدەن، وە بــەدەیان و صــەدان جـۆرو شـێواز هــەوڵی نەهێشـتنی بەندەی داوە، وە کۆیلایەتی زۆر بەلاوە قورس و ناڕەحـەت بـوو، بـەلاّم بـۆ ترسـاندنی دوژمن بوو، وەك وتمان ئـەوان موسـڵمانەکانیان دیـل دەکـردو دەیـان کردنـە (بەنـدە)، ئەگەر دوژمنیش وای لەگەڵ نەکـەیت، زیـاتر هێـرش دێنـێ و بێخـەم دەبـێ لـەخۆیی و کەس و کاریی..

ئەگـەر دیلـەکان ژنـی تیابووایـە زۆر هــەوڵی دەدا بـۆ گۆڕینــەوەی، وەك بـاوی خـۆی نەیدەهێشت بێ چارە بمێنێتەوە، ئاشکرایشە مەسەلەی (جنس) یەکێکە لە داخوازییـە سەرەکییەکانی لاشەو دەروونی مرۆڤ، نایەوێ (کبت) بێت و کـاتی بەسـەردا تێپـەڕێ و بخنکێنرێ، بەلاّم لەگەڵ کۆمەڵێ (ضوابط) و (ثوابت)دا، بۆیە داوا دەکات مارەیی کـەم بێـت و دونیـا پـێش چاو نەگیـــردرێ، هەنـدێ شـتی کۆمەلاّیـەتی جاهلییـەت فـەرزی کردوون لەسەر کوڕو کچ نـەمێنن، بۆیـە فـەرمووی: کـوڕو کـچ هــەر پێگەیشـتن دەسـت بەجێ کاریان ئەنجام بدەن پێش ئەوەی فەساد ڕوو بـدات، وە بـە چـەندین فـەرموودە کچان و کوڕان (أولياء)کانیان بانگ دەکات بە زوویی بیـان گەیـەنن بـە یـەك، تەنانـەت هەڕەشەیشی کرد لەوانەی ژن ناهێنن وە یان شوو ناکەن ((فمن رغب عن سنتي فلـيس مني))[20].

جگە لەوەیش قورئانی پیرۆز داوا دەکات لە دەوڵەت و دەسەلاّتداران و باوك و کەس و کاریان، ژنان، پیاوان (نێروو، مێ) کاریان ئەنجام بدەن: ﴿وَأَنكِحُوا۟ ٱلْأَيَـٰمَىٰ مِنكُمْ وَٱلصَّـٰلِحِينَ مِنْ عِبَادِكُمْ وَإِمَآئِكُمْ ...﴾ (النور: ٣٢). ئەمـە کورتـەی تێروانینـی ئیسـلامە لـە مەسـەلەی (جنس)ــدا.. با بڕۆینەوە سەر دیلەکان..

ئەگەر لەناودیلەکاندا ئافرەتیان تیا بوو – وەك وتمان – لەوانەیش بوو درێژە بکێشـێ و زۆر بمێنێتەوە.. ئـەوە بـۆ ئـەوەی ئـارەزووی (کبـت) نـەبێ، ئیسـلام دەفـەرمووێت: ئەگەر ژنی شوودار بوو یەك مانگ دادەنیشێ بۆ ئەوەی دەرکەوێ (حاملە) نیە، ئـەوجا

(٢٠) صحيح البخاري – كتاب النكاح، باب الترغيب في النكاح – حديث : ٤٧٧٧.

مارە دەکرێ لەو پێشمەرگەیەی دیلی کردووە، ئایا ئەمە باشە، یان ئەوەی کە لە زۆر شوێنی ئەم دونیایەدا دونیاخۆران تا ئەمڕۆش لە شەڕەکاندا پیادەی دەکەن، بەوەی کە ئافرەتان لایەنی بەرامبەریان دەگرن و دەیان پیاو دەکەنە لایان و دەست درێژیان دەکەنە سەر بەشێوەیەکی زۆر دڕندانە، بەڵام لەوەی ئیسلامدا ئەو ئافرەتە ژیان و بژێویی و پاراستنی دەکەوێتە ئەستۆی پیاوێك بە چاوی هاوسەرییەوە تەماشای دەکات.

باوەڕ ناکەم نووسەر جورئەت بکات بڵێت ئەوەی یەکەمیان باشترە، یان ئایا ئەمەیان باشترە، یان ئەو ئافرەتە هەروا بمێنێتەوە ساڵێك یا دوو ساڵ باجی جەنگێکی سەپێنراو ئەو بیدات، وە یان هەر ڕۆژەی بە ئارەزووی خۆی لەگەڵ کەسێکدا تێکەڵی بکات..؟ کامیان باشە..؟ گومانم نییە کە دەروون بەزییوەکان، ئەوانەی (جنس) بە هەموو شتێك دەزانن و دەڵێن: بەرەڵلا بکرێ باشە چی دەکات با بیکات..!!

کاتێ خوای گەورە لە سوورەتی (النساء)دا دەفەرمووێت:﴿ ....ٱلْمُحْصَنَٰتِ ٱلْمُؤْمِنَٰتِ فَمِن مَّا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُكُم ... ﴾ (النساء: ٢٥) ئەوەی مەبەستە..

سەرییشم سووڕ دەمێنێ شین دەکەن بۆ ئافرەت و ڕازی نابن بەو جۆرە مامەڵەیان لەگەڵ بکرێ...!! چونکە ئەوان هەموو ڕەخنەیەکیان لە ئیسلام ئەوەیە مەسەلەی (جنس)ی (کبت) کردووە... ئەبوو زۆر ڕازی بوونایە... بەڵام وا دەردەکەوێ تەنها دوژمنایەتییەکی سەرسەختانەیان هەیە لەگەڵ ئیسلامدا...!!

*** بوختانێکی تری گەورەو فیشاڵیان ئەوەیە کە دەڵێن: (کاتێ کە محمد زانی وردە وردە هەنگاوەکانی خەریکە بەرەو دواوە دەگەڕێتەوە، ئەو جەنگاوەرانەش زیاتر بیر لە بەدەست هێنانی غەنیمەت دەکەنەوە، بۆیە شێوەی داگیرکاری گۆڕیی و ڕووی کردە دەوڵەمەندو خاوەن سامان و خاوەن کۆیلەکانی قوڕەیش کە بێنە ڕیزی ئیسلامەوە هەموو سەروەت و سامانەکەیان پارێزراو دەبێت و بگرە دەتوانن (.....)،**

**بۆیە بەشێکی زۆر لە دەوڵەمەندو دەست ڕۆیشتووەکانی قورەیش، هاتنە ڕیزی ئایینی ئیسلامەوە).**

## ئێمەش دەڵێین:

**یەکـــەم**: ئـادەمیزاد خـوای گـەورە وا درووسـتی کـردووە، بەشـێکی ماددەیـە، وە حەزیشی لە دونیایە، دونیاش لـە چوارچـێوەی خوێـدا حـەڵاڵ و زوڵاڵـەو نەخشـەی بـۆ کێشراوە، بەڵام لـەڕێی عـەرەق و قومـارو ڕیبـاو سـوود خـواردن و غـەش و خیانـەت و (احتکار)و ماڵی ئـەم و ئـەوەوە نـەبێت: ﴿ قُلْ مَنْ حَرَّمَ زِينَةَ ٱللَّهِ ٱلَّتِىٓ أَخْرَجَ لِعِبَادِهِۦ وَٱلطَّيِّبَٰتِ مِنَ ٱلرِّزْقِ ۚ قُلْ هِىَ لِلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا خَالِصَةً يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ... ﴾ (الأعـــــــراف: ٣٢)﴿ وَلَا تَأْكُلُوٓا۟ أَمْوَٰلَكُم بَيْنَكُم بِٱلْبَٰطِلِ وَتُدْلُوا۟ بِهَآ إِلَى ٱلْحُكَّامِ .... ﴾ (البقرة: ١٨٨).

کەوابوو ئادەمیزاد بە سرووشـت سـەروەت و سـامانی خـۆش دەوێ، وە بێگومـانم کـە تەنها ئایینێك مەسەلەی نان پەیداکردنی لە بێژنگ دابێ و یاسای بۆ دانابێ و پـەرژینی سامانی ئەم و ئەوی کردبێت، هـەر ئـایینی پـیرۆزی ئیسـلامە.. وە هـەموو کـەس ددان بەم ڕاستییەدا دەنێت، کەوابوو دەبێ بگەینە ئەو ئەنجامە کە مرۆڤ حەزی لـە دونیایـە، بەڵام ئیسلام بۆی ڕاست دەکاتەوەو پێی دەڵێت ئـەوە بخـۆو، ئـەوە مـەخۆ.. کـەوابوو ئایینێك ئەوەندە سەرزەنشتی مرۆڤ بکات لـە کۆکردنـەوەی سـاماندا چـۆن دەگونجێـت ئەندامی وای ببێت ئـــــــەوان ئەو بوختانەیان بۆ بکەن..؟!

ئـەوەیش کـە گوایـە دەوڵەمەنـدەکان لـە ترسـی هاوەڵانـدا موسـڵمان بـوون نـەوەك ماڵـەکانیان زەوت بکـەن، بـۆ ئەوەیـە پێغەمبـەر ﷺ فەرموویـەتی: ((...عصـموا مـني دمـاءهم وأمـوالهم..))[٢١] وە هــەر بـۆ ئەوەیشــە کــە یاســایەك ببــێ بــۆ ناســاندن و جیاکردنەوەی موسڵمان لە نا موسڵمان.!

(٢١) صحيح البخاري – كتاب الإيمان، باب : فإن تابوا وأقاموا الصلاة وآتوا الزكاة فخلوا سبيلهم – حديث : ٢٥

هەموو گرووپێك شتێکی خۆی هەیە، بۆ ئەوەی ئەو خەڵکانە بکات بە ئەندامی خۆی، جا هەرکات وشەی (لااله الا الله)یان گوت ئەوکاتە: دوو شتیان دەدرێتێ:

یەکەم: بە موسڵمان دەدرێنە قەڵەم.

دووەم: ماڵ و سامانیشیان حەرام و یاساغ دەبێت و دەبێ مامەڵەی موسڵمانیان لەگەڵدا بکرێت.

ئەمە لەلایەکەوە لەلایەکی تریشەوە هەموو یاسایەکی جەنگی لە جیهاندا وایە کە هەرکات لەگەڵ لایەنێکدا جەنگا، هەر شتێکی بەردەست بکەوێت ئیتر مرۆڤ بێت یان هەرشتێکی تر دەیبات، چونکە بە خوێن و بە ئازار دوژمن شکاوە، جا بۆ ئەوەی دوژمن لاواز بێ بەپێی ئەو یاسایە شت و مەکی دەستکەوتی جەنگی دەبێت، لێرەشەوە ئەگەر موسڵمانەکان لەکاتی جەنگدا دەست بۆ سامانی ئەوان نەبەن، بەڵام ئەوان ماڵی ئەمان قووت بدەن و دەست بۆ ژن و منداڵی ئەمان ببەن، لەو کاتەدا دوژمن زیاتر زاڵ دەبێت و دێتە پێشەوە..، وا دەزانم هیچ کەسێك شتی وای پێ قبووڵ نابێت.

وە بێگومان هیچ دەوڵەمەندێکیش باوەڕی بە دینی "محمد" نەهێناوە لە ترسی ئەوەی ماڵەکەی ببرێت..! نەخێر..! بۆ نموونە هەر ئەوانەی ئەوان بە سەرمایەداریان داناون (عبدالرحمن، طلحة، عمر بن خطاب و...هتد)[٢٢].، هەر لە (مەککە)دا موسڵمان بوو بوون کە (١٣) ساڵ پاش ئەوە ئینجا فەرمان بە جەنگ هاتووە.

خاڵێکی تریش دەبێ بزانرێ، ئەویش ئەوەیە کە: ئایینی پیرۆزی ئیسلام هەموو بەرنامەو جموجووڵێکی دەبەستێتەوە بەخواو بە پاشە ڕۆژەوە (قیامەت)، بۆیە پاش هەر بڕیارێك گەلێ جار دەفەرمووێت: (واتقوا الله).. (تلك حدود الله فلا تعتدوها..) دیارە گەلێکی ئاوا خاوەن باوەڕ بە پاداشت و تۆڵەی پاشە ڕۆژ (جەهەننەم و بەهەشت)،

---

(٢٢) نە هەر ئەوەندە بەڵکو لە موسوڵمانانی پێشین (عبدالرحمن) هەشتەمین کەسە بــڕوای هێنــاوە.

بێجگە لەوەش خوای مەزن لە سەدان جێگەدا هانیان دەدات بۆ یارمـەتیی و هاوکـاری هەژاران و بەرزکردنەوەی پلەی ژیانیان و پاداشتیان لە قیامەتدا دەست دەکەوێتـەوە، گومان نیە کە ئەو بیروباوەڕە پاڵی پێوە دەنێت بۆ ئەنجامدانی پرۆسەکان بـێ ئـەوەی هیچ کەسێك زۆری لێ بکات.، هەر بۆیەش لە غەزای (تەبووك)دا موسـڵمانان هەرچـییان لە دەست هات درێغییـان نـەکرد بـۆ ڕێکخسـتنی سووپاکەو ڕێژەیـەك لـە دراو و مـەڕو ماڵاَت و دانەوێڵەیان دەدا بە هەژاران.

هـەر بۆیە لە ترسی خوا غەش و خیانەت و دزیی و جەردەیی و تاڵان و بڕۆو خـواردنی سامانی ئەم و ئەو و تێرکردنی ئارەزووی (جنس) بەسەر شەرەفی خەڵکـەوە لـەخۆیان یاساغ کرد، (کە هـەموو ئـاوات و مەبەسـتێکی نووسـەرو هاوبیـــرانی تێرکردنـی هێـزی (جنس)بیانە بێ سنـوور).!

ئەوان پێیان وایە کە مرۆڤ نابێ خاوەنی هیچ شـتێك بێـت، بـەڵکو تـەنها وەك ئامێرێـك دەوڵەت هەڵی سووڕێنێت و جیرەیەکی تایبەتی بۆ ببڕێتەوە، بۆ میوانی، بۆ نەخۆشـی، بۆ خوێندنی، بۆ سەفەری، بـۆ هـەموو پێداویسـتییەکانی تـری، نـابێ سـەیارەی ببـێ، خانووی ببێ، دووکانی ببێ، زەویی و زاری ببێ... هتد. هەر بۆیەش چاوی چـنۆکییان بڕیوەتە سامانەکەی (عبدالرحمن)و هتد. تەنانەت ئافرەتیش دەبێت (مشاع) بێت.

بە کورتی: بەهیچ جۆر ددان نانێن بە خاوەنێتی تاکییدا، بۆیە ئەگەر کەسـێك شـتێکی ببـێ بـە زۆر بـە کوتـەك لێـی دەسـێنن..!! چـونکە ئەوانـە دەڵـێن: نـابێ هـیچ خانەوادەیەکی بنەماڵەو میـواندار میوانی ببێ..!! نابێ ئەنـدازیارێك و بەردەسـتەکەی وەك یەك بن..!! دەبێ یەکسانی باڵی خۆی بکێشێ بەسەر وڵاتدا، دەوڵەمەنـدو هـەژار نەمێنێ..!! ئەمەش کورتەیەکی ئـــاوات و خەیاڵ پڵاوی ئەوانەیە..!!

ئێمەش دەڵێین: مـرۆڤ لـە ئیسـلامدا زۆر ئیعتیبـاری هەیـەو زۆریـش ڕێـز لـە خـۆیی و، خانوو بەرەیی و زەویی و زاریی و هەموو دەسەڵاتێکی تری گیــراوە، لەگەڵ ئەوەیشـدا بەرنامەی تایبەتی بۆ داناوە بۆ پەیداکردنی نان و خۆراك و ژیان و ژیواری، وە هەرچـی

لەو ڕێگایەوە نەبێت لێی دەسێنێتەوەو دەیداتــەوە دەست خاوەنەکــەی ئەگــەر زانـرا، ئەگینــە لــە پرۆســە گشــتییەکاندا بــەخت دەکـرێ (خەســتەخانە، قوتابخانــە، جــادەو ڕێگەوبان.. هتد.). لەباتی ئەوەیشدا —وەك وتمان— ڕێژەیەکی تایبەتی داناوە لەسـەر دەوڵەمەندەکان (بەناوی زەکاتەوە) دەوڵەت خۆی کۆی دەکاتەوەو بەڕێـژەی هــەژاریی و نەداریی و ژمارەی خێزان بەشی ساڵێکی، وە یان شەش مانگی، وە یان دەیکـات بـە مانگانە بۆیان، لەگەڵ ئەوەیشدا کە ئیسلام ددان دەنێت بــەخاوەنێتی تاکییــدا لــەوەدا مرۆڤەکانی دەورووبەری تووشی زیان دەبن، لەو کاتەدا ڕێگـای لێ دەگیــررێ و نابێـت ئەوەندە بڕوات زیان بگەیەنێت بەم و بـــــــەو لەبــەر بەرژەوەنـدی خـۆی بـە یاسـای ((لاضــرر ولاضرار))[٢٣].

ئەمــە لەلایەکــەوە، لەلایــەکی تــرەوە مەســەلەی یەکســانی —وەك ئــەوان دەڵــێن— پێچەوانەی سرووشتە، چونکە پلەی ژیــریی و، خوێندەواریی و، هێـزی توانـای لەشـیی و، شێوەی سەلیقەی بازرگانیی و، بەدەست هێنانی کشتوکاڵ لە مرۆڤـدا جیـاوازە، وە لەم بوونەوەرەدا هەرگیز ئەوانە یەکسـان نـابن، چـونکە ئەگـەر شـتی وا بگـونجێ هـیچ کەسێك ڕازی نابێت ئەگەر فەڕاش، وە یان شووان، وە یـان نانـــــەوا، وە یـان وەسـتا بەنا، وە یان کرێکار بێت... بەڵکو دەبێ هەموو وەك یەك بن. واتــە: هــەر هــیچ نــەبێت ئەندازیار بن، ئایا شتی وا دەگونجێت...؟!

ئەگـەر کراو گونجا ئەوا با وابێت... بەڵام ئایـا شـتی وا هــەرگیز ڕوو دەدات..؟!! یـا ئەوە سـەرقاڵکردنی مرۆڤـە بـێ مسـتەواکانەو دەهـۆڵ لێدانـە بـۆ شـتێکی ئەندێشــەیی ئـاوا... گریمـان شـتی وا کـرا، ئایـا ژیـان دەڕوات..؟! کـێ شـەقامەکان خـاوێن بکاتەوە...؟!! هەروەها.... هتد.

ئەمەیـە خـوای گــەورە دەفــەرمووێت: ﴿ أَهُمْ يَقْسِمُونَ رَحْمَتَ رَبِّكَ ۚ نَحْنُ قَسَمْنَا بَيْنَهُم مَّعِيشَتَهُمْ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا ۚ وَرَفَعْنَا بَعْضَهُمْ فَوْقَ بَعْضٍ دَرَجَاتٍ لِّيَتَّخِذَ بَعْضُهُم بَعْضًا سُخْرِيًّا ۗ ... ﴾ (الزخرف: ٣٢).

(٢٣) حديث صحيح، صححه الشيخ الألباني في إرواء الغليل: ٨٩٦.

ئیسلام ڕێزی خاوەنێتی تاکی دەگرێ، جگە لەو ڕێژەیەش کە لەسەری داناون دەبێ بدرێ بە هەژاران بەناوی زەکاتەوە، وە هیچ شتێك لەکەس ناسێنێت، بەڵام مرۆڤەکان هەڵدەنێت و ویژدانیان دەجوولێنێت بۆ زیاتر ئاوڕدانەوەی بەلای هەژارو بێ نەواو شەل و پەککەوتەو کەمئەندامەکاندا... پێیان دەڵێت: هەرچەند ژیان وا دەڕوات باسکرا، بەڵام پلەو پایەی هەرە بەرز لە پاشەڕۆژدا بۆ ئەوانەیە (دەستی هەژارەکان دەگرن و یارمەتییان دەدەن):

﴿ ٱنظُرۡ كَيۡفَ فَضَّلۡنَا بَعۡضَهُمۡ عَلَىٰ بَعۡضٖۚ وَلَلۡأٓخِرَةُ أَكۡبَرُ دَرَجَٰتٖ وَأَكۡبَرُ تَفۡضِيلٗا ﴾ (الإسراء: ٢١).

پێیان دەڵێت: سوێند بەخوا هەرکەسێك خۆی تێر بێت و دراوسێکەی برسی بێت، ئەو کەسە موسڵمان نییەو خوا خۆشڕوو نییە لێی.

وە هەروەها — باسکردنی ئەو هەموو شتە وردانە بۆ بووژانەوەی هەژاران — لە زەکات و سەرفیترەو سەدان جۆری کەسارەت و (بەدەل)و (فدیە) لە فەرزەکاندا.. لێرەدا زۆر دەبات و زۆری دەوێت، وایش دەزانم ئەو شتانە زۆر ئاشکران، بەڵام ئەوانە خۆیان کوێر کردووە..! دیسانەوە ئەو پرسیارە دێتە ئاراوە ئایا ئەمڕۆ سەرۆکەکانیان وەك لای خواروو دەژیین..؟! دەتوانن وەك فەڕاشەکانیان بژیین..؟! هەژارێکی کۆمۆنیست وەك دەسەلآتدارێك وایە..؟! ئێستا لە ولآتی (ڕووس)دا دەیان و سەدان دەستەسڕ ڕا دەخەن و سووالْ دەکەن..؟! بەڵام کۆشکی سەرۆك حیزبەکان لە ئاسماندایە...!!!

پێم چاکە لەوە زیاتر فریووی خۆیان و خەڵکانی نەخوێندەواری — وەك خۆیان — نەدەن، وە ئەو جەماوەرە لەسەر خەیالْ، (مادام هەمووی خەیاڵە با چەورتر بێت بەنج نەکەن) لەولایشەوە ئەمڕۆ ئەوانەی بوونەتە حەماڵی ئەو بیرۆکەیە — ئایا ژن و منداڵەکانیان وەك هی خوارەوەی خۆیان دەژیین..؟!! لەو سۆنگەیەوە — پاش پێدانی ئەو ڕێژەیە بۆ هەژاران و، پاش هەڵنانیان بۆ بەرزکردنەوەی پلەی ژیانی هەژاران — مرۆڤ دەتوانێ هەوڵی خۆی بدات و سەروەت کۆ بکاتەوە، دەتوانێ بخوێنێ تا (دکتۆرا) بەدەست بهێنێت، وەیان ببێتە پرۆفیسۆر، یان لەمە خوارتر بڕوانامەی

شەش بەدەست بهێنێت، خۆ ئەگەر ساڵێکی گرانیی و قات و قڕی بەسەردا هات، ئەوا دەوڵەت هەژارەکان دابەش دەکات بەسەر دەوڵەمەندەکانداو دەبێ بیانژیینەن، تا ئەو گرفتە نامێنێت، ئەمەیش لە ژیانی خەلیفەی دووەمدا ﷺ بە زەقی دەبینرێت...

ئەو (عبدالرحمن)ـەیش ئەوانەی نووسیوییانەو چاوی دوژمنایەتییان تێ بڕیوە هەر لە موسڵمانەکانی سەرەتای ئیسلامەو بازرگان بووەو ڕێز لە بازرگانییەکەی گیراوەو، هەموو کاتێکیش دەستی لە سەروەتەکەیدا بووە بۆ هەژاران. مێژوو نووسەکان دەڵێن: (تصدق عبدالرحمن بن عوف على عهد رسول الله ﷺ شطر ماله، ثم تصدق بعد بأربعين ألف دينار، ثم حمل على خمسأة فرس في سبيل الله، وخمسأة راحلة، وكان أكثر ماله من التجارة). أخرجه ابن المبارك. [٢٤]

ئیسلام دەوڵەمەندی ئاوا پەروەردە دەکات کە نیوە سامانەکەی بە پێ خۆشبوونی خۆی دەدات بە هەژاران، پاشان (٥٠٠) ئەسپ، وە (٥٠٠) وشتر بەڕێ دەخا بۆ پێشمەرگەکان بۆ بەرەی جەنگە سەپێنراوەکان...!! لەولایشەوە خۆیشی لەبەرەی جەنگەکاندا بووە، تەنانەت تەنها لە (ئوحود)دا (٢١) برینی پێوە بوو.! لەڕیوایەتێکی تردا قاچێکی لەدەستداوە، تا ما بوو شەل بوو.. ئەمەیە مرۆڤی بە کەڵك بۆ وڵات و هەژارو بێ نەواو، لەولایشەوە سەربازێکی گیان لەسەر دەست بێت لە گۆڕەپانی خەباتدا، لێرەش دونیا خۆرەکان بەرپەرچ بداتەوەو نەهێڵێ بێنە سەر وڵات و نیشتمانیان – ئەوە بۆ بەراوردێکی ناکەن لەگەڵ خۆتاندا...؟!! تا ئێستا جگە لەوەی کە هەمووکات لەسەر کۆڵانێکدا، لەجێگایەکی گونجاو بۆ هاتووچۆی ژنان وەك خۆتان – بارەگایەکتان بووبێت، ئادەی بزانم چیتان کردووە بۆ کوردستان..؟!! کام دوژمنتان شکاندووە، کوا هێزو پێزتان..؟! کوا دیفاع و بەرگریتان لە کوردستان..؟! جگە لەوەی گەلێ جار چوونەتە باوەش دوژمنیشەوە..!

چۆن دەتوانن ئەو کەڵە پیاوانە (عبدالرحمن، طلحة، عمر، خالد...هتد). تاوانبار بکەن..؟!! چۆن ڕووتان هەیە..؟! چۆن ئاوا بێ شەرمانە ئایین و کەرامەتی زیاتر لە

---

(٢٤) الراوي: محمد بن مسلم بن عبيدالله، المحدث: الشوكاني، المصدر: در السحابة، الجزء أوالصفحة:١٩٠، حكم المحدث: مرسل

(ملیار)ێك موسڵمان بریندار دەکەن..؟! بۆ هەر دەتانـەوێ ئـاژاوەو گێـرە شـێوێنی لـە وڵاتدا بنێنەوە..؟!! ناترسن لەو گەنج و لاوە لە مزگەوتەکانەوە دێنـە دەرەوە بنکـەو بارەگای گێرە شێوێنیتان بڕووخێنن بەسەرتانا..؟!! ئێمـە کـە ئـەم هـەموو هێرشـانە دەکرێتە سەر ئـایین و خواپەرستییمان لەلایـەن چـەند دەسـتەیەکی بـەکرێ گیـــراوی جوولەکەوە (لە ئێوەو هاو وێنەکانتان) لەبەر بەرژەوەندی گەل و وڵات و نیشتمانمان و نایشمان دەوێ بە زۆر بتان نێرین بـۆ دۆزەخ..! بۆچـی بـە زۆر دەمـان هێننـە قسـەو گوتار..؟!! بۆ دەتانەوێ ئایینێکی زیاتر لە (١٤) سـەدە لـە بـن بێـنن – بـە خـەیاڵی خاوتان- ..؟!! بۆچی بیـــر ناکەنـەوەو ژیـر نـابن..؟!! ئـەی بـۆ نـازانن دەرەنجـامی ئێوەش وەك ئاغاکانی ڕووستان دەبێت..؟!! پـاش ئـەو هـەموو فشـارو (ضـغط)ـــەو مزگـەوت سـووتاندن و مزگـەوت کردنـە (طویلـة)ی وڵاغ و تیاترۆخانـەو، جێگـەی ژن گۆڕینەوەو ڕابواردن..!! کـوا بە چی گەیشتن..؟!! ئەوە ئێستا تـازە ئیسـلام نـوێ دەبێتەوە... نامانەوێ کاتمان بکوژین پێتانەوەو، نووکی قەڵەمەکانیشمان پیس بکەین بەناوی ئێوەوە..!

*** چۆن ئایین ناتوانێ (پـارێزەری بەرژەوەندییـەکانی هـەژاران بێـت...)..!! کـاتێ ئیسلامی پیـــرۆز هات سەدان، بگرە هەزاران و، زیاتر لە مرۆڤەکان دەیان ناڵاند لە ژێر چەپۆکی سەروەت مەندەکانی ئەو کاتەدا لە بازاڕی سـوودو ڕیبـادا... دەوڵەمەنـدێك شتێکی ئەفرۆشت بە هەژارێك بە قەرز، ئەگەر لەکاتی خۆیدا پارەکەی نەبووایە، چەند قاتی دەکردەوە لەسەری... جۆرەها جۆرو شێوە سوود خواردن هەبوو وە هەژارەکان لەژێر مەینەتدا بوون، خوای گەورە یاسای بۆ دانان و هەڕەشەی کرد لە دەوڵەمەنـدە سوود خۆرەکان و، پێغەمبەریش ﷺ بە (عەمەلی) پیادەی کرد:** ﴿ٱلَّذِينَ يَأْكُلُونَ ٱلرِّبَوٰاْ لَا يَقُومُونَ إِلَّا كَمَا يَقُومُ ٱلَّذِى يَتَخَبَّطُهُ ٱلشَّيْطَٰنُ مِنَ ٱلْمَسِّ ۚ ...﴾ **(البقرة: ٢٧٥).** ﴿وَإِن كَانَ ذُو عُسْرَةٍ فَنَظِرَةٌ إِلَىٰ مَيْسَرَةٍ ۚ ...﴾ **(البقرة: ٢٨٠).**

ئیسلامی محمد ﷺ بەڵێنی بە هیچ کەسێك نەدا جیهان یەکسان بکات، هەژار نەمێنێ، هەموو کەسێك هەموو ڕۆژێك ئەوەندە پارە دەخرێتە ژێر سەرینەکەیەوە.!! نەخێر.. وەك برادەرانی کۆمۆنیست لەسەرەتاوە جوتیارو کرێکارەکانیان بەوە فریو دەداو دەیان وت: (شیوعییەت) گەر جێگیر ببێ هەموو ڕۆژێك ئەوەندە پارە دەخرێتە ژێر سەر سەرینەکەیەوە...!!

نەخێر (محمد) پێغەمبەر ﷺ وای نەدەوت. بەڵکو لەقورئانەکەیدا پێی دەفەرموون: ﴿ هُوَ ٱلَّذِي جَعَلَ لَكُمُ ٱلۡأَرۡضَ ذَلُولٗا فَٱمۡشُواْ فِي مَنَاكِبِهَا وَكُلُواْ مِن رِّزۡقِهِۦۖ وَإِلَيۡهِ ٱلنُّشُورُ ﴾ (الملـــــك: ١٥). مەبەست ئەوەیە مرۆڤەکان زۆر بە وردیی و ژیرانە لە زەوییا کار بکەن و بگەڕێن نان و خۆراك پەیدا بکەن، ئاشکرایە کارو تێکۆشان گەورەترین چەکە بۆ لەناو بردنی هەژاریی و بێ نەوایی، لەولایشەوە بۆ سەرکەوتن و زاڵ بوون بەسەر گرفتەکانی ژیاندا.. هەر بۆیە فەرمانکراوە بە ئادەمیزاد بە ئاوەدان کردنەوەی زەوی: ﴿ ...هُوَ أَنشَأَكُم مِّنَ ٱلۡأَرۡضِ وَٱسۡتَعۡمَرَكُمۡ فِيهَا .... ﴾ (هود: ٦١).

ئیسلام دەرگای کارو کۆشش دەکاتەوە بۆ مرۆڤەکان بۆ ئەوەی چی دەزانن، چۆن دەزانن زەوی ئاوەدان بکەنەوە، هەرکەس بەپێی پسپۆری خۆی، وە هیچ ڕێگەیەکی لێ ناگرێ مەگەر زیان بە مرۆڤەکانی تر بگەیەنێت... گومان نیە بەو جۆرە هەوڵ بدرێ خێرو بێر دەڕژێ بەسەر دەوڵەتداو کرێکارەکانیش – پێش دەوڵەت – سوودمەند دەبن و پێش ئەوەی عەرەقی ناوچاوانیان وشك بێتەوە کرێ و مزەی خۆی وەردەگرێت و هیچ جۆرە ستەمێکی لێ ناکرێ.، ئیسلام ڕێگەی لێ ناگرێ ئەگەر زیادەیەکی لێ مایەوە، بیدات بە پارچەیەك زەوی، وە یان باخێك، وە یا... وە یا... بۆ کاتی نەخۆشی، وە یا بۆ کاتی پیری، وە یا بۆ منداڵەکانی پاش خۆی.

ئیسلام ئاوا هەژارەکان تێ دەگەیەنێت، ئیتر ناڕوا چەواشەیان بکات بەشتی پڕووپووچ و بێ بناغەوە بەناوی (توکل) لەسەر خوا، وە یا ئاسمان ببارێنێ... نەخێر، چونکە پێغەمبەر ﷺ بە یاسای (إعقلها وتوكل على الله...) هەموو شتێکی تێ گەیاندن

و لە هەموو بارێکی هەڵەیش هۆشیاری کردنەوە، وە درووشمی موسڵمانان: (ابذر الحب وارج الثمار من الرب)ــە... لەمە بەولاوە هەرچی بوترێ، وە یا گوترابێ درۆو دەلەسەیە.

وتیان بە پێشەوا (ئەحمەد) ڕات چیە سەبارەت بە کەسێك لە ماڵەوە یا لە مزگەوت دابنیشێ و بڵێ هیچ شتێك ناکەم تا ڕۆزی خۆمم بۆ دێت.؟! پێشەوا (ئەحمەد) فەرمووی: ئەوە پیاوێکی نەزانە، ئەی بۆ نەیبیستووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((.. وجعل رزقي تحت ظل رمحي..))[٢٥]..؟! واتە: ڕزق و ڕۆزی من خراوەتە ژێر سێبەری ڕمەکەمەوە..! نەت بیستووە کە هاوەڵان بە دەریاو وشکانیدا دەڕۆیشتن بۆ پەیداکردنی ژیان و زیندەگی..؟! خوای گەورە ئەمەی ئەدا بە گوێیاندا: ﴿ وَلَقَدْ مَكَّنَّاكُمْ فِي الْأَرْضِ وَجَعَلْنَا لَكُمْ فِيهَا مَعَايِشَ.... ﴾ (الأعراف: ١٠). واتە: لە زەویدا سەقامگیرمان کردوون و ژیان و زیندەگیشمان بۆ داناون...﴿ وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِي آدَمَ وَحَمَلْنَاهُمْ فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ وَرَزَقْنَاهُم مِّنَ الطَّيِّبَاتِ .... ﴾ (الإسراء: ٧٠). واتە: بێ سۆ ئێمە ڕێزێکی زۆرمان لە تۆرەمەو نەوەی ئادەم گرت: زانیاریی و، ژیریی و، قەدو قامەتی ڕێك و جوانمان پێ بەخشی، کە ئەوەمان بۆ گیانلەبەرانی تر نەکردووە، وەکو خوا لە جێیەکی تردا دەفەرمووێت: ﴿ لَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنسَانَ فِي أَحْسَنِ تَقْوِيمٍ ﴾ (التين: ٤). یان دەفەرمووێت: ﴿ ....وَصَوَّرَكُمْ فَأَحْسَنَ صُوَرَكُمْ... ﴾ (التغابن: ٣). وە لە وشکانیی و، لە دەریادا هەڵمانگرتن بەو شێوە کە کەشتیی و جۆرەها هۆی ترمان بۆ گواستنەوەیان پێدان، ئەوەتە ئێستایش — سەرەڕای ئەوانە — خەریکە تەواوی زەویی و بۆشاییەکانی زەویی و بۆشاییەکانی ئاسمانیش دەپشکنێ، وە ڕزق و ڕۆزیی پاکیشمان پێدان.[٢٦] ... ﴿ اللَّهُ الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ الْأَرْضَ قَرَارًا وَالسَّمَاءَ بِنَاءً وَصَوَّرَكُمْ فَأَحْسَنَ صُوَرَكُمْ وَرَزَقَكُم مِّنَ

(٢٥) پێشەوا ئەحمەد. صحيح، صححه الشيخ الألباني في صحيح الجامع، برقم: ٢٨٣١.

(٢٦) تەفسیری ڕامان، چاپی دووەم، نووسینی: مامۆستا مەلا ئەحمەد کاکە مەحموود. لاپەڕە: ٥٧٩.

ٱلطَّيِّبَٰتِۚ ... ﴾ (غافر: ٦٤). واته: هەر ئەو خوایە زەوی بۆ کردوون بە بارەگاو نشیمەن و نیشـنگە، تـا تیایـا بـژین و بحەوێنـەوەو، ئاسمـانیش بـە بینـاکراو وەك گومـەزی لەسـەرووتانەوە، وێنـەی کێشـاون، جـوان وێنـەی کێشـاون، چـونکە ئێـوە لـە هـەموو گیانلەبەرێك باڵاو بەژنتان جوانتـــرە، وە لە هەرچی حەڵاڵ و پاکـە ڕزقـی پێـداون، وە لەم ئایەتەشدا دەفـەرموویت: ﴿ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَرْضَ فِرَٰشًا وَٱلسَّمَآءَ بِنَآءً وَأَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَخْرَجَ بِهِۦ مِنَ ٱلثَّمَرَٰتِ رِزْقًا لَّكُمْ ۖ فَلَا تَجْعَلُوا۟ لِلَّهِ أَندَادًا وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴾ (البقـــــــــرة: ٢٢). دووپاتی ئەو هەموو نیعمەتانە دەکاتەوە... (تەفسیری ڕامان لە ماناو مەبەستی قورئان).

ئەمانەو چەندین ئایەتی تر مرۆڤ تێ دەگەیەنن کە ڕۆزییان لای خوایە... بەڵام لەبەر ئـەوەی کـە بـە هەڵـە تـێ نەگـەن وەك ئـەو نەزانانـە ئـەم ئایەتـەی دا بـە گوێیانـدا: ﴿ ....فَٱمْشُوا۟ فِى مَنَاكِبِهَا وَكُلُوا۟ مِن رِّزْقِهِۦ .... ﴾ (الملـــــك: ١٥)... ﴿ فَإِذَا قُضِيَتِ ٱلصَّلَوٰةُ فَٱنتَشِرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ وَٱبْتَغُوا۟ مِن فَضْلِ ٱللَّهِ .... ﴾ (الجمعة: ١٠).

محمد پێغەمبەر ﷺ بەو جۆرە مرۆڤەکانی دەوروبەری تێگەیانـدووە، هـەڵی نـاون بـۆ ژیان، بگەڕێن بە کون و قوژبنەکانی زەوییدا بۆ ژیـان، وا ئـەزانم گـەلێك کـەس ئـەوەی بیسـتووە کـە پێشـەوا (عومـەر) خـەڵکێکی بینـی لـە مزگەوتـدا مابوونـەوە بـەبیانووی (تـەوەککول) لەسـەر خـوا، بـە قامچـییەکەی پێیانـا هـات و کردنیـە دەرەوەو وتـی: (لايقعدن أحدكم عن طلب الرزق ويقول: اللهم ارزقني، وقد علـم أن السـماء لاتمطـر ذهبـا ولا فضة..). هیچ کەسێك پاڵ نەداتەوە لە بەدەست هێنانی ڕۆزیی و دابنیشـێ و بڵـێ: خوایا ڕۆزیم بدەیتێ...، خۆیشـی دەزانێ کە لە ئاسمانەوە زێڕو زیو ناباریٚ...

هەندێ کـەس دەسـت لـە ئـیش و کـار هەڵـدەگرێ و خـەریکی –بـە حیسـابی خـۆی– خواپەرسـتییە، بـەڵام بـە هەڵـە وەری گرتـووە، چـونکە لـە ئیسـلامدا گۆشەگیـــریی نەبووەو نیە، بەڵکو هەوڵ و تێکۆشان هەیە، پەیداکردنی ژیان – لە ڕێگـەی پەسـەندی

خۆیەوە - خراوەتە پاڵ جیهاد: ﴿ ....وَءَاخَرُونَ يَضْرِبُونَ فِي ٱلْأَرْضِ يَبْتَغُونَ مِن فَضْلِ ٱللَّهِ وَءَاخَرُونَ يُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ .... ﴾ (المزمل: ٢٠).

پێشەوا (عومەر) دەڵێت: هیچ شتێكم بە ئەندازەی ئەوە پێ چاك نییە — دوای جیهاد — تیایا بمرم ئەو كاتەی نەبێت خەریكی كەسابەت بم ((ما من حال يأتيني عليها الموت بعد الجهاد في سبيل الله أحب الي من أن يأتيني وأنا ألتمس من فضل الله)).

بۆ هەڵنان و بۆ پەیداكردنی زیندەگییە كاتێ پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ((التاجر الصدوق الأمين مع النبيين والصدقين والشهداء)) [٢٧].

ئەمانەو بە سەدان فەرموودەی تر بۆ پەیداكردنی زیندەگی... مەبەستی منیش لەمەدا ئەوەیە: ئەوانەی پێیان وایە محمد ﷺ بەڵێنی یەكسانی داوە بە هەژاران و پاشان نەیپاراستووە...!! با بزانن بە هەڵەدا ڕۆیشتوون و هەرگیز هەرگیز پێغەمبەر ﷺ بەڵێنی یەكسانی نەداوە بە هیچ كەسێك، بە واتاكەی ئەوان: (كە تەواوی مرۆڤەكان وەك یەك وا بن لە ژیاندا.... بەڵێ لە ئیسلامدا یەكسانی هەیە، بەو واتایە هەموو كەسێك بەپێی خۆی ژیانی بدرێتێ... لەوە بەولاوە هیچی پێ نەوتوون و پاشان لێی پەشیمان بووبێتەوە..!!

درووشمی ئیسلام بۆ نەهێشتنی هەژاریی و نەداریی و شیرینكردنی كردو كۆششەو لێخن كردنی سواڵ و دەست پانكردنەوەیە لەم و لەو، وە یا چاو بڕینە سامانی مەردووم، بۆ ئەوەی ولات پێشەوە بڕواو گەل ژیانی نزیك بێتەوە بە یەكترو (حقد) و (حەسادەت) نەمێنێت، پێیان دەڵێت: ((: ما أكل أحد طعاما قط، خيرا من أن يأكل من عمل يده، وإن نبي الله داود عليه السلام، كان يأكل من عمل يده)) [٢٨].

واتە: هیچ نانێك پیرۆزتر نیە لەو نانەی بە ڕەنجەشانی خۆت بێت.! لە پیاوە صاڵحەكانیان پرسیوە: (ئەو كەسە كردو كۆشش دەكات لات خۆشەویسترە، یان

(٢٧) رواه الترمذي وقال حديث حسن، وقال الألباني في صحيح الترغيب حديث صحيح لغيره برقم: ١٧٨٢.

(٢٨) صحيح البخاري – كتاب البيوع، باب كسب الرجل وعمله بيده – حديث : ١٩٨٤.

ئەوەی هەر خەریکی زیکرو ویردو نوێژه..؟). وەڵامیان ئەوە بووە: کرێکارو بازرگان و جوتیار خۆشەویسترە. (( لأن يأخذ أحدكم حبلـه، فيـأتي بحزمـة الحطـب علـى ظهـره، فيبيعها، فيكف الله بها وجهه خير له مـن أن يسـأل النـاس أعطـوه أو منعـوه))[٢٩]. دار بفرۆشیّ بە کۆمەڵ زۆر زۆر چاکترە لەوەی داوا بکەیت لەم لەو.. جا بتدەنیّ، یا نە.

وە بە شانازییەوە پێغەمبەران و فەرماندەی ئایینەکان شوان و کرێکار بوون: ((ما بعث الله نبيا إلا رعى الغنم، فقال أصحابه : وأنت ؟ فقال: نعم، كنت أرعاها على قراريط لأهل مكة))[٣٠] .. ((وإن نبـي الله داود عليه السلام، كان يأكل من عمل يـده))[٣١]. ((وكـان آدم حراثا، وكان نوح نجارا، وكان ادريس خياطا، وكان موسى راعيا))[٣٢].

چونکە نێردراوانی خودا یاسای ژیان شارەزا بوون، زانیویانە دەبیّ هەموو کەسیّ هەوڵ بدات، نەك کۆمەڵیّ بەناوی (طبقة الفقراء) چاو ببڕنە دەوڵەمەندەکان و پێیان وابێت دەبیّ سامانی ئەوان بدریّ بەمان. !

ئێمە زانا پایە بڵندەکانمان هەریەکەیان خەریکی کارێك بووە، سەیرکە لەگەڵ سەرکەوتنی پایەی زانیاریشیاندا هەر بەجۆری کارەکەی خۆیەوە ناوبانگی بووە: (البزاز، القفال، الزجاج، الخراز، البقاص، الخراص، الخياط، الصبان، القطان...). ئەگەر ئەمە مانایەك بگەیەنێت، ئەوە دەگەیەنێت کە مرۆڤ دەبیّ خۆی هەوڵ و کۆشش بدات بۆ ژیانی، وە بەپێی ئەوە سامانی هەبێت.

جگە لەوەیش ئەگەر کەسانێك بوون نەیان دەتوانی کرێکاری بکەن و ژیان پەیدا بکەن وەك: (منداڵ و پیرە ژن و، پیرە پیاو و، بێوەژن و، نەخۆش و کەمئەندام و..هتد). ئەوە دەبیّ خزم و کەس و کاری نزیکیان (نەفەقە)و گوزەرانیان بۆ دیاری بکەن بەپێی بوون و دەسەلات.. ﴿ وَأُوْلُواْ ٱلۡأَرۡحَامِ بَعۡضُهُمۡ أَوۡلَىٰ بِبَعۡضٖ فِي كِتَٰبِ ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمُۢ ﴾

(٢٩)صحيح البخاري – كتاب الزكاة، باب الاستعفاف عن المسألة – حديث : ١٤١٣.

(٣٠)صحيح البخاري – كتاب الإجارة، باب رعي الغنم على قراريط – حديث : ٢١٦٥.

(٣١) صحيح البخاري – كتاب البيوع، باب كسب الرجل وعمله بيده – حديث : ١٩٨٤.

(٣٢) الراوي: عبدالله بن عباس، المحدث: ابن حجر العسقلاني، المصدر:فتح الباري لابن حجر، الجزء أو الصفحة:٣٥٨/٤، حكم المحدث:إسناده واهٍ.

(الأنفال: ٧٥). ئەو مەبەستە دەسەلمێنێ.. جگە لەو، کە دەیان فەرموودە هەڕەشە دەکەن لەوانەی دەست لە کەس و کاریان هەڵدەگرن و لێیان ناپرسنەوە: ((..من کان یؤمن بالله والیوم الآخر فلیصل رحمه..))[٣٣]. مەبەست بە جێ بەجێکردنی پەیوەندی خزمایەتی نەفەقەو ئەنجامدانی ئەرکەکانی سەرشانییەتی، ئیمامی (نەسائی) دەگێڕێتەوە: ((إبدأ بنفسك فتصدق علیها، فإن فضل شيء فلأهلك، فان فضل عن أهلك شيء فلذوي قرابتك، فإن فضل شيء عن ذوي قرابتك فهكذا وهكذا))[٣٤].

سەرەڕای ئەوانەیش دەبێ (بوودجە)ی گشتی موسڵمانان زۆر بە هۆشیاری و زیرەکانەوە ئاگاداری ژیانی هەژاران بکات و هەوڵ بدات هەموویان بخاتە گەڕ لەسەر ئیش و کار، ئەگینە دەبێ مانگانەیان بۆ ببڕێتەوە هەر خێزانەی بەپێی خۆی.، لەمەیشدا جیاوازی نییە لە نێوان موسڵمان و خاوەن نامەکاندا.. وەك لە وتەو کرداری (عومەری کوڕی خەتتاب)دا هاتووە، خۆ ئەگەر بوودجەی گشتی لە توانایدا نەبوو، پێویستە کاربەدەستی موسوڵمانان ئەندازەیەك سامان (قەرز) بکات لەسەر دەوڵەمەندەکان بۆ هەژارەکان (ئەگەر دەوڵەمەندەکان بە ئارەزوو نەیان دەکرد).. کەوابوو محمد ﷺ ئا بەو شێوەیە کۆمەڵ و کۆمەڵگە پێکەوە گرێ دەدا، بێ ئەوەی کەس بکات بە دوژمنی کەس، ئەمە لەلایەکەوە، لەلایەکی تریشەوە لە ئاخر پلەدا هەژارەکان وێڵ ناکات و بیانخاتە ژێر رکێفی دەوڵەمەندەکانەوە.، ئەوەتە ئەگەر ویژدان نەجوولا، دەوڵەت بە زۆر لێیان دەسێنێ بۆیان).!

کۆتایی ئەم مەسەلەیە دەهێنم بەوەی کە لە کاتێکدا حوکمی ئیسلامی پیادە دەکرا لە گەلێ جێگادا هەژاری نەماو کەسێك نەبوو (زەکات) وەرگرێ، بۆیە ناچار دەیان ناردەوە بۆ خەزێنەی گشتیی، بەتایبەتی لە سەردەمی هەردوو (عومەر)دا، ! (مەعان)

---

(٣٣) صحیح البخاري – كتاب الأدب، باب إكرام الضيف – حدیث : ٥٧٩٢

(٣٤) رواه النسائي، وصححه الألباني فی المجتبی لسنن النسائي برقم: ٢٥٤٦ .

لـە (یەمـەن)دا بـوو کـەس دەسـت نـە دەکـەوت زەکـاتی بـداتیٚ، بۆیـە ناردییـەوە بـۆ مەدینە.!

بەڵێ بەم کورتە باسە ڕۆشن بووەوە کە محمد ﷺ هەژارەکانی دەست خەڕۆ نـەکردووە (وەك برادەرە لەچکە سوورەکان دەڵێن).!!!

ئومێدەوارم خوێندەوارەکانیان، وەك خوێندەوار بلێن و بنووسن و دیراسە بکـەن وەك تووتی لاسایی نەکەنەوە، هەر هیچ نەبێت هەندێ کتێبی ئیسلامیی لە بـارەی کرێکـارو هەژارو نەهێشتنی هەژارییەوە بخوێننەوە.

*** ئەو دەزگایەی (سامان نووری) کاری تیا دەکات دەڵێت: (هـەر لـە دوای مردنـی محمد شەڕو دژایەتی کەوتە نێوان ڕابەرانی ئاییـنەوە لەسـەر وەرگرتنـی دەسـەڵات و بوون بە خەلیفە).**

بـەڵێ... ئەمـە باسـێکی ئـاڵۆزو گـران و قورسـە، چـونکە هۆیـەکانی زۆر زۆرن و لـەم نامیلەکەیەداو بەم سەرپێیەوە وەڵامێك بۆ ڕەخنەیەکی ئاوا، زۆری دەوێت، بەڵام ئێمـە بە کورتەیەك چەند هۆیەکی سیاسی دێنین کە بوونە هۆی ئەو ئـاژاوەو گێروگرفتانـە — کە بە داخەوە ئێستا کۆمەڵێکی فورصەت گیـر، کت و مت دەیخەنە ڕوو و کێشـەیەکی ئاواش وەڵامدانەوەی هەر ئاوا ئاسان نییە — دەتوانین ئەم هۆیانە کورت بکەینەوە لەم خالانەدا:

١. ئەو جوولەکانەی لە (مەدینە)دا دەرکران بەهۆی چەندیین جار خیانەتییانەوە.

٢. ئیمپراتۆرییەتی ڕۆمانییەکان... کە ئەو شـــەوکەت و دەسـەڵاتەیان لـە دەسـت داو خـۆی بە ڕیسوا دەزانی.

٣. ئیمپـراتۆرییەتی فارسەکان... کە زۆربەی بەرژەوەندییەکان لەدەستدا.

٤. لەناویشـــەوە جوولەکـــەکان درێغییـــان نـــە دەکـــرد..! هـــەر بۆیـــەش گـــەورەترین خیانەتکارییان (عەبدوڵڵای کوڕی سەبەء) لە (یەمەن)ـەوە نێررایە ناو شاری مەدینەوە بە ڕوواڵەت موسڵمان بوو، بەڵام سپاردەکەی زۆر گەورەتر بوو لەوە پێی سپێررا بـوو..

هەرچەند دەتوانێ ئیسلامەتی خۆی جوان بکات لای ئەم و ئەو، بۆ ئەوەی کاتێ هەستا بە داگیرساندنی (فەتیلە)ی شەڕەکە بڕوای پێ بکرێ، هەرچی پێ سپێررابوو بەجێی هێنا.. ئینجا کەوتە پیادەی پیلانەکەی.. جا بۆ ئەوەی بە زوویی پیلانەکەی بێتە بەرهەم.. هەستا لە (خەلیفە)وە دەستی پێ کرد، دەستی کرد بە بڵاوکردنەوەی ناشەرعییەتی خەلافەتی (عوسمان)، بەلاّم لەم ڕێگەیەوە کە بڵێت: (ان لكل نبي وصيا، وإن (عليا) وصى (الرسول)، ولقد وثب (عثمان) على أمر هذه الأمة، وأخذ الحق من صاحبه...!!).

ئێجگار ئاگرەکەی خۆش دەکرد بەهێنانەوەی هەندێ فەرمووده، وەك: ((من كنت مولاه فعلي مولاه...))[٣٥]. یان: ((اللهم وال من والاه، و عاد من عاداه))[٣٦].

هەرچەند جەنابی ئیمام عەلی کاتێ ئەو ژەهرەی دەبیست هەڕەشەی لێ دەکردو موسڵمانانی هۆشیار دەکردەوە لەگەڵ ئەوەیشدا (کوڕەکەی سەبەء)یش نەوەستا لە ئەنجامدانی نەخشەکەی... ئەوە بوو بە فەتیلەی گێرە شێوێنییەکەیەوە ساڵی (٣٢ کۆچی / ٦٥٣ زایینی)، بەرەو بەصرە، پاشان (کووفە)، ئینجا (شام)، دواتر (میصر) ڕۆیشت، لەو سەردانەیدا هەرکەسێکی بە دڵگران بزانایە پەیوەندی پێوە دەکردو دەیان و سەدان قسەی بێ بناغەو ناوەڕۆکی بۆ دەکرد دژ بە موسڵمانان و دەسەلاّتیان.. وە بەرنامەی کارەکەیشی بۆ داڕشتن بە تایبەت گرنگیدا بەم چەند خاڵەیە: (تظاهروا بالأمر بالمعروف والنهي عن المنكر، تستميلوا الناس إليكم... وابدأوا بالطعن في أمراءكم... وقولوا للناس ان (عثمان) قد أخذ الخلافة بغير الحق.... و ان (عليا) وصي رسول الله، فانهضوا وردوا الحق الى صاحبه...)..!!

(٣٥) صحيح، صححه الألباني في صحيح الجامع، برقم: ٦٥٢٣ .

(٣٦) صحيح، صححه الألباني في السلسة الصحيحة، برقم: ١٧٥٠ .

یەکەم: جل و بەرگی تـەقوا لەبـەر بکـەن و درووشمـی فـەرمان بـە چـاکەو ڕێگـری لـە خراپە هەڵ بگـرن..!!

دووەم: هـەوڵ بـدەن سـومعەی کاربەدەسـتەکان بشـکێنن و چـەند خاڵێکیـان لەسـەر کۆبکەنەوە (ڕابواردن و تەرفە و خۆشگوزەرانی و، خزمە خزمێنە...هتد).

سـێیەم: یەکـەمجار لـە سـەرەکەیەوە دەسـت پـێ بکـەن (واتـە: لـە پێشـەوا (عوسمان)ـەوە.

بـەڵێ.. حەملەکـەی دەسـت پێکـرد، شـەوو ڕۆژ لـە پەیوەنـدیکردن نـە دەوەسـتا، بەتایبەت ئەو (عەشیـرەت)انەی سەرکردەکانیان لەلایەن پێشەوا (عوسمان)ەوە لەکار خرابوون..! بەڵێ چاو و ڕاو دیعایەکانی (کوڕەکـەی سـەبەء) بـە ئـەنجام گەیشـت، لـە هەردوو ویلایەتەکاندا خەڵکێکی وورووژان دژی (عوسمان) و دەوڵەتەکەی.

ئەمە بوو هۆی سەرەکی ئەو ئاژاوەیە لەنێوان موسڵمانانـدا بەرپا کرا... موسڵمانەکان بە دڵ پاکی خۆیان و، هەتیوەکەی (سەبەء)یش بەو هەموو ڕق و کینـەوە تـوانی ڕۆژی ڕووناك بکات بە شەوە زەنـگ، توانی بەو شـێوە ئـاڵۆزی بکـات کـە هەرچـەند لەلایـەن خەمخۆرانی ئیسلامەوە هەوڵ درا، بەڵام ئاگرەکەیان بۆ نەکوژایـەوە.. تـا وای لێ هـات هەموو وڵات و جێگاو، بگرە هەموو بنەماڵەو خێزانێکی گـرتـەوە..!

پاشان سەریشی کێشا بۆ جەنگەکانی (صفين) و (جەمەل) و...هتد. کەوابوو کێشەکە وەك کەوا سوورانی بەر لەشکر دەڵێن: (لەسەر وەرگرتنی دەسـەڵات بـوو...) وابـوو... بەڵکو ئەو پیلان و فرت و فێڵە بوو کە زۆر شەیتانانە ئاگرەکەی بۆ خۆش کردن و ڕقـی هـەموو جوولەکـەو ئیمپراتۆرییـەتی (فـارس) و (ڕۆم) و هـەر خـەڵکێکی تـریش کـە بـە هاتنی ئیسلام بەرژەوەندی نەمابوو، هەمووی خسـتە سـەریەك و پـارەو ئیمکانیـاتێکی زۆری تیا خەرج کرد ئەوجا ئەو بەرهەمە ڕەشەی هێنا.....!!

ئێستایش ئێوە – ئەی نەوەکانی عەبدوڵڵای کوڕی سەبەء – دەستی باڵاتان هەیە لـە گێرە شێوێنی و هەڵگیرسانەوەی فتیلەی ئـاژاوەو جـەنگ و نـا ئاسـایی بـەرپاکردن لـە

ولاتدا... چونکه هەموو کەسێك دەزانێ کە ئێوەیش (مارکسییەت، یا شیوعییەت) بەچکەی (سایۆنیزم)ەو لە جوولەکەکانەوە سەرچاوەیان گرتووە، هەر بۆیەش لە هەر جێگایەکدا تۆزقاڵەیەك دەسەلاتتان بوو‌بێت سەدان و هەزاران مزگەوتتان ڕووخاندووەو کردووتانە بە (تەویلە)و تیاترۆخانەو جێگەی سووڕدان و سەما، جگە لە سووتاندنی ملیۆنەها قورئان و ئەشکەنجەدانی هەزاران لاوو پیری خواناس..!

ببێ و نەبێ ئەو کارە لە کاری جوولەکەکان دەچێت، چونکە تا ئێستایش زۆربەی لێپرسراوی (مارکسیزم)ەکان جوولەکەکانن، وا دەزانم بێ لێکۆڵینەوە خۆتان ئەم ڕاستییە دەسەلمێنن، بۆیە دەڵێن: (الشيوعية وليدة الصهيونية). وەك باوی خۆیان – کە دەبێ لە هەموو نووسین و وتارێکدا باسی ئافرەت بە ئالۆز بێنن و مەسەلەکە لە خوشکان چەواشە بکەن و دەستەیەکیش لەم و لەو گوێیان بۆ بگرێ – ئەوەتە دەڵێن: لە ئایەتی (٢٢٣)ی سوورەتی (البقره)دا هاتووە کە: ژن کێڵگەیەکی بەرهەم هێنانەو پیاو بە ئارەزووی خۆیەتی چۆن مامەڵەی لەگەڵ بکات: ﴿نِسَآؤُكُمۡ حَرۡثٞ لَّكُمۡ فَأۡتُواْ حَرۡثَكُمۡ أَنَّىٰ شِئۡتُمۡۖ﴾ (البقرة: ٢٢٣).

**دیسان (محمد) ژنان دەشووبهێنێ بە قوماش.!** دیارە بە پێی (مقیاس)ی ئابووری هەرشتێ کالا بێت بە ئارەزووی خاوەنەکەیەتی چۆن مامەڵەی پێ بکات، وەك لەم فەرموودەدا هاتووە: ((الدنيا متاع، وخير متاع الدنيا المرأة الصالحة))[٣٧].

ئێمەیش دەڵێین: تێڕوانینی ئیسلام بۆ ژن تێڕوانینێکی بەرزو بڵندە، وە هەرشتێك هۆناسی قەدو بالایی و جم و جووڵی بێت، وە لەگەڵ نەوعییەتی دروستبوونیدا بگونجێت، پێی بەخشراوە، وە هەر شتێکیش زیان بەخش بێت لێی یاساغ کردووە – ئیتر ئەگەر چی کۆمەڵێکی نەزانیش لە بەرژەوەندی ژیانی خۆیان بازرگانی بە ژنانەوە بکەن و بەپێچەوانەوە ڕاڤەی بکەن – ژن و پیاو کە خوای گەورە دروستی کردوون،

(٣٧) صحيح مسلم – كتاب الرضاع، باب خير متاع الدنيا المرأة الصالحة – حديث : ٢٧٤٦

هەردووكیانی لە بەهەشتدا داناون، واتە وەك یەك ڕێزی لێ گرتوون، چونكە بەهەشت جێگەی ڕێزلێنانە، وە كاتێ كردنیە دەرەوە بەیەكەوە كردنیە دەرەوە، وە وەك سەرزەنشتی كردن خستنیە ناو تاڵاوی ژیانی دونیاوەو لاپەڕەی ژیانی بۆ كردنەوە بێ جیاوازیی، وە كاری هەریەكەیانی جیاكردەوە.، وەكاتێ لە نیوە دوورگەی عەرەبییدا — بەڵكو لە جیهاندا، بیروبۆچوون و ڕای جیاواز درووستبوو بەرامبەر بە ژنان، یەكێ دەیگوت: پەرییە، یەكێ گوتی: مافی ژیانی نیە..!! یەكێ میراتی هەر نە ئەدایە — یەكێ ئەیگوت: مافی (تصرف)ی نییە لەماڵ و ساماندا..

وە بەدەیان و سەدان جۆر (قەید)و (شەرت)یان لەسەر دانابوون، كە لەم وەڵامە كورتەدا نانووسرێن، ئیسلام هات بە ماوەی بیست و سێ ساڵ ئەو هەموو بۆچوونانە هەڵدەوەشێنێتەوەو ڕێزی لێ دەنێتەوەو مــــرۆڤەكان تێ دەگەیەنێت كە خەڵكی هەمووی لە نێرو مێیەك درووستكراوە: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالٗا كَثِيرٗا وَنِسَآءٗۚ .... ﴾ (النساء: ١). ئەم ڕاستییەی لە دەیان ئایەتدا ڕوون كردەوە... كەوابوو ژنیش وەك پیاو وایە، هاوبەشی ژیانە، وە ژیان بێ هیچ كامێكیان ناڕوات، نە هەر ئەوەندە بەڵكو (نەسڵ) وەچە، كە درێژەدانە بە كاروانی ئادەمی، تەنها لە ڕێی ئافرەتەوەیە.! دەتوانم بڵێم هەندێ جار خوای گەورە دەسەڵاتی خۆی بەو خەڵكە وا سەلماندووە كە بە تەنها لە (ئافرەت)دا دەتوانێ منداڵ بێنێتە ژیانەوە، وەك خاتوو (مەریم) خوا لێی ڕازی بێت.، بێ هیچ جۆرە پەیوەندییەكی لاشەیی (عیسا)ی لێ بوو، كەوابوو ڕاستە (وليس الذكر كالأنثى ...) گەلێ شت هەیە بە ئافرەت دەكرێ بە پیاو ناكرێ... ئەوەیە ڕێزو پلەی ژنان.!! وە هەر لەو سوورەتەدا (١٢) بڕگەی بە تایبەت بۆ ئافرەت یاسا كردووە... ئایا ئەوە مانای بایەخ دان نییە بە مەسەلەی ژنان كە سەدان ئایەت سەبارەت بە یاسادانان هاتووە بۆیان..؟!!

**یەکەم**: ژنان لەگەڵ کێ هاوسەر بن..؟

**دووەم**: لەکاتی حەیزدا نابێ ئەزییەت و ئازار بدرێن، واتە: نابێ لەگەڵیاندا جووت ببن، چونکە وەك یاسای پزیشکی ئەمڕۆ ئەمەی سەلماندووە–ژن لەو کاتەدا تەندرووستی و ئەندامەکانی لاشەی تەواو نین.

**سێیەم**: سوێند خواردن بە گشتی، چ بۆ یاساغکردنی خۆی بێت کە بچێتە لای ژنەکەی یا نە.

**چوارەم**: یاسایەك کە ئەگەر پیاوێك ویستی ژنەکەی مەحروم بکات لە ژن و مێردی (الایلاء).

**پێنجەم**: ئەگەر ژن و پیاو یەك نەکەوتن و تەلاق کەوتە نێوانیانەوە ژنەکە چی بکات تا مێرد بکاتەوە..؟

**شەشەم**: چ جۆرە تەلاقێك بدرێ قازانجی ژنەکەیە..؟

**حەوتەم**: ئەگەر ئەژیین بەیەکەوە "ژن و مێرد" با بە باشی لەگەڵی ڕەفتار بکات ئەگینە بە شێوەیەکی چاك و پەسەند لەیەکتر جیا ببنەوە: ﴿...وَلَا تُمْسِكُوهُنَّ ضِرَارًا لِّتَعْتَدُوا ۚ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ فَقَدْ ظَلَمَ نَفْسَهُ ۚ... ﴾ (البقرة: ٢٣١).

**هەشتەم**: شیردان بە منداڵ و دایەن گرتن بۆی... ئایا لەسەرییەتی شیر بدات، یان دەبێت دایەنی بۆ بگیررێت..؟!

**نۆیەم**: ئەگەر مێردەکەی مرد چۆن ڕەفتاری لەگەڵ بکرێ..؟ ﴿....فَإِذَا بَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِيمَا فَعَلْنَ فِي أَنفُسِهِنَّ بِالْمَعْرُوفِ ۗ... ﴾ (البقرة: ٢٣٤).

**دەیەم**: ئەگەر لە (عیددە)دا بوو، کە بەرەچاوکردنی یاسای کۆمەلایەتی نێوان کۆمەڵگە، بە چ زمانێك بدات بە گوێیا بۆ خواستن..؟!

**یازدەهەم**: ماوەی کات، بەلام پێش ئەوە بە یەك بگەن تەلاقی بدات.. ئایا هەروا وێڵی بکات بەبێ ماف..؟!!

**دوازدەیەم**: جیاکردنەوەی هەندێ لەو ناو ماڵەی بوویانە بۆ ژنەکە، "جگە لە مافەکانی تری" کاتێ مێردەکەی مرد، وە یا تەڵاق درا (متعة)..

ئایا ئەو هەموو یاسایە مانای بایەخدان نییە بە مەسەلەی ژنان کە تەنها لەو سوورەتەدا کە ئەوان بە تێ نەگەیشتنەوە ڕەخنەیەکیان هێناوە، ئەو هەموو یاسایە باس دەکات، ئیتر با سوورەتەکانی تر بووەستێ، بەتایبەتی سوورەتی ژنان (النساء) وە سوورەتی (مەریەم) کە هەندێ شتی سەیرو سەمەرەی تیایە بۆ ژنان کە هەرگیز پیاو قابیلی ئەو تاقیکردنەوە نییە.

## با بێینەوە سەر باسەکەی خۆمان:

زۆر پێویستە – هەموو کات – لە هەڵسەنگاندن و ڕەخنەدا – بەتایبەت – پاش و پێشی ئەو جێگایە سەیر بکرێ، بۆ ئەوەی تووشی هەڵە نەبن لە ڕەخنەکەیاندا.. بۆیە ئەو برادەرانەیش بە هەڵەدا ڕۆیشتوون، جگە لەوەیش دەبێ ئەوەیش بزانرێ کە هەموو گەل و خاوەن زمانێك جۆرە لێکدانەوەو تەعبیرێکی خۆی هەیە، لە پەندی پێشینان، قسەی نەستەق، تەشبیە [٣٨] و شووبهاندن و (ضرب المثل)و (کینایە)و...هتد. ئاشکرایشە ئەوانە کراون بە هێمای خۆشخوانی و ڕەوانبێژی ئەو گەلەیە... ئەمە لەلایەکەوە، لەلایەکی ترەوە ئەو باسەی کە ئەوان ڕەخنەیان لێ هەڵبژاردووەو (تەوجییە)و ئاراستەیان دەکات، کە هەر ئاوا بێ یاسا – وەك ئاژەڵ – ئەو شتە بەکار نەهێنرێ، بەڵکو دەبێ لە کاتێکا بێت قابیلی ڕوواندن و سەوز بوون بێت، وەك تۆو دانەوێڵە یاسایەکی تایبەتی خۆی هەیە بۆ سەوز بوون، کە لەلای زانایانی کشتوکاڵ ڕوونە.. ئەوەیش لەلای (علماء الأجنة) ئاشکرایە چ کات ئەو (تۆو = نطفة)یە سەوز دەبێت. ئاشکرایە لە کاتی (حەیز)دا بە بەرهەم نایەت، وە لە جێگای تریشەوە.! کەوابوو – جگە لە کاتی حەیزو جێگای نائاسایی خۆیەوە – لە هەمووکاتداو بە هەموو جۆر تۆوەکەتان بچێنن ڕەوایەو بە بەر دێت..

---

(٣٨) قورطوبی دەڵێت: (والحرث تشبیه) لأنه مزرع الذریة.

جگە لەوەیش ئەمە بۆ ڕاستکردنەوەی لا بارێکی لاری کۆمەڵایەتی بوو: کاتێ ژن بکەوتایەتە حەیزەوە جوولەکەکان کاسەو کەوچکیان بۆ جیا دەکردەوەو تێکەڵیان نەدەکرد، وە یان دەیان وت: جووت بوون ئەگەر چی لە جێگەی سەوز کردنیشەوە بێت، هەر دەبێت لە پێشەوە بێت،! دەرئەنجام ئەو ئایەتە هات بۆ ڕاستکردنەوەی ئەو هەموو بارە هەلآنە.! کەوابوو مەسەلەکە، ئارەزوو و ڕابواردن نییە وەك ئەو نەخوێندەوارانە دەڵێن..؟!!

بەڵێ.. پەیوەندی ژن و پیاو تەنها لەم ئایەتەدا نەهاتووە، بەڵکو لە گەڵێ جێگای تردا هاتووە، هەر جێگای بە پێی شیاوو لەباری خۆی، وەك: ﴿هن لباس لكم وأنتم لباس لهن..﴾. ئەوانە — ژنان - جل و بەرگن بۆ ئێوە — ئەی پیاوان - ئێوەیش — مێردەکان - جل و بەرگن بۆ ئەوان (ژنان)... ئەگەر ئەو جۆرە لێکدانەوەیە: ﴿...فَأْتُوا۟ حَرْثَكُمْ ...﴾ (البقـــرة: ٢٢٣)... ﴿أُحِلَّ لَكُمْ لَيْلَةَ ٱلصِّيَامِ ٱلرَّفَثُ إِلَىٰ نِسَآئِكُمْ ۚ....هُنَّ لِبَاسٌ لَّكُمْ وَأَنتُمْ لِبَاسٌ لَّهُنَّ ۗ....﴾ (البقرة: ١٨٧). ئەگەر مەبەست (تەشبیبە) نەبێت، دەبێ پیاو یان ژن (جل و بەرگ) بن...؟!! کەوابوو وشەی (حرث)یش مەبەست پێی (تەشبیی)ـە.

وە دەفـــــــەرموێت: ﴿وَمِنْ ءَايَـٰتِهِۦٓ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَٰجًا لِّتَسْكُنُوٓا۟ إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً ۚ...﴾ (الروم: ٢١). بە واتای: هەر لە خۆتان هاوسەرو خێزانی بۆ بەدی هێناون بۆ ئارامبوونتان و حەوانەوەتان لە لایان، وە خۆشەویستی و سۆزی خستووەتە نێوانتانەوە، سازدانی ئەو کەش و هەوایە بەڵگەیە بۆ دۆزینەوەی خواو کاری جوانی.

لەم سوورەتی (بەقەرە)یشدا کە دەفەرموێت: ﴿نِسَآؤُكُمْ حَرْثٌ لَّكُمْ ...﴾ (البقرة: ٢٢٣. (باس باسی منالّ بوون و زاوزێیە، کەواتە ژنان وەك کێڵگە وانە، هەرچۆنێ زەویی و کێڵگە تۆو سەوز دەکات، ژنان جێگەی وە بەرهێنانی منداڵە، وە هۆشیار بن بزانن کە ئەو زەوییە چ کات لە بارو کەشییەتی بۆ چاندنی تۆوەکە..

فەرموودەکەیش بەم دەستە واژانە هاتووە: ((الدنیا متاع وخیر متاعها المرأة الصالحة)) مەبەست هەڵنانی لاوەکانە بۆ ژنهێنان و شیرینکردنی ژنانە لایان، بۆ ئەوەی هەوڵ بدەن بێ ژن نەمێننەوە تا تووشی فەسادو جموجووڵی ناشەرعی نەبن، وە دیسانەوە مەبەست (تەشبییە). واتە: زیاتر جوانکردنی ژنانەو پێویست بوونە پێیان، وەك پێویستی مرۆڤ بە جلوبەرگ و کالاَ — نەك خوا نەخواستە — وەك ئەوان دەیڵێن: وەك کاڵایەکی سووکی بازاڕە، چۆن دەیکڕیی و چۆنی لەبەر دەکەیت..!!

لە جێگایەکی تری فیشاڵەکانی بەناو "سامان نوری"دا ئایەتی (٣١)ی سوورەتی (النور)ی هێناوە گوایە خوای گەورە دەفەرموێت: (ئەی پێغەمبەر بە ژنانی موسوڵمان بڵێ با چاوی خۆیان دانەوێنن لە تەماشاکردنی ئەو پیاوانەی نامەحرەمن..، هەروەها با کەش و دامێنی خۆیان بپارێزن لە خراپەکاری..).! بەڵام ئەوان ژن وەك ئاژەڵێکی مێیینە سەیر دەکەن و هەرکات هێزی (جنس)ییان بەرزەوە بوو، دەست بەجێ بێ سنوور بێ شەرم، لە سەر جادەو شەقام و شوێنە گشتییەکان و هەر جێگایەکی تردا ژەهرەکەیان بڕێژن، ئەگەر چی لەسەر مێزو (ڕەحلە)ی قوتابخانەکانیشدا بێ، نابێ نە مامۆستا، نە باوك و دایك، نە براو، نە کەسوکار، هیچ ڕەخنەیەك بگرن، بەڵکو دەبێ ماندوو نەبوونیان لێ بکەن... ئەگینە ئەوەی ئیسلام دایناوە زۆر گونجاوە بۆ ڕێزلێنانی ئافرەت و پەرژینە بۆی، چونکە ئافرەت تەنها بۆ ڕابواردن نییە، وەك ئەوان پێیان وایە، بەڵکو غایەی بناغەییە بۆ زیاد بوون و گەشەکردنی (نەسل)و نەوەی ئادەمیزادەو درووستبوونی خزم و کەسوکارو براو خوشکە.. هەرچەند ئەو (مارکسیزمانە) خزم و کەس و کارییان ناوێت..!!

دەی لەو حاڵەتە بێ سنوورەدا جگە لەوەی ئافرەتەکە بەرگەی ئەو وەزعە ناگرێ و بگرە نێرەکان گەلێ جار لەسەر ئەوەی کامیان لەپێشەوە کار بکات بەر ئەبنە یەکتر!! جگە لەمانەیش خزم و کەس و کار نامێنێ و نازانرێ ئەو نەوەیە لەکێ

بووە.؟! ئەگینە هەمان بڕیار بەسـەر پیاوانیشـدا دەدات: ﴿قـل للمـؤمنین یغضـوا مـن أبصارهم...﴾ بۆچی ئەو شین و وا وەیلایە بۆ پیاوانیش ناكەن..؟!!

ڕەخنە لە ئایەتی (٦٠)ی سوورەتی (النور) دەگرن، كە گوایە ژن تەنها بۆ ڕابواردنی پیاو درووست كراوە، بۆیە دەڵێت: (ئەو ژنانەی لە سك چوونەتەوەو عوزر ناشـۆرن و ئومێـدی مێردكردنتـان نـەماوەو لـە خـۆ گەڕاونەتـەوە گوناحیـان ناگـات ئەگـەر چارۆكەكانیان دابكەن و فڕێ بدەن.!

زۆر سەیرو سەمەرەیە، وە تووشی نەخۆشییەكی گەورەی دەروونی بوون ئـەو بەچـكە (ماركسییانە)، چونكە ئیسلام دەیەوێ ڕێزو كەرامەتی ژنان پارێزراو بێت، هەموو كـات لە دەرگای شەرەفیان نەدرێت و ئارەزووی گڵاوی خۆیان تێر نەكەن لەسەریان، (حد)و سـنوورێك دادەنێـت و پـەرژینێكیان بـۆ دەكـات..! هـەر هـیچ نـەبێت بـە ئەنـدازەی مەنزڵێكی سادە ڕێزیان بۆ دابنرێت كە بێ لە دەرگادان هیچ كـەس نەڕواتـە ژوورەوە.! بۆیە لەپێشەوە داوا دەكات دەست درێژی مەكەنە سـەریان بـەهیچ جـۆر، تەنانـەت بـە ڕووانینێكیش، تا دەبێتە هاوسەری خۆت، ئەو كاتەیش (ضبط)و یاسایەك هەیە بـۆ ژن و مێردی، دەبێ نە پیاوەكـە زیـادە ڕەوی بكـات، نـە ژنەكـەیش سەرپێچـی بكـات لـەو یاسایە.

جـا كاتێـك بـە ژنـانی گـەنج و لاو دەڵێـت: (عـەبا) دامـەنێن و جێگـەی (زینـەت)تـان دەرمەخەن، نەوەك مرۆڤە بێ حورمەتـەكان وەزەنتـان بـۆ بكـەن.! دیـارە ئـەو جـۆرە ژنانەی ئایەتی (٦٠)ی سوورەی (نوور) بە دەگمەن ڕێ بكەوێت مرۆڤی بێ حورمەتیش تەمەحیان تێ بكەن، چ جای مرۆڤە وێڵەكان، كەوابوو دەتوانن باروحاڵـەتی پێشـوویان بگۆڕن بۆ ئەم حاڵەتی دووەمـە، خـۆ ئەگـەر وەك خۆیشـیان بمێننـەوە، هێشـتای هـەر ئەوەیان چاكە.

ئەمـە ئێمـە بـە خزمـەتێكی زۆر گـەورەی دادەنـێین بـۆ خوشـكان، نامانـەوێ هـەموو سرووشـت (مـەیموون)ێـك یارییـان لەگـەڵ بكـات و ئـارەزووی (جـنس)ی تێـر بكـەن

لەسەریان و وێڵیان بکەن، لەولایشەوە تەکلیفی بەپێی توانایە، وە هەتا کاتێ کە ئەو (علەت) و (سبب)ـە بمێنێ، ئەو یاسایە لە بەرامبەرییانەوە دانراوە، واتە: تەکلیفی گەنج و لاو و پیر وەك یەك نییە! ئەمەیە بۆچوونی ئێمەی ئیسلامی لەبارەی خوشکانەوە... بەڵام ئەوانەی کە هەر بە ژنانەوە گرتوویانەو ئارەزوو پەرستن، دیارە ئیعتراف بە خاوەنێتی و (اختصاصات) ناکەن، بەڵکو هەرچی شتە بەلایانەوە دەبێ (مشاع) بێت...!!! بۆیە قەت ڕازی نابن هیچ کات دەست بەڕوویانەوە بنرێت..!!

*** بوختانێکی تریان – کە بێ شەرمانەو بێ هیچ گوێدانێك بەوەی بە درۆ بخرێنەوە – دەڵێن: (ژنان لە چوارچێوەی ملکەچ بوونیان بۆ ئایین مافیان پێشێل کراوەو ڕێگای تێکەڵ بوونیان بە کۆمەڵگەیش لێ گیراوەو ڕەوانەی چوار دیواری ماڵەوەیان کردوون...).**

خۆزگە دەمانزانی لە کام ئایەت، وە یا لە کام فەرموودەدا ئەو بڕیارەیان وەرگرتووە..؟! بڵێی لە ئایەتی: ﴿ وَقَرْنَ فِي بُيُوتِكُنَّ وَلَا تَبَرَّجْنَ تَبَرُّجَ ٱلْجَٰهِلِيَّةِ ٱلْأُولَىٰ ... ﴾ (الأحزاب: ٣٣). وە وەریان گرتبێت..؟!! ئەگەر ئەوە بێت ئەوە زۆر زۆر هەڵەن و بەکوێرانە ئەو شتانە دەنووسن، چونکە:

**یەکەم:** ئەو (تەوجیە)و ئاراستەی ژنانی حەزرەتە ﷺ: ﴿یا نساء النبي لستن كأحد من النساء إن اتقيتن..﴾. واتە: ڕووی قسەی لەوانەو بەوان دەڵێت: لەماڵەوە سەقامگیر بن و ڕێزی خۆتان ڕاگرن، چونکە ئێوە خێزانی ئەو ڕابەرەن کە ژنانی تر وانەو دەرس لە ئێوەوە وەردەگرن و چاو لە ئێوە دەبڕن.، وە هەمووکات (ئوسرە)و بنەماڵەی (ڕابەران) دەبێ چاکتر ئەو بەرنامەیە بەسەر خۆیاندا پیادە بکەن، کاتێ باسی دەست کێشانەوە لە (تەرەف)و زیادە ڕەوی ناو چوونە دونیاوە دەکرێ، کاتێ باسی حەڵاڵ، وە یا حەرام دەکرێ، کاتێ باسی یاسای خێزان دەکرێ.

**بە کورتە:** هەر یاسایەك دابنرێ دەبێ لە پێشەوە بنەماڵەی (ڕابەر) پیادەی بکات، لەولایشەوە – جگە لەوەیش – دەبێ ئەو بنەماڵانە زیاتر لە خەڵکەکەی تر کۆڵ هەڵگرن، ئەمەیش یەکێکە لەو جۆرە بڕیارە تایبەتییانە بەو بنەماڵە بەڕێزە.. بۆ

ئەوەیشە ژنانی تریش شەرم بکەن لە خۆیـان، کـاتێ ژنـانی ئـەو ڕابـەرە دەبـێ وا بـن، زیاترو باشتــر دەبێ ژنانی تریش وابن.. ئەمە لەلایەکەوە لەلایەکی تریشەوە مەبەست ئەوەیە پێیـان بفـەرمووێت: جێگـەی شـیاو و لایـەق بـە ژنـان ئەوەیـە لـە ماڵـەوە بـن، چاودێری ئیش و کارەکانی ئەوێ بکەن و دەرنەچن بۆ کرێکاری و پاچـەکۆڵەو درووێنـە، وە یا لە دەزگایەك کارمەند بێت یا بێت هـەر بـەیانی هـەتا نیـوەڕۆ خزمـەت بکـات لەبـەردەم دەرگایـەك، وە یـان ئەگـەر سـەرۆك کۆمـارێکیش بێـت.! ئـەوە شـایەنی ئـەو نییـە.. ئاشکرایشە ڕزق و ڕۆزیی و نەفەقەی لەسەر مێردو کەس و کاری نزیکییەتی، دەبێ بـێ منەت جلوبەرگ و خواردن و پێداویستییەکانی ژیانی بۆ ئامادەبکرێ بێ هـیچ ئەزییـەت و ئازارێك (بێ ئەوەی لەماڵەوە بڕواتە دەرەوە) مەگەر خۆیان لەگەڵ پیاوەکـە، بـەپێی باوو نەریتی ئەو جێگایە کارەکانیان دابەش بکەن و هاوکاری یەکتــر بکـەن.. ئـەوەش بەو مەرجە کارە سەرەکییەکەی خۆی لە کیس نەدات، چۆن ڕێك دەکەون پیـرۆزە...

دیسانەوە ئەو بڕیارە ﴿وَقَرْنَ..﴾ ئەوە ناگەیـەنێت کـە هـەموو کـات حـەرام و یاسـاغە لەماڵ بچنە دەرێ...!! بەڵکو ئەوە دەگەیەنێ کە ژنانی بە عیـززەت و بەشـەرەف تـا زۆر پێویست نەکات لەماڵ نەڕۆنە دەرەوە — وەك ئێستـەی کۆمەڵگـەی هەڵوەشـاوەی ئــەم ســەدەیە نــەبن و شــەوو ڕۆژ بازاڕەکانیــان داپۆشـیوە — دێـــــــن و دەڕۆن و قەرەباڵغییان خستووەتە جادەو کۆڵان و بازاڕەکانەوە...!!

ئافرەتی دامەزراوو زیرەك و بە ئەمەك ئەوەیە تا زۆر پێویسـت نـەکات لـەماڵ نەچـێتە دەرێ، جـا ئەگـەر پێویسـت بـوو چـوونە دەرەوەی، بـا زۆر بـە عیـززەت و پۆشـاکی ئیسلامییانەوە بڕوات، نەك بە (تبــرج) و قاچ و قـۆڵ و سـەرو سـنگ و لاقـی ڕووتـەوە، ئەمەیە ئەو (برادەرانە) بـە سـەرەوخوار وەریـان گرتـووە.! ئەگینـە ژنـانی پێغەمبـەرو هاوەڵانیی و خوارتریش لەوان ئامادەی (جمعە)و (جەماعەت) بوونـە، تەنانـەت بـەیانی زوویش ڕۆیشتوون بۆ نوێـژی جەماعـەت: ((قالـت عائشـة (رضـي الله عنهـا) : لقـد كـان

نساء من المؤمنات يشهدن الفجر مع رسول الله ﷺ متلفعات بمروطهن، ثم ينقلبن إلى بيوتهن، وما يعرفن من تغليس رسول الله ﷺ بالصلاة))[٣٩].

واتە: ژنانی موسڵمانەكان دەڕۆیشتنە نوێژی بەیانیی و زوویش — پاش نوێژەكە — دەگەڕانەوەو خۆیان دەپێچایەوە، كاتێ دەگەڕانەوە هێشتا ئەوەندە تاریك بوو نەدەناسران. وە ئامادەی جێگەی وانەی تایبەتی بەخۆیانەوە بوون، پێغەمبەر ﷺ ئامۆژگاریی و وانەی تایبەتی بۆ دانابوون و هەموو ژنان دەهاتن و، هیچ كەسیش نەیدەوت مەڕۆن بۆ وەرگرتنی زانست و زانیاری.. تەنانەت لە جەنگە سەپێنراوەكانیشدا ژنان بەپێی (اختصاص)و لێهاتوویی خۆیان بەشدارییان دەكرد.. بۆ نموونە قارەمانییەتی خاتوو (نوسەیبە)تان بیستووە كە لە جەنگی (ئوحود)دا كاتێ لەشكری موسڵمانەكان تێك شكا، ئەو بەڕێزە چۆن پشتی پێغەمبەری چۆڵ نەكردو بە قارەمانانە جەنگی دەكرد..؟!

وە یا داستانەكەی (ئوم عیمارە) كە خۆی دەیگێڕێتەوەو دەڵێت: ئەو پیاوەی كوڕەكەمی كوشت دەركەوت، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەوەبوو كوڕەكەتی كوشت..! دەڵێت: منیش ڕێم پێ گرت و تیرێكم دا لەلاقیی و بەچۆكا ڕۆیشت، دەبینم پێغەمبەری خوا ﷺ زۆری پێ خۆشەو پێ دەكەنێت و فەرمووی: (ئوم عیمارە) هەقی خۆتت سەند.!

ئەگەر حەرامە ژنان لە ماڵ بچنە دەرێ، ئەی ئەو بەشداری ژنانە چی دەبەخشێت لە جەنگەكاندا جەنگیان كردووە، برین پێچییان كردووە و نان و ئاویان ئامادە كردووە بۆ جەنگاوەرەكان، گەلێ جار هانی كوڕەكانی خۆیانیان داوە بۆ جوامێریی و كاری قارەمانانەو...هتد. خاتوو (زەینەب) خوشكی ئیمام حوسەین و، خاتوو (عائیشە) چونكە پێویست بوو فەرماندەی ئەو جەنگانەیان كرد.! لەمەوەیە كە زاناكانمان

(٣٩) صحيح مسلم – كتاب المساجد ومواضع الصلاة، باب استحباب التبكير بالصبح في أول وقتها – حديث : ١٠٥٥ .

دەڵێن: کەوابوو ئەگەر پێویست بوو دەبێ ژنانیش چەك هەڵگرن و بڕۆنە ناو کابینەی (سیاسەت)ـەوە.

من نامەوێ مەسەلەی ئافرەت هەموو کون و قوژبنێکی باس بکەم چونکە باسەکەمان درێژ دەبێتەوەو وایش دەزانم مرۆڤە نەخۆشەکان (هەنگوین) لە دەمیاندا تاڵە.

*** لە بڕگەیەکی تردا دەڵێت: (پیاویش بەپێی قورئان سەرپشك کرا کە بە ئارەزووی خۆی لە ژن بدات....).**

هەموو دەزانین کە هیچ دەزگاو پیشەسازییەك بەبێ لێپرسراو، ئیش و کاری بەڕێوە ناڕوات، لەولایشەوە دەبێ چ کەسێك زۆر لێهاتوو و شیاو بێت ئەوە بکرێ بە بەرپرس... ئەمە بۆ هەر دەزگایەك... ئایا چ دەزگایەك بە ئەندازەی ئوسرەو خێزان گرنگە...؟! گریمان ئەگەر وەك دەزگایەکیش سەیر بکرێ، کەوابوو لەناو ئەو خێزانەدا هەر دەبێت یەکێك بەرپرس بێت (ژنەکە، یا پیاوەکە)، ئینجا دەگەڕێین بزانین کامیان شیاوترە ئەوەیان هەڵدەبژێرین و دەیکەین بە بەرپرس، یاسای ژیانیش وایە کە پێك بێت لە نێرو مێ بۆ درێژە پێدانی ژیان لەسەر زەوییدا، وەك بە گشتی یاسای بوونەوەر وایە: ﴿ومن كل شي خلقنا زوجين..﴾ کاری ئافرەتیش منداڵ بوون و شیرپێدان و دەستەبەرکردنی ئەو بەرهەمەیە لەنێوان جووتبوونی ژن و پیاودا دێتە بەر.. بەپێی سرووشتیش هەر دەبێ وابێ، چونکە ژن چاکتر شارەزایە بۆ پەروەردەو ئامادەکردن بەپێی سرووشتی خۆیی و دەروونی، ژیریی و بۆچوونێك لە دەماخیدایە وە سۆزو میهرەبانی زیاترە بۆ بەخێوکردن، کەوابوو دەبێ ئەو کارەی تری بەسەرا نەدرێت، خوا هەڵناگرێ کارەکەیشی پیرۆزترینی هەموو کارێکە: (الأم مدرسة اذا أعددتها أعددت جيلا طيب الأعراق).

ئینجا پیاویش کاری خۆی بۆ ئامادە کراوە، ئەویش پەیداکردنی ڕزق و ڕۆزیی و نان پەیداکردن و ئیش و کاری دەرەوەی ماڵە، دەبێ وایش بێت، چونکە ناکرێ ژن مەسەلەی منداڵ و پێگەیاندن و بەخێوکردنی لەسەر بێت، لەولایشەوە کرێکاری بکات

و شـەونخوونی بکێشـێت بـۆ پاراسـتنی خـۆیی و منداڵـەکانی...!! وە نایشـبێت بـێ سەرپەرست بن، بۆیە پیاوەکە کرایە سەرپەرست، واتە: بە ڕەنجبـەرو زەحمـەتکێش و نان پەیداکەر بۆیان، لەسەرماو گـەرما بیـان پـارێزێ، خـانوو و پێداویسـتییەکانیان بـۆ ئەنجام بدات.. ئەمەیە مانای (قەوامە)ش کە لە ئایەتەکـەدا هـاتووە: ﴿ ٱلرِّجَالُ قَوَّٰمُونَ عَلَى ٱلنِّسَآءِ ... ﴾ (النساء: ٣٤) نەك کوێخایی و بە ئارەزووی خـۆی چـی ئـەکا بیکـا، چـۆنی پێ خۆش بوو وا ڕەفتار بکات، نەخێر تەنانـەت ئەگـەر ژنەکـە نەفەقـەی نـەبوو، واتـە: پیاوەکەی نەیتوانی نانی بۆ پەیدا بکات ژنەکە لە دادگاوە دەتوانێ تەلاّقی لێ وەرگرێ.

جگە لەوەیش لەبەر ئەوەی کە ژن (حـەیز و منـاڵبوونی هەیـەو مـاوەی چـەند مانگێـك حامیلە دەبێ، هەڵبەتە یەك دوو مانگیش حاڵەتی تەندرووسـتی تێـك دەچـێ).. ئەگـەر (قەوامە) لەسەر ژن بووایە لەو بارە نائاساییانەیدا هەموو کارەکان دەوەستان یـان بـە ئاسانی بەڕێوە نەدەچوون.. ئەگـەر بڵـێین: ئێسـتا (وەزیفـە)و کـاری دەوڵـەتی هەیـە، کەوابوو کارەکەی دەڕوات، چونکە مانگانەی هەیە...!! ئایـا تـەواوی ژنـان دەگـونجێ مووچە خۆر بن...؟! بێ گومان ناگونجێ جـا کـە وابـوو ﴿ ٱلرِّجَالُ قَوَّٰمُونَ عَلَى ٱلنِّسَآءِ ... ﴾ (النساء: ٣٤) ڕاست و درووستە، وە بە حیساب و لێکدانەوەیەکی زۆر ورد کراوە.

وا ئەزانم ئەگەر (شەمشە کوێرەکانیش) خۆر نەبینن خۆر هەر دیـارەو یاسـای خێـزان شتێکی سادەو بێ بایەخ نییە، بەڵکو قورئان زۆر بە قاییم و مەحکەم گرتوویەتی بۆیە:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا ... وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالٗا كَثِيرٗا وَنِسَآءٗۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا ﴾ (النساء:١) ﴿ وَمِنۡ ءَايَٰتِهِۦٓ أَنۡ خَلَقَ لَكُم مِّنۡ أَنفُسِكُمۡ أَزۡوَٰجٗا لِّتَسۡكُنُوٓاْ إِلَيۡهَا وَجَعَلَ بَيۡنَكُم مَّوَدَّةٗ وَرَحۡمَةًۚ .. ﴾ (الروم: ٢١) ﴿ ...هُنَّ لِبَاسٞ لَّكُمۡ وَأَنتُمۡ لِبَاسٞ لَّهُنَّۗ .. ﴾ (البقرة: ١٨٧) ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ قُوٓاْ أَنفُسَكُمۡ وَأَهۡلِيكُمۡ ... ﴾ (التحريم: ٦).

ئەم چەند ئایەتەو چەندان ئایەتی تر، بۆ ڕێزو حورمەتی ژن و پیاوە بـێ جیـاوازی... خێزان زۆر گرنگەو خشتی بناغـەی کۆمەڵگەیـە، بۆیـە قورئـانی پیـــرۆز لـە سـوورەتی

(البقرة) و (النـور)و (الأحـزاب)و (الطـلاق)و (التحـريم)دا بەشـێکی گرنگـی باسـکردووە، کەوابوو چۆن دەبێ ئەو دەزگا گرنگە بێ سەرپەرشت بێـت...؟! لەولایشـەوە زانایـانی ئـابووری دەڵـێن: کـێ نـان پەیـدا بکـات، دەبـێ ئـەویش خـەرجی بکـات، ئەگینـە بـە هەڵەخەرجی لەناو دەچێت، هەزار ڕەحمەت لە کوردەی خۆیشمان کە دەڵێـت: (ئەگـەر ڕۆن دەکڕی لە پیاوی بکڕە، ئەگەر گەنمیش دەکڕی لە ژنی بکڕە..)..!!

جا ئەگەر نیشانەی ڕووخاندنی ئەو خێزانەیە بە دەرکەوت، ئـەوە بـۆ لەنگـەرگرتنی و نەڕووخانی چەند پرۆسـەیەکی دانـاوە، یـەك لـە دوای یـەك تـا بەشـکوو تێـك نەچـێت، ئەوەیە کە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿...وَٱلَّٰتِي تَخَافُونَ نُشُوزَهُنَّ ...﴾ (النساء: ٣٤).

ئەمە جەنگێك نییە لە نێـوان ژن و پیـاودا دەرەنجامەکـەی سـەرپانکردنەوەی ژنەکـە بێت، وەك ئەو بێ ئابڕووویانە پێیان وایە..!! نـەخێر... ئـەوە نییـە بـەڵکو چـارەیەکی (وقائی)ییەو خۆپاراستنە لەوەی کە ئەو خێزانە بڕووخێ.. بۆیە:

**یەکەم**: (فعظوهن) واتە: ئامۆژگارییان بکەن و بە خوا بیـان ترسـێنن، گرنگـی ژن و مێردییان وە بیـربێننەوەو بەزەییان بەمناڵەکانیانـدا بێتـەوە، ئەگـەر مناڵیـان هـەبوو، بەڵام هەندێ جار پەندو ئامۆژگاری سوودی نابێت، چونکە ئافرەتی وا هەیە بە جـەماڵ و جوانیا دەنازێ، هی وا هەیە بە سامانەکەیا، یا بە گەواهی نامەکەیا، یا بـە بنەماڵـەو ڕشتەیا.، **دووەم**: ئینجا چارەیەکی تـر دادەنێـت: ﴿...وَٱهۡجُرُوهُنَّ فِي ٱلۡمَضَاجِعِ...﴾ (النساء: ٣٤) جێ خەوییان لێ جیابکەنەوە..

جـا ئەگـەر بـەوە چـاکبوو وە خێزانەکـە چـووەوە سـەر ژیـانی ئاسـایی خـۆی، ئـەوە مەبەستەکە پێك هاتووە.، وە دەبێ ئـەوەش بـزانین مەبەسـت لـە ﴿...وَٱهۡجُرُوهُنَّ فِي ٱلۡمَضَاجِعِ...﴾ تەنها پشت تێ کردنییەتی لە جێگـەی خـەودا، ئیتـــر جگـە لـەوە نـابێ زیاتر لە سێ ڕۆژ دەنگی لێ وەرگرێ و قسەی لەگەڵ نـەکات، تەنانـەت ئـەبێ تـەنها لـە

ژووری خەودا بێ، وە نابێ لە پێش چاو ئەم و ئەودا قسەی لەگەڵ نەکا هەتا لە پێش چاو مناڵەکانیشیدا بۆ ئەوەی شەخصییەتی نەشکێ و هەستی بریندار نەبێت.

ئەگەر ئەوەیش کەڵکی نەبوو پلەی **سێیەم**: (واضربوهن...) لێیان بدەن دێتە پێشەوە. ئینجا ئەگەر زۆر بە وردی سەیری ئامانجی ئەم پرۆسەیە (فعظوهن ... واهجروهن.... واضربوهن) بکرێ – کە لە پێشەوە باسمانکرد – هەرگیزاو بیر لەوە ناکرێتەوە کە ئەو لێدانە، لێدانی تۆڵەو سزادان بێت، یان سووکایەتی بە کەرامەتی ئەو ژنە، نەخێر.. بەڵکو تەنها مەبەست (تأديب)و سەرزەنشت کردنەو پەرژینێکە بۆ ڕاگرتنی ئەو خێزانە، هەوڵێکە بۆ مانەوەی ئەو پەیوەندییە (پەیوەندی ژن و مێردی)، وایش دەزانم ئەگەر ئەو خێزانە بەوە لەنگەر بگیرێ و بمێنێتەوە هیچ نەنگی تیا نییە.

دکتۆر (اليكسيس كاريل) – هەرچەند ئێمە بە تەواوی قسەکەی وەرناگرین – دەڵێت: (گەلێ ژن هەیە پێی وایە ئەو مێردەی بەرامبەر ئەو نییەو دەرەقەتی نایەت، ئەوە بسەلمێنێ ئەو لێدانە دەکرێ...!!

بەڵێ ئەم لێدانە – کە بۆ ناچاری ڕەوا کراوە – هەڕەمەکیی نییە، پیاوێکی دڵڕەقی بێ بەزەیی و سەرسەختی کەللە ڕەق هەستێ خۆی تاقی بکاتەوە لەسەر ژنەکەی، نابێ شتی وا.، بۆیە پێغەمبەر ﷺ پاش ئەوەی لێیان پرسی مافی ژن چیە بەسەر مێردەکەیەوە..؟! بە زمانە شیرینەکەی فەرمووی: ((..أن تطعمها اذا طعمت وتكسوها اذا اكتسيت، ولاتضرب الوجه، ولاتقبح، ولاتهجر الا في البيت..))[٤٠].

واتە: کاتێ خواردنت خوارد بەویش بدەیت، جل و بەرگت کرد بۆ ئەویشی بکەی، لە دەم و چاوی نەدەیت، قسەی ناشیرینی پێ نەڵێیت، لە چۆڵیدا نەبێت دەنگی لێ وەرنەگری، واتە: لەپێش چاوی ئەم و ئەو سووک و ناشیرینی مەکە.

(٤٠) سنن أبي داود – كتاب النكاح، باب في حق المرأة على زوجها – حديث : ١٨٤٣. وقال الألباني حديث حسن صحيح، رقم: ٢١٤٢.

وە لە فـەرموودەی راسـتی ئیمـامی موسـلیم دا هـاتووە: پێغەمبـەر ﷺ فەرموویـەتی: (إلامَ يَجلدُ أحدُكم امرأتَه؟ في روايةِ أبي بكرٍ: جلدَ الأمةِ " وفي روايـة أبـي كريـب " جلدَ العبدِ، ولعله يُضاجعُها من آخرِ يومِه)[٤١]. مەبەست ئەوەیە کە لە ژنەکانتان مەدەن وەك لە بەندەکانتان دەدەن، سەر لەبەیانی لێی بدەیت و، کەچی بۆ کۆتایی شـەو لەگەڵیـدا بخەوی. ! !).

وە ئەمەش فەرموودەی ئـەوە ﷺ دەفـەرموێت: ((خيركم خيركم لأهلـه، وأنـا خيركم لأهلي))[٤٢]. کێ لە ئێوە چاکتـر بێ بۆ هاوسەرەکەی ئـەوە چاکتــرینتانە، وە مـن لـە هەمووتان چاکتــرم بۆ خێزانم.

دیـارە ئـەم هـەموو ئـاگر بـڕە بـۆ ئەوەیـە کـە جـەنگ و هـەرا ئاشـکرا نـەبووبێت لـە نێوانیاندا، خۆ ئەگەر جەنگ و ئاژاوە دەستی پێ کردبوو، ئەوە دەبێت چارەیەکی تری بۆ دابنرێ: ﴿ وَإِنْ خِفْتُمْ شِقَاقَ بَيْنِهِمَا فَابْعَثُوا حَكَمًا مِّنْ أَهْلِهِ وَحَكَمًا مِّنْ أَهْلِهَا .... ﴾ (النساء: ٣٥) ئەویش ئەوەیە کە ئیتـر هیچ ئومێدێك نەما بۆ بەیەکەوە ژیانیان دەبێ (حەکەم)ێك لە خزمی هەردوو بنێرن بۆ چاودێرییان و دیاریکردنی تاوانبارییان، جا ئەگەر دەرکەوت کێ تاوانبارە، وە یا زانییان ژیانیان بە یەکەوە ناگونجێ، ئەوە بڕیاری جیابوونـەوەیان دەدەن ئەگەر چی ڕازیش نەبن، چونکە گەیشتوونەتە بن بەست..

بەڵێ ئەمە بوو مانـای کوێخـایی و لێـدانی ژنـان — وەك ئەوانـە دەیـان گـوت..؟! ! — دەی ئایا هەر ئاوا مێرد بۆی هەیە بەر ببێتە هاوسـەرەکەی بـێ ئـەوەی هـیچ یاسـایەك پێش چاو بگیردرێ..؟! !

ئومێدەوارم بە دڵێکـی پـڕ لـە سـۆزەوە سـەیری مەسـەلەکان بکرێ، نـەك بـە چـاوی دوژمنایەتییەوە لێك بدرێتەوە..!

(٤١) الراوي: عبدالله بن زمعة– المحدث:مسلم– المصدر:صحيح مسلم– الجزء أو الصفحة:٢٨٥٥ حكم المحدث:صحيح.

(٤٢) سنن الترمذي الجامع الصحيح – الذبائح، أبواب المناقب عن رسول الله – باب في فضل أزواج النبـي، حديث : ٣٩١٢/ وصححه الألباني في مشكاة المصابيح برقم: ٣٢٥٢

*** هەر لەباسی ژنان و بەرگری لە ژناندا...! دەڵێن: (بەپێی ئایین بە هیچ شێوەیەك ڕەوا نییە پرس بە ئافرەت بکرێ وەك (ئەبووبەکر) لە زمانی (محمد) گوێی لێ بووە کە گوتوویەتی: ((لن يفلح قوم ولوا أمرهم إمرأة)) [٤٣]. واتە: (هیچ قەومێك ڕزگاری نابێت ئەگەر پرس بەئافرەت بکەن). - بەداخەوە- چونکە دڵیان پڕە لە (حقد) بەرامبەر بە ئیسلام و موسوڵمانان، نە چاویان دەبینێ و نە دڵیان هەق وەردەگرێ و نە گوێیان دەبیستێت،- بۆیە هەر ئاوایش بە هەڵەو پەڵە فەرموودەکەیان هێناوە - چونکە ڕاوییەکەی (ئەبووبەکر) نییە - بەڵکو (ئەبووبەکرە)یە- شایانی باسە ئەو ئەبووبەکرەیە غەیری پێشەوا ئەبووبەکرە، ئەگەر پێیان وابێت ئەوە.! سەبارەت بەماناکەشی ئەوە نییە ئەوان نووسیویانە بەڵکو ماناکەی بەم جۆرەیە: هیچ نەتەوەیەك سەرکەوتوو نابێت کە کاروباری خۆیان (کاروباری سیاسی) بسپێرن بە ژنێك، واتە: بیکەنە سەرۆکی دەوڵەتیان.!**

ئەمە لەم ڕووەوە، ئینجا بۆ ئەم مەسەلەیش پێم خۆشە بەڕاشکاوی بڵێم ئەوانەی شین بۆ ژنان دەکەن، گوایە لە ئیسلامدا مافیان خوراوە، لەبەر ئەوەی ژنان خاوەنی حەیزن - زۆربەیان لە مانگێکدا پازدە ڕۆژ - هەروەك وا دروست بووە - وەك هەموو مێیەك - هەڵگری ماوەی منداڵ بوونەو ((في قرار مكين..)) منداڵدانی ئەوە، ئەو ماوەیەش (نۆ) مانگ بە زك هەڵیدەگرێ و پاشان کە منداڵی دەبێ نزیکەی مانگێك پێوەی سەرقاڵ دەبێت، ئەم دە مانگە ژنان سەرقاڵبوونی منداڵ بوونن، گومانیش نییە کە لەو ماوەیەدا تەندروستی تەواو نییەو کەڵکی ئەوەی پێوە نیە (ڕابەر)ـی وڵات بکات کەوابوو بەناچاری دەبێت بە مۆڵەت بۆی تەواو بکرێ، وە یان دەبێت بە (وەسائیل)ی پزیشکی ئەمڕۆ لە کارە سەرەکییەکانی خۆی بکەیت.! (پەرەپێدان و زیادکردنی نەوعی ئینسان..) کە لە ڕاستیدا لەوکاتەدا (اختصاصات)ی خۆی لەکیس داوە، لەکاتێکدا بەپیاویش ئەوکارە دەکرێت! ئەمەیە زانایان قسەی جیاوازیان هەیە تەنانەت لەوەدا

---

(٤٣) صحيح البخاري – كتاب المغازي، باب كتاب النبي "صلى الله عليه وسلم" إلى كسرى وقيصر – حديث : ٤١٧٢ .

بکرێ بە (قـازی)..! چـونکە لەیاسـای قەزاوەتـدا دەبـێ لـە زۆر گـەرماو سـەرمادا، وە لەکاتی برسییەتی و تینوویەتیدا، وە لەکاتی نەخۆشی و بـێ تەندروسـتیدا (قـەزاوەت) نەکات.. ژنیش بەپێی سروشتی ئادەمییەتی - کە ئـەوە هـیچ عـەیب نییـە بـۆی - لـەو شتانەدا زۆر دەبیــنــرێتەوە.

کەوابوو -بەڕای خۆم- وا چـاکە لەبـەر ئـەو راسـتییانەی باسـم کـردن تـا پیـاوی شـیاو دەسـت بکـەوێت ژنـان (قــەزاوەت)و (ڕئاســەت)یـان نــەدرێتێ.! هەرچـەندە غەربـە دڕندەکانیش پێیان ناخۆش بێت.!

پاشان پێم باشە بگەڕێینەوە سەر فەرموودەکەی بەردەستمان، ئەو فەرموودەیەی کە پێشەوا بوخاری هێناویەتی، جا لێـرەدا گـەلێك لـە زانایـانی کـۆن و تـازە لەبەرئـەوەی باسمان کرد کە ژن جۆرە تایبەتمەندییـەکی خـۆی هەیـە .. وەك مـەودوودی .. پێیـان وایە نابێت (ڕئاسەت) و ئیش و کارە دەوڵەتییەکان بسپێردرێ بە ژنان، بەڵگەشیان:

**<u>یەکەم</u>**: ئایەتی: ﴿ ٱلرِّجَالُ قَوَّٰمُونَ عَلَى ٱلنِّسَآءِ .. ﴾ (النساء: ٣٤).

**<u>دووەم</u>**: ((لن يفلح قوم ولوا أمـرهم إمـرأة..)) نـابێ بـە بەڵگـەی بـەرگری لـە ژنـان لـە (رئاسەت) و کارە دەوڵەتییەکانی تر، چونکە ئەوە (نص) نییە لەسـەر ئـەوە کـە ژنـان نابێ (مومارەسەی) کاری سیاسی بکەن، چونکە ئەگەر بەڵگەیەکی تەواو بوایـە لەسـەر ئەو مەسەلەیە هیچ زانایەك لێی دەر نەئەچوو، لە هەمانکاتدا خـەڵکێکی زۆر هەیـە لـەو ڕایە دەرچووەو پێی وایە ژنان کاروباری دەوڵـەتیان دەدرێتـێ. بۆیـە بـەڕێزان: (محمـد الغزالي- خوالێی خۆش بێ)، (يوسف القرضاوي، تەمەن درێژ بێت) لـە نووسـینەکانیاندا بە ڕاشکاوی ئەو شـتانەیان تۆمـارکردووە، ئەڵبەتـە دەڵـێن: (مـع الحـرص علـى مراعـاة الآداب الاسلامية فى كل الأحوال..). فەرموودەکەیش: ئـەڵێن هەنـدێ گرفـت و کێشـەی هەیە لە (ڕاوی) ەکەیدا لـەم جێگـەدا پێویسـت ناکـات بینووسـین، لەولایشـەوە دەڵـێن: فەرموودەکە تایبەتە بە کچەکەی (کیسـرا)ی پاشـای فارسـەکانەوە، ئـەوە بـوو کاتێـك نامەکـەی بـۆ نـارد، نامەکـەی پێغەمبـەری دڕانـد.! پاشـان مـردو کچـەکەیان خسـتە

جێگاکەیەوە، ئەویش ﷺ ئەو فەرموودەیەی فـەرموو، واتـە وەك بڵێـی خـۆی زۆر ژیـرو تەواو بوو تۆبەی کچەکەیەتی.. ئەگەر ژیر بوایە بڕوایان ئەهێنا.

به هەرحاڵ بەپێی ئەو ڕاڤەیەی کردمان بـۆ (قەوامـە)، ئـافرەت خـانمی ماڵـەوە بێـت چاکتـرە، هەموو شتێك بخرێتە ژێر دەسـتییەوە، هـەموو ژیـان و ژیـوارێکی بـدرێتیّ - لەولایشەوە لە هەموو بوارەکانی ژیاندا (مەشـۆرەت)ی پـیّ بکـریّ و ڕای وەربگـیردریّ، وەك پێغەمبەر ﷺ لە (حودەیبییە)دا کاتیّ مەسەلەی ئیحرام شکاندن و گەڕانەوە هاتـە پێشەوە، هاوەڵان دوو دڵبوون — خەریك بوو کارەکە بگاتە بن بەست، (ئـوم سـەلەمە) بە پێغەمبەری وت: تۆ خۆت لە پێشەوە کارەکە ئەنجام بدە، ئەو کاتە بـەوانیش بڵـیّ، وە یـا هـەر بێـدەنگ بـە، پێغەمبـەریش ﷺ ڕاکـەی وەرگـرت و ئەنجامەکـەیش زۆر سەرکەوتوو بوو.

وە یا (عبدالرحمنی کوڕی عەوف) کاتیّ سەرۆکی ئەنجوومەنی ڕاوێژ بوو بۆ هەڵبژاردنی (خەلیفە) پاش شەهید بوونی پێشـەوا عومـەر لـە شـاری (مەدینـە)دا- دەتـوانم بڵـێم— ئافرەت نەما ڕای وەرنەگریّ.، ئیتـــر نازانم ئەوانە چۆن دەڵێن ئیسلام دەڵێـت: (پـرس بە ژنان مەکەن)..!!

## * ڕەخنەیەکی تریان: ئایەتی (٢٨٢)ی سوورەتی (البقرة)یە کە دەڵێت: (دوو پیاو بکە بە شایەت، ئەگەر دەست نەکەوت، ئەوا پیاوێك و دوو ژن)..

بەڵیّ .. هەڵمەتی دوژمنانی ئیسلام لە سنوورێکدا ناوەستێت، بـەڵکو وردبـین دەکەنـە چاویان و دەگەڕێن بە دوای ڕەخنەکارییدا تا بەڵکو لە کارەکەیاندا سەرکەوتوو بن..!

ئـەمجارەیش لێـرەوە دێنـە ژوورەوەو دەڵـێن: بۆچـی ئـافرەت وەك پیـاو تەماشـا ناکرێت..؟ بۆچی دوو ئافرەت بە یەك شایەت دادەنرێن..؟ لە کاتێکدا لـە پیـاوان یـەك پیاو بەسە..؟!!

بۆچی ئافرەتیش وەك پیاو نەبێت..؟!! بۆچی ئەوەندە بیّ ڕێز تەماشا بکرێت..؟!!

بەڵیّ... ئەگەر سـەرنجی ئایەتەکـە بـدەین بۆمـان دەردەکـەویّ، کـە ئەوانـە خـەریکی بازرگانیین و زۆربەیان لە پیاوانن، واتە: وەك بفەرموێت: ئافرەت پێویستی بە بازرگانی

و ئیشی دەرەوەی ماڵ نییە، چونکە ئەو "ئافرەت" ژیواری لەسەر پیاوە، چ پێش شوکردنی چ دوای شووکردنی، کەواتە ئافرەت کەم تێکەڵی فرۆشتن و کڕین دەکات بەپێی سرووشت، کەواتە زۆر دڵیشی پێوە نابەستێت و شارەزاییەکی ئەوتۆیشی نابێت، جا لەبەر ئەوە بیرو هۆشی پەرتەوازە دەبێت لە کڕین و فرۆشتندا.!! پاشان ئیسلام (احتیات)ی بەکارهێناوە لە باسی شایەتییداو وردەکاری کردوو فەرمووی: ﴿.. أَن تَضِلَّ إِحۡدَىٰهُمَا فَتُذَكِّرَ إِحۡدَىٰهُمَا ٱلۡأُخۡرَىٰۚ ..﴾ (البقرة: ٢٨٢) لەبەر ئەوە زۆر گوێ بە مامەڵە نادات زۆربەی شتی لەبیر دەچێتەوە، بۆیە ژنێکی تر خراوەتە پاڵی تا بەڵکو ئەمیان یارمەتی ئەو بدات و بیری بخاتەوە..!

لەولایشەوە ئافرەت — وەك وتمان — دڵی نەرم و نیانەو سۆزی زیاترە لە پیاو و زوو تێك دەچێ و گریان دەیگرێت.. نابینی ژن و پیاوێك بڕۆن بەسەر ڕووداوێکدا پیاوەکە خۆی بۆ ئەگیردرێ و ئافرەتەکە گریان ئەیگرێ...!! ئاشکرایشە هەر کەسێك گریان بیگرێت و تووشی دڵ ناڕەحەتی ببێ هۆش و بیری تێك دەچێ..؟! ئینجا شتیشی لە بیر نامێنێ تا بیگێڕێتەوە، هەروەك زانا دەروون ناسەکان ئەمە ئەسەلمێنن و ددانی پیادا ئەنێن.!

بێجگە لەمانەیش ئافرەت تووشی ((حەیزو منداڵ بوون و بەخێوکردن) دەبێت کە لە کاتی ئەمانەدا وزەی نامێنێ و بیرو ژیری ئەڕوات.، با ئەمەیش پشتگوێ نەخەین کە زانایانی چەرخی پێش و دوایی (علماء السلف والخلف) ڕایان وایە کە شایەتی ئافرەت ڕەوایە لە هەموو شتێکدا تەنها (حدودو قصاص) نەبێت..

وە هەروەها هەندێ شت هەیە ئافرەت بە تەنها شایەتی لێ وەرئەگیرێ و بڕیاری لەسەر ئەدرێت، وەك مەسەلەی: (منداڵ بوون و شیرخواردن و کچێنی ئافرەت و هەندێ شتی تر..) نەك هەر ئەمە، ئەوەتە زۆربەی (صەحابییەکان) — بەتایبەت هاوسەرەکانی پێغەمبەر ﷺ — وە هەروەها بڕێ لە پەیڕەویکاران (تابیعیات) چەندەها فەرمووده ئەگێڕنەوە، وە لە شەریعەتی ئیسلامیشدا وەرگیراون و هیچ کەسێکیش هەستی بریندار نەکردوون، واتە (علماء الجرح والتعدیل) ڕەخنەی لێ نەگرتوون، کەچی

(ئیمامی زەهەبی) ڕەخنەی لە چوار هەزار پیاو گرتووە، لەوانەی فەرموودەیان گێڕاوەتەوە...!!

لە دروست بوونیانەوە تا ئێستاو دواتریش هەر ئەو چەند ڕستەیەیان هەیەو دووبارەو سێ بارەی دەکەنەوەو بەیناو بەین —بۆ گێرە شێوێنی— بڵاوی دەکەنەوە..! بۆیە ساڵی (١٩٨٤ ز) لەسەر داوای هەندێ لاو و دڵسۆزانی ئیسلام کتێبێك دەرچوو لەژێر ناونیشانی (سەربەستی لە ئیسلامدا) لەو نووسینەدا سەرباسێك هاتووە بەناوی (چەند ڕەخنەیەك لەئیسلام سەبارەت بە ئافرەت) پێم باشە بۆ وەڵامی ئەم ڕەخنەیە سوودی لێ وەرگرین.

*** خاڵێکی تر کە ئەوان سەری لێ دەرناکەن و بووەتە گرێی دڵیان مەسەلەی میراتە، ئەویش ئەوەیە کە خوای گەورە دوو ئەوەندەی مێیینەی داناوە بۆ نێرینە :**

**﴿ يُوصِيكُمُ ٱللَّهُ فِىٓ أَوْلَـٰدِكُمْ ۖ لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ ٱلْأُنثَيَيْنِ ۚ ... ﴾ (النساء: ١١). بۆ وەڵامدانەوەی ئەم ڕەخنەیەشیان وەڵامی هەمان سەرچاوە "سەربەستی لە ئیسلامدا" دەهێنین فەرمووتۆو دەقەکەی:**

**خوشکی بەڕێز:** هەر وەك پێم وتی لە پێشەوە دوژمنانی ئیسلام هەر جارەی لە کونێکەوە سەر هەڵ دەدەن و دێنە ژوورەوە، تا بەڵکو جێگەی سەرییان ببێتەوە، ئینجا خۆیشیان جێگای قاچیان دەکەنەوە..! کەوابوو ئاگادار بە.. ڕاپەڕە... هۆشیار بە... ئەوەتە جارێکی تریش هاتنەوە بۆ لات، بەڵکو بە هەر جۆرێ بێت دڵت بگۆڕن سەبارەت بە ئیسلام، تا ناشیرینی بکەن لە لات...!!

بۆیە دەڵێن: بۆچی ستەم دەکەن لە ئافرەت و وەك پیاو تەماشای ناکەن لە میراتدا..؟! واتە: نەك ئاوا بە سووك و سادە داوا بکەن بەڵکو لە ١٩٢٨/١٢/٢٣زاییندا (سلامە موسی) لە کۆڕی لاوانی مەسیحیدا ئەم ڕەخنەیەی درکاندو موحازەرەیەکی درێژی دا لەوبارەیەوە..! ئینجا داوایشی کرد لە بەڕێوەبەری

ئافرەتانی (میصر) كە داوا بكەن لە وەزارەتی داد بۆ ئەوەی یاسایەكی تازە دانێن و ددان بنێن بە یەكسانی ئافرەت و پیاودا لە میراتدا... ! ![٤٤]

ئایا ڕاستە ئایینی پیرۆزی ئیسلام ستەمی كردووە لە ئافرەت و مافی نەداوەتێ لە میراتدا..؟! پێش ئەوەی وەڵامی ئەم پرسیارە بدەینەوە سەرێك لە وڵاتە نا موسڵمانەكان — بە كۆن و تازەوە — بدەین تا دەركەوێ ڕاستی و یەكسانی ئەوان سەبارەت بە ئافرەت وە ستەمی ئیسـلام لێی..!!

- لە (یۆنان)دا بە تەواوی ئافرەت بێ بەش بوو لە میرات، تەنانەت ئەیان ئەوت: ئاخۆ ئافرەت خاوەنی گیان بێت..؟!

- لە (ڕۆما)دا ئافرەت زیاتر نەبوو لە (یۆنان).، لە ڕۆژهەڵاتیشدا وەك (تۆرانی و، كلدانی و، فینیقی و، سریانی و، ئارامی) بەشی ئافرەت و منداڵیان نە ئەدا..!!

جوولەكەش ئەگەر كەسێك بمردایە و كوڕی بووایە سامانەكەی هەموو ئەدا بە كوڕەكە ئیتر بەشی ژن و كچ و خزمەكانی تریان نەئەدا، تەنانەت ئەگەر كەسێك كچێك و كوڕێكی بە جێ بمایەماڵەكەیان هەموو دەدا بە كوڕەزاكەیی و كچەكەیان بێ بەش ئەكرد..!!

لە سەردەمی نەفامیشدا هەر كەسە بەسەر وڵاغەوە خۆی نەگرتایە، واتە: نەیتوانیبا جەنگ بكا — وەك ئافرەت و منداڵ — لە میرات بەشیان نە ئەدا..!! تا كاتێ ئایەتی میرات هات و بەشی میراتی ئافرەتیشی دیاری كرد، ئینجا خەڵكێكی زۆر هاتن بۆلای پێغەمبەر ﷺ چۆن ئەی پێغەمبەری خوا كابرایەك بمرێ تەنها كچێكی ببێ و نیوەی ماڵەكەی ببات..؟!! لە كاتێكدا جەنگاوەر نییە..؟!

ئینجا لەم كاتەدا كە ئافرەت ڕۆشنایی نییەو شەوە زەنگ و تاریكی بەختی ڕەشی داپۆشیوە، تیشكی خۆری ئیسلام لە ئاسۆی كەلدا خۆی نواندو مافی زەوت كراوی چەندە ساڵەی ئافرەتی زیندووكردەوەو فەرمووی: ﴿لِّلرِّجَالِ نَصِيبٌ مِّمَّا تَرَكَ الْوَالِدَانِ وَالْأَقْرَبُونَ وَلِلنِّسَاءِ نَصِيبٌ مِّمَّا تَرَكَ الْوَالِدَانِ وَالْأَقْرَبُونَ مِمَّا قَلَّ مِنْهُ أَوْ كَثُرَ نَصِيبًا مَّفْرُوضًا﴾ (النساء: ٧).

(٤٤) وەك ئەوانەی لە هەندەران دەژیین لای بێگانەو بۆ بێگانە دەژیین و ئاراستەش لەوێوەوە وەر دەگرن..!! لەباتی پیشەسازی و تەكنەلۆژیاو شتێكی باش، ئەویش ئەڵقەی ئەوانی لە گوێ كردووەو، جێگە پێی ئەوانی هەڵگرتووەو كاسەكەی ئەوان دەلێسێتەوە...!

بەڵێ... ئایینی پیرۆزی ئیسلام بەشی تایبەتی دانا بۆ ئافرەت، وە بە خاوەن گیان و نیوەی کۆمەڵی دانا، وە هیچ زۆرو ستەمی لێ نەکردووە وەك ناپاکان دەڵێن..!! بۆچی ستەم بێت لە ئافرەت ئەگەر نیوەی پیاو ببات لە میراتدا..؟!! لە کاتێکدا پیاو هەرکات هاوسەری هێنا دەبێ مارەیی بداتێ.[٤٥] ، وە پێویستە لەسەری کە ژیان و ژیواری مسۆگەر بکات... ئەگەر چی ژنەکەیش زۆر دەوڵەمەندو سەروەتمەند بێت..!!

نە هەر ئەوەندە بەڵکو دەبێ ناومالێ و کەرەسەی ناوماڵیشی بۆ ئامادە بکات..! ئەویش نەك بە پیاوەتی و منەت، بەڵکو پێویستی سەرشانییەتی، تەنانەت ئەگەر ژیانی باش نەبرد بەڕێوە، بۆی ڕەوایە سکاڵا بنووسێ بۆ دادگاو لێی جیا ببێتەوە..

ئەمە ئەگەر مێردی کردبوو، تەنانەتی ئەگەر مێردیشی کردبوو لای باوك و براو خزم و کەس و کاری بوو، هەر دەبێ بە ڕێك و پێکی ژیانی بۆ ئامادە بکەن... ئەگەریش خزمانی گوێیان نەدایە، ئەوە دادگا بە زۆر جیرەیان لەسەر دائەنێ بۆی، لەولایشەوە ئافرەت ژیان و نەفەقەی منالەکانی لەسەر نییە، بەڵکو دەبێ پیاوەکە غەمیان بخوات.

خۆئەگەر تەلاق درا وە یان مێردەکەی مرد، دیسانەوە ژیان و نەفەقەی دەچێتەوە سەر کەس و کاری..! خۆئەگەر مێردی کردەوە نەفەقەی دەکەوێتەوە سەر مێردەکەی.. نە هەر ئەوەندە بەڵکو تەواوی پێداویستییەکانی ژیانی دەبێ مسۆگەر بکرێ، کەوابوو پیاو زیاتر پێویستی بە سامان و پارە هەیە تا ژن، (بەلای خاوەن ژیرییەکانەوە..). هەر بۆیەش دوو ئەوەندەی ئافرەتی بۆ دانراوە (هەندێ جار)..! ﴿...لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ ٱلۡأُنثَيَيۡنِۚ﴾ (النساء: ١١). وا بەم وەڵامە کورتەو سەرپێیەوە دەرکەوت

---

(٤٥) خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وآتوا النساء صدقاتهن نخلة....﴾ سورەتی النساء ٥. مارەیی ڕێزو حورمەتێکە بۆ ئەو ژنەی دەبێتە خێزان و هاوسەر، نیشانەی بایەخ و ڕێز دانانە.. کە ئەگەر تەواوی سامانەکەیشی پێشکەش بکات بۆی هێشتا لای ئەم سەنگینترە... لەولایشەوە مسۆگەر کردنی ژیان و ژیواری ئەو ژنەیەو کابرای مێردیشی، هەر ڕۆژەی هات بە سەریا بەجێی ناهێڵێ، چونکە (سەنەد)و کۆمپیالەیەکی داوە بەو ئافرەتە، وەك ئەوروپاو قوتابییەکانی نەکردووە، لەسەر سادەترین شت ڕێك بکەون و، پاشان کە تێر بوون لە یەکتر بە هەرزانترین و سادەترین نرخ دەستی لێ هەڵبگرێ..!

فەلسەفەو حیکمەتی ئەوە کە بۆچی پیاو دوو ئەوەندەی ژن دەبات؟ جگە لەوەیش هەندێ جار ژن وەك پیاو بەش دەبات...! وەك:

١- برای دایکیی، ئەگەر هەر خۆی بوو یەك لەسەر شەشی میرات دەبات.، لەولایشەوە ئەگەر خوشکی دایکی بوون و کەسیش بێ بەشی نەدەکردن، ئەوانیش هەریەکە یەك لەسەر شەش دەبەن، وەك ئەم ئایەتەی سوورەتی (نساء) کە دەفەرمووێت: ﴿ ..وَإِن كَانَ رَجُلٌ يُورَثُ كَلَٰلَةً أَوِ ٱمْرَأَةٌ وَلَهُۥٓ أَخٌ أَوْ أُخْتٌ فَلِكُلِّ وَٰحِدٍ مِّنْهُمَا ٱلسُّدُسُ .. ﴾ (النساء: ١٢).

٢- کەسێك بمرێ منالّی نێرینە، وە یان نێرینەو مێینەی لێ بەجێ بمێنێ، لەگەڵ باوك و دایکیا، لەم مەسەلەیەشدا دایکەکە ئەندازەی باوك دەبات بێ زیادو کەم. واتە: یەك لەسەر شەش: ﴿ ..وَلِأَبَوَيْهِ لِكُلِّ وَٰحِدٍ مِّنْهُمَا ٱلسُّدُسُ مِمَّا تَرَكَ إِن كَانَ لَهُۥ وَلَدٌ... ﴾ (النساء: ١١).

چەند جوانە مرۆڤی بە ویژدان، (هەق) لەلای کێ بێ ددانی پیا بنێت، ئافەرین بۆ دکتۆر (گوستاف لویون) فەیلەسووفی فەڕەنسی کە دەڵێت: (یاسای ئیسلام مافی ئافرەتی داناوە لە میراتدا، بەشێوەیەك کە هاو وێنەی نییە لە یاساکانی ئێمەدا...).

ئەمە بوو — بە کورتە — وەڵامێك بۆ ئەوانەی بە ویژدانن و باوك و دایکی خۆیان ئەناسن.. بەڵام ئەوانەی بێ دایك و باوکن، وە حەزیان لە یاسای بێ (دایك و باوك)یە، پێم وا نییە بە وردیی و زیرەکانە وردی ئەم ڕاستییانە ببنەوەو سوودیان لێ وەرگرن. ڕێزی ئافرەت لای ئیسلامە .. تەنها ئیسلام دەتوانێ بیگەیەنێتە جێگاو پلەی شیاوی خۆی.

سەدان ئافرەت هەیە، بەڵکو هەزاران.. پایەو پلەیان زۆر بەرزترە لە پیاوان، بۆ نموونە:

<u>یەکەم</u>: خاتوو (عائیشە) — دایکی موسڵمانان — سەرچاوەی پرس و ڕای موسڵمانان بووە لەلای هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ بۆیە فەرمووی: (نیوەی ئایینتان لە عائیشەوە وەرگرن).

دووەم: بەڕێز (فاطمە ی علاءالدین) سەمەرقەندییە، زۆر شارەزاو بلیمەت بوو، بەشێوەیەك هەر (فەتوا)یەك لەلای باوکییەوە دەرچوایە ئیمزای ئەویشی پێوە دەبوو..!

سێیەم: خاتوو (ستیتە)ی کچی قازی حسێن، ئەم بەڕێزەیش زۆربەی (فقە)ی شافیعی لەبەر بووە. ساڵی (٣٧٧)ی کۆچیی دونیای بەجێ هێشتووە.

چوارەم: (زەینەب) کچی عبدالرحمانی شەعرییە، زانایەکی هەڵکەوتوو بووە زۆربەی زاناکان ئیجازەی (عیلم)یان داوەتێ، وەك: (ابو الحسن الفارسي) و (ابو القاسم الزمحشري) خاوەنی تەفسیری (کشاف) تەنانەت خۆیشی – خاتوو زەینەب – ئیجازەی (ابن الخلکان)ی داوە..!

پێنجەم: خاتوو (کەریمە) کچی ئەحمەدی مروزی لە فەرموودەکانی پێغەمبەرا ﷺ دەستی باڵای هەبووە، ئەوەتە (خەطیبی بەغداد)ی (صحیح البخاری) بەلاوە خوێندووە..!

شەشەم: خاتوو (عەنیدە).. ئەم ئافرەتە بەڕێزە کاتێك دادەنیشت بۆ وانە وتنەوە (٥٠٠) پێنج سەد قوتابی لە پیاو و ئافرەت ئامادە دەبوون.

(عەبدولواحدی مەراکیشی) دەڵێت: تەنها لە گەڕەکی ڕۆژهەلاتی (قورتوبە)دا (١٧٠) سەدو حەفتا ئافرەت قورئانیان دەنووسییەوە بە خەتی کووفی.

به ئافرەت بوون لای ئێمە شانازییە، وە ئەو جۆرە ئافرەتانە باسمان کردن خاوەنی مێژوون، چونکە هەوڵدەرو ماندوو نەدیو بوون، شان بەشانی پیاوان لەگۆڕەپانی ژیاندا بوون... موتەننەبی چەندە جوان دەڵێت:

ولوكان النساء كما ذكرنا لفضلت النساء على الرجال

فلا التأنيث لاسم الشمس عيب ولا التذكير فخر للهلال

واتە: ئەگەر ژنان ئاوا بن ئەوا باو دەدرێن بەسەر پیاواندا * نە مێینە بوون بۆ وشەی"خۆر" عەیبەیە، نە نێرینە بوون بۆ وشەی "مانگ " فەخرو شانازییە.

## چپەیەک بۆ خوشکان:

بەڕێزان: پاش ئەم لێكۆڵینەوە كورتەیە ئومێدەوارم ئیتر دوای فات و فیتی ناپاكان نەكەون و هەڵتان نەخەڵەتێنن..! چونكە ئیسلام تۆی بەڕێزی بە (خانم و سالار)ی ناو ماڵ داناوە.. بە قوتابخانەو یەكەم پەروەردەكاری منالْ داناوە .. بەرگی ڕێزو ئابڕو و كەرامەتی كردووەتە بەرت.. لەگەڵ پیاواندا هاو ژیانن وەك یەك لە هەردوو جیهاندا.. بەڵام چەند ڕاستییەك هەیە لێرەدا — كە زانیاری لە سەدەی بیستەمدا سەلماندوویەتی — پێم چاكە بۆتان باس بكەم، ئەویش لە كتێبی (دائرة المعارف الكبرى الفرنسية)دا دەڵێت: (دڵ كە مەڵبەندی ژیـــانە، بەپێی لێكۆڵینەوە ڕوون بووەتەوە كە دڵی ئافرەت لە ٦٠٪ گرامی لە دڵی پیاو بچووكترە، وە توانای بەرگری كەمترەو هەروەها كۆئەندامی هەناسەدان لای پیاو بەهێزترە لە كۆئەندامی هەناسەدانی ئافرەت.. هەر ئەو جیاوازییە سروشتیەیە كە پیاو لە یەك كاتژمێردا (١١٪)ی كاربۆن سەرف ئەكات، كەچی ئافرەت (٦٪)ی كـــــەرتێك سەرف ئەكات..

ئەمە بووە هۆی ئەوە كە توانای ژنان كەمتر بێت لە توانای پیاو، ئەمە لەم بارەیەوە، ئینجا لە ڕووی پێنج هەستە پێكهێنەرەكانیشەوە مامۆستا (نیكۆڵس)و مامۆستا (پۆڵیە) دەڵێن: هەست كەری ئافرەت گەلێ لاوازو بێ هێزترە لە چاو هی پیاودا، بۆ نموونە: ئافرەت ناتوانێ زۆر لە دوورەوە — ئەو ئەندازەیەی زانست دیاری كردووە بۆنی شت وەرگرێ... وە هەروەها سەلمێنراوە كە مێشكیشی بچووكترە لە مێشكی پیاو بە ڕێژەی (١٠٠) گرامی ناوەندی.

وە لەسەر باسەكەیان دەڕۆن و دەڵێن: (ڤارینی) وتوویەتی: ئافرەت بەرگەی تەنگانە ناگرێت، چونكە زۆر زوو تێك دەچێ و دەشڵەژێ، فەیلەسووف و هەڵكەوتوو (پرۆدۆن) دەڵێت: ویژدانی ئافرەت كەمترو لاوازترە لەچاو پیاودا، وە هەروەها تەبیعەت و سرووشتی ئافرەت لەگەڵ هەندێ شتدا یەك ئەگرێ و ئەگونجێ، كەچی هی پیاو ناگونجێت.

دکتۆر (الیکسس کاریل)یش لە کتێبی (الانسان ذلك المجهول)دا کە باسی سروشت و ئیش و کاری ژنان دەکات لەلاپەڕە (١٠٨ – ١٠٩)دا دەڵێت: (ئەو جیاوازییەی لە نێوان ئافرەت و پیاودا هەیە، وە نەبێ تەنها لە وێنەی تایبەتی ئەندامی زاوزێوە بێت، ! یا لە بوونی منداڵدان و هتد.. بێ، یا لە شێوەی پێ خوێندن و فێرکردنەوە بێ.، ئەو جیاوازییەیان لە پێکهاتنی تێشووەکانەوەیە (تکوین الانسجة)، وە لە چاککردنی (تلقیح)ی لاشەوەیە، نە شارەزایی لەم ڕاستییانە بوو پاڵی نا بەوکەسانەوە کە بەرگری لە ئافرەتان دەکەن بۆ باوەڕهێنان کە: دەبێ پیاو و ئافرەت یەك جۆرە خوێندن و فێرکردن و پەروەردەیان ببێ... وە یەك جۆر ئەرکیان بدرێ بەسەرا. ئەوەی ڕاستی بێت، ئافرەت جیاوازی گەورەی هەیە لە پیاو، وە هەر خانەیەك لە خانەکانی لاشەی سروشتی نەژادی خۆی هەیە.

ئەمە ڕاوبۆچوونی زانست و زانیارییە سەبارەت بە لاشەو قەدو بالاو مێشك و دڵ و دەروون و توانایی ژنان... گومانیش نییە کە ئیسلام هەڵی نەبەستووەو بەکرێی نەگرتوون تا ئەوە بڵێن.. لەولایشەوە نە (قورئان) و نە (فەرمودە) بە ڕاشکاوی بەڵگەیەکی وایان تیا نییە کە ددان بنێت بەوەدا، هەروەك بەندێکیش نییە ئەوە ڕەت بکاتەوە، بەڵام دووریش نییە کە وا بێت، چونکە وەك لە پێشەوە باسمان کرد – لە باسی (قەوامە)دا – کە ئافرەت ئیش وکاری سەرەکی خۆی منداڵ بوون و، منداڵ هەڵگرتن و، پەروەردەکردن و پێگەیاندنیەتی، لەگەڵ هەندێ (اختصاصات)ی خۆیدا، کە ئەوانە بە پیاو نەدراوە... گەلێ شت هەیە بە ئافرەت ئەنجام ئەدرێ، بە پیاو ئەنجام نادرێ، بە پێچەوانەیشەوە ئاشکرایشە ئەوە ناتەواوی نییە بۆ هیچ کامێکیان، چونکە ئاوەدان کردنەوەی گێتی بە هەردووکیان دەبێت.

دووریش نییە ئەوەی کە زاناکان تۆماریان کردووە ڕاست بێت، دووریش نییە هۆی پێویست کردنی (نەفەقە)ی ژنان لەسەر پیاوان شتێکی وا بێت... هەر بۆیەش لاپەڕەی تایبەتی کردووەتەوە بۆ هەردوولا - ژن و پیاو- لەگەڵ تۆمارکردنی هەرشتێك

لەگەڵ (تکوين الانسجة)یاندا بگونجێت، لەگەڵ ئەمانەیشدا خوێندن و فێر بوون و زانست و زانیاریی لێ یاساغ نەکردووە... بەڵکو بە پێچەوانەوە گەلێ (واجبات)ی ئیسلامی هەیە هەر بە ژنان پڕ دەبێتەوە، وەك (پزیشکی و وانەکانی خوشکان لە قوتابخانەو دانشگاکانداو، پڕکردنەوەی نەخۆشخانەکان –بەشی ژنان- بۆ نەخۆشی ژنانە)، ئەڵبەتە دەبێ ئەوەش بڵێین: کە بۆچوونی ئیسلام ئەوەیە تا دەسەڵات ببێ و بگونجێت دەبێت ژنان بۆ ژنان، پیاوان بۆ پیاوان، چارەسەری نەخۆشی بکەن، وە یان وانەکان بڵێنەوە..

**بەکورتی**: پیاو کاری خۆی بکات و ژنیش کاری خۆی، هیچ کەس کاری ئەویان داگیر نەکات بەناچاری نەبێت لەگەڵ تۆمارکردنی ئەو ڕاستییانەدا، ئەم دوو تێبینییەم هەیە:

١- من باسەکەم باسی ئیسلامە، نەك کۆمەڵگەی ئیسلامی چونکە ئیسلام ئەو هەموو یاساو قانوون و دەستوورانەیە کە پڕ بە بالآی ژن و پیاون، بەلآم نکوولّی ئەوەیش ناکەم کە لە کۆمەڵگەدا – کۆن و نوێ – درێغی و قسوور هەیە سەبارەت بە خوشکان، لای ئێمەی ئیسلامی ڕێك کەوتووە خوشکێك ژنی پیاوێکی دڵڕەقی سەرسەخت بووە، نە شارەزایە بە یاساکانی مافی ژنان لە ئیسلامدا، وە یا دوور لە شارستانییەت و ژیاری ئادەمیزاد... وە یا هەر خۆی سرووشتی نەخۆش و لاواز بووە گوێی بە هیچ یاسایەك نەداوە، لەو جۆرە کەسانەیە کە (افراط) و (تفريط)ی زۆریان کردووە..! دەبینی لە هەندێ ناوچەو ولآتدا تەواوی ئیشەکانی دەرەوەی ناوماڵ سەپێنراون بەسەر ژناندا، بە زیاد لەکارەکانی خۆیشیان: (پاچەکۆڵەی پێ دەکرێ، گێرەو کێشەو دروێنەی دەغڵ و دان و دانەوێڵەو... ئێوارەیش نان و چێشت و خواردن و خۆراك و پاك و خاوێنی و بەڕێ خستنی میوان و.. هتد. لەگەڵ دانانی هەندێ (قەید)و (قیود) لەسەریان کە (ما انزل الله بها من سلطان..)! وە یا لەکاتی بە مێرد دانیاندا بە زۆری خەنجەرو ڕاکێشانی چەك مارەکراوە بۆ پیاوێك کە بەڕاستی شەریعەتی ئیسلام هیچ

کات ڕازی نییە بەو جۆرە هەڵسوکەوتانە، وە لە ژێر چەپۆکی باوکێکی نەزاندا، وە یا برایەکی ئارەزوو پەرستیدا مارە دەکرێ بۆ سەرمایەدارێك، وەیا بۆ پیرەمێردێك کە بەڕاستی جگە لە بەرژەوەندی خۆیان هیچ بەرژەوەندییەکی ژنەکە نابینرێ..!
کاتێ ئەوانە دەبینرێ صەدان نەزان و نەخۆش دەیکەن بە هەرا لە ئیسلام و دەهۆڵی بۆ لێدەدەن..! من ئەوە دەڵێم کە بەڕاستی کەمتەرخەمی کراوە لەو مەسەلەیەدا، بەتایبەتی لەو کاتەوە دەسەلاّت (سلطة) لە ئیسلام زەوت کراوە، هەر کۆلکە خوێندەوارێك هەستاوە بەناوی ئیسلامەوە صەدان ستەمی لە ژنان کردووەو وە لەولایشەوە ئیسلامی ناشیرین و عەیبدار کردووە..
ئەمە لێرەوە... پاشان ئێستایش بەناوی ئازادی و سەربەخۆیی ژنانەوە هەزاران کاری نابەجێ ئەنجام ئەدرێ، کە بەڕاستی زۆر دوورو نەگونجاون لەگەڵ یاسای کۆمەڵایەتی و ژیانی هاوسەرییدا، وە دەبنە هۆی هەڵوەشاندنەوەی ژیانی ژن و مێردی، ژن بە ئارەزووی خۆی دۆست و خۆشەویست ئەگرێ (بۆ ماوەی چەند ڕۆژێك وە یا بۆ چەند کاتژمێرێك..!! بێ پرس و ڕا بە سەرپەرستەکەی دێت و دەڕوا، شەو ناگەڕێتەوە، لە شەوە پەمەییەکاندا، لە تیاترۆخانەکاندا دەبینرێتەوە...!! دەڕوات بۆ هەندەران..! بێ پرس و مەشوّرەت لەگەڵ ئەم و ئەودا مێرد دەکات..! خراوەتە سەر کارگەکان بەیانی تا ئێوارە لە دەرگای دەزگایەکدا دەوەسێنرێ بەناوی (فەراش)ەوە، وە یا کارەکەرێکەوە... وە یان ژنێك لەناو چەندین پیاودا کارمەندە... وە یان شەو لە خەستەخانەکاندا بەناوی برین پێچییەوە لەگەڵ چەند (مراهق)ێکدا دەمێنێتەوە..! وە یا بەناوی خوێندن و زانیارییەوە لە دانشگاکاندا — بەتایبەت — لەسەر یەك کورسی وە یا بەیەکەوە لە (شوققە)یەکدا دەژیین..! وە یا.. وە یا... بەڕاستی ئەوەیش لە سنوور دەرچوونە بۆ ژنان، لە سنوور دەرچوونە لە کەش و هەوایەکی سازگارو دوورە لە دڵەڕاوکێ بۆ وەرگرتنی زانست و زانیاریی... بۆ تەداوی و چارەسەری نەخۆش...

**خوشکی بەڕێز**: خۆزگە ئەمزانی کام زاناو کام فەیلەسووف دەڵێت: هەر ئافرەتێك جل و بەرگی ئیسلامی لەبەردابێت فێری زانیاریی نابێت! کام بلیمەت و هەڵکەوتوو دەڵێت: فیزیا، کیمیا، جەبر، هەندەسە.. بەسەری ڕووت و لاقی ڕوتەوە نەبێت نازانرێت..؟! کام پرۆفیسۆر دەڵێت: چارەسەری نەخۆش ئەگەر بە (حیجاب)ەوە بێت (مەفعوول)ی نابێت..؟! کام زانیاری دەڵێت: جل و بەرگی ئیسلامی بەرگری دەکات لە پێشکەوتن..؟!

ئاخ! ئەمزانی خۆ دەرخستن بە ڕووت و قووتی و بۆیەی کوڵم و ڕوومەت و لێو سوورکردن، تا چ پلەیەك دەبنە هۆی زانیاریی و نیشانەی پێشکەوتن؟! کەسێك هەیە بلێت تەقینەوەی شۆڕشی پیشەسازی بێ (حیجاب)ی سەری خست و دەستی گرت بەرەو پێشکەوتن..؟!

ئایا ئەو مرۆڤەی فڕۆکەو، ئۆتۆمبێل و، تەلەفۆن و، فاکس و، کۆمپیوتەرو ڕۆکێت و بۆمبای ئەتۆم و ئەلەکترۆن و مانگی دەست کردو... هتد.. دروست کرد، لەلاق ڕووتی ئافرەت و بێ پەردەیی ئافرەتەوە فێربوو..؟!

لەکۆتاییدا دەڵێم: ئەمڕۆ ڕۆژی لێکۆڵینەوەو توێژینەوەیە، ئەمڕۆ سەدەی زانیارییە، سەدەی پەیدابوونی دەیان (وەسیلە)یە بۆ لێکۆڵینەوە، بۆ بەرئەنجام گەیشتن... ڕۆژی درکاندنی ڕاستییەکانە.. ڕۆژی ئەوەیە کەس کەس فریو نەدات.. ڕاستییەکان لنگاو قووچ نەکرێنەوە... ڕۆژی ئەوە نەما بلێیت: ﴿.. لَا تَقۡرَبُواْ ٱلصَّلَوٰةَ.. ﴾ (النساء: ٤٣) و﴿ ..وَأَنتُمۡ سُكَٰرَىٰ... ﴾ (النساء: ٤٣) ی لێ بقرتێنی... چۆن دەتوانن بلێن: (عبدالرحمنی کوڕی عەوف) لە ترسی ئەوەدا موسوڵمان بوو کە خاوەنی ئەوەندە دارایی بوو، وە هاوەڵان بە زۆر سامانی خەڵکیان زەوت دەکرد، وە یا لە جەنگەکاندا بە زۆر بەر ئەبوونە سەرووگیانی خەڵکی..!

ئەویش لەترسدا بڕوای هێنا تاماڵەکەی بمێنێتەوە..! بۆ سەیری مێژوو ناکەن..؟! بۆ مێژوو ناخوێننەوە..؟! تابزانن مۆڵەتی جیهاد کەی درا، وە (عبدالرحمن..) کەی

موسوڵمان بوو..؟ عبدالرحمن هەشتەمین کەسە بڕوای هێناوە لەترسی قوڕەیشدا نەیان دەوێرا سەر بێننە ڕۆشنایی، وە هەر بەبیریشیا نەهاتووە ڕۆژێ بێت (غەنیمەت)و دەستکەوتی جەنگی پەیدا ببێت..! پاش موسوڵمان بوونی ئەو، (١٣) ساڵ بەسەر چوو، ئەو جا لە (مەدینە)دا جیهادو غەنیمەت دەستی پێکرد..

ئێمە ئامادەین گرفتەکانتان – وا دەزانم هەمووی دەگەڕێتەوە بۆ ئارەزوو و (جنس) – چارەسەر بکەین... ئەوانەتان توانیی نییە ژن بهێنێ، وە ناگونجێ شوو بکەن، لە ژێر ڕۆشنایی ئایەتی: ﴿ وَأَنكِحُوا۟ ٱلْأَيَـٰمَىٰ مِنكُمْ... ﴾ (النور: ٣٢)ی سوورەتی (نوور)دا، وە لەژێر ئەو یاسایەدا کە کاتی خۆی (عومەری کوڕی عبدالعزیز) دەری کرد: (هەرکەس ژنی نییە سەر بدات با بۆی جێبەجێ بکەین... مارەیی و پێداویستییەکانی تر...) ئێمەیش ئامادەین هاوکارییتان بکەین.! بەڵام دەبێ ئەو ڕاستییەش بڵێین کە: ئێوە هەمان نەخشەی جوولەکەتان هەیە بۆ چەواشەکردنی لاوەکان و خەڵەتاندنی خوشکان، چونکە ئەوانیش گەورەترین چەکیان بۆ ڕووخاندنی قەڵای ئیسلام و بەنج کردنی لاوەکان مەسەلەی ژنانە..! وەك لە کتێبی (بروتوکولات حكما صهيون)دا هاتووە.

**دوا وتە**: ئێوە دەبێ پێشتر زۆر بە ژیرانە ورد ببنەوە لەم بوونەوەرەیە تا خوا بدۆزنەوە.. چۆن دەبێت..؟ بڵێن: وەك پێغەمبەرەکەتان (مارکس) دەڵێت: (لا اله والحياة مادة..)؟! دەگونجێت ئەو هەموو (ملیار) موسڵمانە خاوەن ملیۆنەها کتێب و جۆراوجۆری زانیاری، خاوەن هەزارەهاو ملیۆنەها فەیلەسووف و، مێژوونووس و، شارەزای زانیاری کۆمەڵایەتی... خاوەنی پزیشکی و جۆرەکانی زانست، هەمووی نەفام و سادەو گێل و وێڵ بێت..؟! چۆن دەتوانن بڵێن بوونەوەر بێ خوایە..؟! لەسەرەتای جیهانەوە تا ئێستا لەخۆیەوە تەنها (خانە)یەك دروست بووە.. ئەی چۆن ئەو ئاسمان و زەوی و دەریاو وشکانی و، کێوو دەشت و خۆرو مانگ و ئەوهەموو ئەستێرەیە دەدرێتە دەست (ڕێکەوت)ەوە..؟! وە یا دەستی (سروشت)ەوە..؟!

وا دەزانم هەر ئەوەیە پاڵتان پێوە دەنێت بۆ بلاْوکردنەوەی ئەم هەموو پڕو پالاْنتانە.. باوەڕیشم وایە جگە لەوەی کە دەتانەوێ فەرمانی ئاغاکانتان پیادە بکەن شتێکی تر نییە. ! بۆچی دوای دەهۆڵی ئەملاو ئەولاو دەکەون بەتایبەت ئەو بیرۆکەیە کە لە جیهاندا هەڵوەشاوەتەوە..؟! ئەوەیش بزانن کە بەدرێژایی مێژوو هەرکەسێك شەڕەقۆچی لەگەڵ ئیسلامدا کردبێت، دەرەنجام سەری خۆی پان بووەتەوە. وە ئاشکرایە کورد گوتەنی: (هەرکەسێك کەسە ئەلفێکی بەسە).

بۆیە ئیتر وا دەزانم بوختانەکەی (خالید)و (هارون) زیادەیەو پێویست ناکات.. چونکە کەسێکی وەك خالید، پێغەمبەر ﷺ بەگۆترە نازناوی (سیف الله المسلول)ی پێ نەبەخشیوە، وە هەرگیز ئەوە سیرەت و ژیاننامەی هاوەلاْن نەبووە، ئەگەرچی بوختانی زۆریشیان لەسەر تۆمار کرابێ لەلایەن جوولەکەو قوتابییەکانییەوە.

(هارون)یش پێش ئەوەی بڕواتە سەر کورسی حوکم (١٠٠) ڕکات نوێژی سوننەتی کردووە، دەگونجێت پیاوێکی ئاوا تەقلەباز بێت و ئێوە گوتەنی (مەیمون) بنێت لە ژنان..! هەرگیز ئەو جۆرە کردارانە لەموسوڵمان ناوەشێتەوە، بەڵکو ئەوە لەکاروکرداری ئێوەو ئاغاکانتانەوە نزیکە..!

نابینی چۆن یاری بە (مەیموون) و (سەگ) و.. هتد دەکەن..؟! نە هەر ئەوەندە بەڵکو هەر خێزانەی چەند سەگێك ڕادەگرێ..! من نازانم بڵێم بۆچییانە..؟! ئێوە خۆتان باش دەزانن.!

**تێبینی:** لەبەر ئەوە بەشایەتی قورئان و هەموو مێژووناسێك جوولەکەو گاور دەستکاری ئایینەکەیان کردووە بەئارەزووی خۆیان... من خۆم نەکرد بەخاوەنیان، با ئەوان خۆیان - ئەگەر خاوەن عیززەت بن — وەلاْمی بدەنەوە.

سبحانك الله وبحمدك، أشهد أن لااله الا أنت أستغفرك وأتوب اليك.

١١/ی (محرم)ی ١٤١٩ی کۆچی.

٨/ی (ئایار)ی ١٩٩٨ی زایینی.



# لادانی گومان

# لەسەر بــەكــار هێنانــی ئــایین

# بۆ مەرامــی سیاسیــی ؟!

**تێبینی/ ئەم بابەتە وەڵامێك بوو بۆ ئێوارە كۆڕێكی بەڕێز مامۆستا عومەر چنگیانی كە لە ڕۆژی ٢٠٠٤/٨/٢٤ دا لەشاری هەولێر بۆی ساز درابوو.**

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

دەبێ مرۆڤی موسوڵمانی زیرەك و هۆشیار ئەوە بزانێت کەدینی ئیسلامیی پیرۆز سەرتاپای عیبادەت و خواپەرستییەو گشت خاڵ و بەندو برگەو ئایەتەکانی قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەری مەزن ﷺ لەو حەقیقەت و ڕاستییە دەدوێن، چونکە دینی ئیسلام هەموو بەندو لقەکانی پێکەوە گرێدراون، هەمووشی هەر دەبێ بەنیازو نیەتی خواوە بێت، ئەگینا نایەوێ و ڕەتی دەکاتەوە، ئیتر دووڕکات نوێژی مزگەوت بێت، حەج و عومرەیەك بێت، ڕۆژووی چەند ڕۆژێك بێت، وەیان دیفاع و بەرەوانی بێت لەدین و وڵات و زێدو نیشتیمان، یان بڵێین جیهادو خەبات و ڕووبەڕووبوونەوە بێت لەگەڵ داگیرکەران و فەساد گێڕەکان، وەیان سازش و سوڵح و ئاشتی بێت، وەیان مۆرکردنی ڕێککەوتننامەیەك بێت، ئەمانە گشت دین و خواپەرستین و دەبێت بۆ خوای گەورەبێت، بۆیە ئەگەر نوێژەکە لەبەر ڕازیکردنی دڵی (زەید)و (عەمر)بوو، لەبەر ئەوەبوو پێی بڵێن نوێژخوێنە، یان لەبەر بەرژەوەندییەك بوو کەبرای نوێژخوێن خۆی لەبەرچاوی گرتبێ، ئەوە دەکوترێتەوە بەڕووی خاوەنەکەیداو خوای گەورە نیازی بەو نوێژە نییە، هەروەها حەج و عومرەو نوێژەکەشی هەروەها جیهادو خەبات و سوڵح و سازشەکەشی، جا بۆ ئەوە مرۆڤ تووشی ئەو ڕیاو ڕووبینی و دوو ڕوییە نەبێ قورئانی پیرۆزو سوننەتی پێغەمبەر ﷺ زۆر دووپاتی ئەوە دەکەنەوە کە کارەکان گشت بۆ خوا بن و لەبەر خوا بکرێن، بەتایبەتی خێرو سەدەقەو لە خۆ فش کردنەوەو لە دەعیەو فیزکردن بەسەر مرۆڤە خێر پێکراوەکاندا، دیارە ئایەتی:﴿ قَوۡلٞ مَّعۡرُوفٞ وَمَغۡفِرَةٌ خَيۡرٞ مِّن صَدَقَةٖ يَتۡبَعُهَآ أَذٗىۗ وَٱللَّهُ غَنِيٌّ حَلِيمٞ ﴾ (البقرة: **٢٦٣**) یان ئایەتی: ﴿ ...لَا تُبۡطِلُواْ صَدَقَٰتِكُم بِٱلۡمَنِّ وَٱلۡأَذَىٰ ... ﴾ (البقرة: ٢٦٤) یان.. یان.. بۆ چەسپاندنی ئەو بنەما ڕاستەقینەیە، بۆ ئەوەیە مرۆڤەکان بەو پیاوەتی و خێرو چاکە کەمەیە نەبنە ئەڵقە لەگوێی دەوڵەمەندەکان و خاوەن داراییەکان، بۆ ئەوەیە هەتا شەخسیەت و کەسیەتی

هەژارەكان كەم نەكاو، خۆیان بەكەم نەزانن و، لەئەنجامدا بۆ مەرامی خۆیان بـەكاریان نــەهێنن، وەیــان بڵــێین: بــۆ مــەرامی سیاســیی بــەكار نــەهێنرێن، پێغەمبــەر ﷺ دەفەرمووی: كەسێك دەكەوێتە بەر سێبەری عەرشـی خـوا لەقیامەتـدا كـە سـەدەقەی كرد بەدەستی ڕاستی و دەستی چەپی پێی نەزانێ، واتـە: بیـداو بیكـاو كەسـەكە هـەر نەناسێ، بـەڵام لەگـەڵ ئەوەشـدا دەبـێ هەنـدێ شـت بـۆ ئـەوەی ببێتـە ڕەمـزو هێمـاو شیعارو دروشمی دینداری و بۆ ئەوەی خـەڵكی تـر چـاوی لێ بكـەن و دەوڵـەتیش پێـی بزانێـت، بـۆ نموونـە: ئەگـەر زەكاتـدەر زەكاتەكـەی بەئاشـكرا بـدات لەحاڵـەتی ئـاوادا قەیدی نییە، بەكورتی: ئەگەر مرۆڤەكە گەیشتە پلەی وەها مرۆڤ بەچاوەوە ببـێ، یـان بەچـاوەوە نـەبێ بەلایـەوە یەكسـان بێـت، ئـەوە ڕێـی پـێ دراوە كـە بەئاشـكرا خێـرو سەدەقە بكاو خەڵكی پێ ی بزانـێ، خـوای گـەورە دەفـەرمووێ: ﴿ إِن تُبْدُوا۟ ٱلصَّدَقَـٰتِ فَنِعِمَّا هِىَ ۖ وَإِن تُخْفُوهَا وَتُؤْتُوهَا ٱلْفُقَرَآءَ فَهُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ ۚ ... ﴾ (البقرة: ٢٧١) یـان دەفـەرمووی: ﴿ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَٰلَهُم بِٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ سِرًّا وَعَلَانِيَةً فَلَهُمْ أَجْرُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ وَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴾ (البقرة: ٢٧٤). یـــان دەفـەرمووێ:
﴿ إِن تُبْدُوا۟ خَيْرًا أَوْ تُخْفُوهُ أَوْ تَعْفُوا۟ عَن سُوٓءٍ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَفُوًّا قَدِيرًا ﴾ (النساء: ١٤٩).

ئــەم ئایەتانــەو چــەندین ئایــەتی تــرو فــەرموودەكان بەڕاشــكاوی ڕێ بەخــەیرو سەدەقەكردن دەدەن بەشێوەیەكی ئاشكراو بێ پەردە، بەڵام وەكو ئامـاژە كـرا خێـرو سـەدەقەی پەنامـەكی و نهێنـی گـەورەترو زۆرتـرە، جـا بـۆ زیـاتر ئاگـابوون سـەیری تەفسیری ئیبن كەسیرو قورتوبی بكەن.

بــەڵێ.. لــەدینی ئیســلامیی پــیرۆزدا خــەیرو ســەدەقەو مزگــەوت درووســتكردن و نەخۆشخانەو قوتابخانەو چاككردنی ڕێگاوبان و جادەو كۆڵان و خزمەتگوزاریەكانی تر، ئەمانە گشت ئەركی سەرشانی دەوڵەتن و دەبێ دەوڵەوت پێیان هەستێت بـێ ئـەوەی منەت بخاتە سـەر خـەڵكی گـەڕەك، یـان خـەڵكی گوندەكـە، خـۆ ئەگـەر ئیمكانیـاتیش هەبوو بەڵام لەبەر هەر هۆیەك خۆی پێش چاوی گرتبـوو كارەكـانی نـەكردو پشـتگوێی

خستن، ئەوە لەدونیاو لەقیامەتدا بەرپرسە، لەدونیادا دەوڵەتی وا حەقی (سەمع و تاعە)ی نیەو پێویستە کودەتای لیّ بکرێت و لەوڵات نەهێڵرێت، لەقیامەتیشدا خوای گەورە تۆڵەو جەزرەبەی دەدات، لەبەرامبەر ئەو درێغی و کەمتەرخەمیە کە لەگەڵ خەڵکاندا کردوویەتی، دەوڵەت دەبێت لەژێر بنەمای ئینسانیەتدا کارە خزمەتگوزاریەکانی پێشکەش بکات: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقۡنَٰكُم مِّن ذَكَرٖ وَأُنثَىٰ وَجَعَلۡنَٰكُمۡ شُعُوبٗا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓاْۚ إِنَّ أَكۡرَمَكُمۡ عِندَ ٱللَّهِ أَتۡقَىٰكُمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٞ ﴾ (الحجرات:١٣) ئینتیمای حیزبی و بەحیزبیکردن و کڕینی مرۆڤە بیّ دەرامەتەکان لەدینی ئیسلامدا ڕەفزەو وەلا نراوە، بەرژەوەندی مرۆڤەکان هەندیّ جار پێش دەخریّ بەسەر بەرژەوەندیەکانی خانەی خواو مزگەوت و جێگا پیرۆزەکاندا، بۆ نموونە: گەڕەکێك موسایی نشین، یان عیسایی بێت و جادەیەکیان بۆ بچێت، بەڵام مزگەوتێك پێشتر کرابێت و ئێستا ببێتە ئەستەنگ و کۆسپ لەبەردەم گەیاندنیدا، لەقۆناغی ئاوادا ئەمە ناخوێنرێتەوەو، ئەم مزگەوتە هی موسڵمانەکان و ئەم جادەو شەقامە بۆ موسایی و عیسایی دەبێت، نابێت دەستکاری مزگەوتەکە بکرێت! بەڵکو دەبیّ بەپێی پێویستی جادەکە مزگەوتەکە دەستکاری بکرێت، ئەگەر هەموویشی ڕوخێنرابێت، هەتا ئەو کۆمەڵە مرۆڤە دین جیاوازە لەکارە خزمەتگوزاریەکان بیّ بەش نەبن،

نە هەر ئەوەندە بەڵکو لەتەواوی کارە سیاسیی و کۆمەڵایەتی و ئابوری و فەرهەنگیەکاندا وەکو موسڵمانەکان خاوەن مافن و حەقی ژیانیان هەیە، (لهم ما لنا، وعليهم ما علينا).

* لە ئیسلامدا بۆ ئەوەی دەستەو بەستەیەك زاڵ نەبن بەسەر خەڵکانی ترداو بەهەندیّ کاری چاك و پیاوەتی چاو لەبەریان نەکەن، دەبیّ تەنانەتی زەکات کە فەرزێکی خواییە دەوڵەت خۆی هەستیّ بەخەملاندنی و کۆ کردنەوەیی و پاشانیش دابەشکردنی بەسەر ئەو حەوت تاقمەدا خوای لەکارزان خۆی بەئایەتی ﴿ إِنَّمَا ٱلصَّدَقَٰتُ لِلۡفُقَرَآءِ

﴿وَٱلْمَسَـٰكِينِ ... ﴾ (التوبة: ٦٠) لەسورەتی تەوبەدا دیاریی کردوون، هەتا لەلایەن خاوەن ماڵەکەوە ئەو مرۆڤە هەژارو دەستکورت و قەرزارو تێکۆشەرانە.. (ئیستغلال) نەکرێن و نەبنە ئامێرێک بەدەستی سەرمایەدارەکانەوە مەبەستیان لەهەر هێرشیکدا بوو بەکاریان بهێنن!

* مەسەلەی کێشەی نێوان عەلی کوڕی ئەبو تالیب و موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیان خوا لێیان خۆش بێت لە شەهیدکردنی عوسمانی کوڕی عەففانەوە سەری هەڵداو پەرەی سەندو گەورە بوو، کاتێك عوسمان "خوا لێی خۆش بێت" شەهید بوو موعاویە ویستی بەزوویی و خێرایی و بێ تەفرە، تۆڵە بکرێتەوەو بکوژەکانی دەستگیر بکرێن و تۆڵە بدرێن، لەو ڕوانگەیەوە سەیری مەسەلەکەی دەکرد کە عوسمان مرۆڤێکەو بێ تاوان شەهید کراوە، کەوابوو دەبێ تۆڵەکەی دوا نەخرێ، ئیمامی عەلیش وەکو ئەوە کە خەلیفەیەو هەموو کاروبارێکی موسڵمانانی لەبەر دەستدایەو دەبێ لەهەموو کارێك کە سەر بکێشێت بۆ کێشەو ناکۆکی و فیتنەو ئاژاوە، بیانپارێزێ و لەبەر ئەمانەو دەیان ئیعتباری تر لەو ڕۆژەدا، ئەو قۆناغەی بە شیاوو موناسیب نەزانی، دەست داگرێت بۆ بکوژەکان و تۆڵەیان لێ وەرگرێت، بەڵکو وای بیر کردەوە کە پێویستە جارێ دام و دەزگا دەوڵەتیەکان تۆکمەتر بکرێن و بەباشی دا بمەزرێن، ئەوسا دەست ڕاکێشێت بۆ ئەو مەسەلەیەو دەیان مەسەلەی تر، ئا لەو قۆناغەدا بەئاسانی بۆی نەدەکران، هەر ئەمەشە زاناکانی ئیسلام ئەو کێشەیە بەکێشەی دوو موجتەهید دەزانن، کە هەردوو زاناو خوێندەوارو موجاهیدو ماندوون بۆ ئیسلام، ئەوە (عەلی کوڕی ئەبی تالیب) هەر بەمنداڵی لەگەڵ پێغەمبەردا بووە و، هەر منداڵ بووە دینی ئیسلامیی قبوڵ کردووەو هەر لەو ڕۆژەشەوە لەخزمەتی پێغەمبەردا خەریکی وەرگرتن و فێربوونی زانست و زانیاریەکانەو تا وای لێ هات ئەم ڕیوایەتەیان بەدەمی پێغەمبەری خواوە ﷺ گێڕایەوە: ((أنا مدينة العلم وعلي بابها))[٤٦]، هەرچەندە فەرموودە ناسەکان

(٤٦) حديث موضوع/ أنظر: السلسلة الضعيفة للشيخ الألباني، برقم: ٢٩٥٥ – وصحيح وضعيف الجامع للألباني برقم: ١٣٢٢.

بەفەرموودەیەکی بێ بنەماوو دانراوی دا دەنێن، یان لەبارەی ژیریی و چارەسەرکردنی کێشەکان زۆر بەحەکیمانە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((أقضاكم علي..))[٤٧]، واتە: عەلی لەگشتتان ئەی هاوەڵان قازیترەو باشتر دەزانێت چۆن دادگایی نێوان خەڵکی بکات و کێشەکان ببڕێتەوە، تەنانەتی بۆ دوایی ژیریی (عەلی) بوو بەپەندی پێشینان و هەر کێشەیەکی زۆر ئاڵۆز سەری هەڵدایەو سەخت بوایە چارەسەری دەیانگوت: (معضلة ولاأبا حسن لها)..هتد.

(موعاویە)ش یەکێکە لە نووسەرەکانی وەحیی و سروش، کاتێك کە قورئان دەهات پێغەمبەری خوا ﷺ متمانەی بەچەند کەسێك هەبوو ئەو ئەرکە گەورەیان بدا بەسەرا (نوسینی قورئان و هەڵگرتنی) لەسەرەتاوە، دیارە ئەمە ئەوپەڕی متمانەیە بە موعاویە، ببێتە نوسەری وەحیی و سروش بۆ دواییش هەوڵ و تێکۆشانی خۆی بۆ جیهادو بڵاوکردنەوەی دینی ئیسلام، دیارەو لەبەر چاوەو هیچ کەسێك ناتوانێ بیسڕێتەوە، تەنانەت عومەری کوڕی عەبدولعەزیز بەڕەحمەت بێت دەڵێت: (خۆزگە ئەو تۆزە بوومایە لە غەزاکاندا دەچوویە لوتی ئەسپەکەی موعاویە)! چونکە ئەم (سەحابە)یەو فەزڵی (سەحابە)ش هیچ شتێکی ناگاتێ، بۆیە مەولەوی شاعیر لە عەقیدەکەیدا دەڵێ:

(کافیە بۆمان سوننەت و کیتاب * أمسكوا إذا ذكر الأصحاب).

مەبەست ئەوەیە کە هەم لەقورئاندا هەم لەفەرموودەدا باس و فەزڵی گەورەیی هاوەڵان هاتووە، دەبێ ئێمەش دوای هەواو ئارەزووی خۆمان نەکەوین و گەزو پێوانەی شەریعەت پێوەر بێت، قورئان لەبارەیانەوە دەفەرمووێ: ﴿وَٱلسَّـٰبِقُونَ ٱلْأَوَّلُونَ مِنَ ٱلْمُهَـٰجِرِينَ وَٱلْأَنصَارِ وَٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُم بِإِحْسَـٰنٍ رَّضِىَ ٱللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا۟ عَنْهُ ... ﴾ (التوبة: ١٠٠). یان دەفەرمووێ: ﴿مُّحَمَّدٌ رَّسُولُ ٱللَّهِ ۚ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ أَشِدَّآءُ عَلَى ٱلْكُفَّارِ رُحَمَآءُ بَيْنَهُمْ ۖ تَرَىٰهُمْ رُكَّعًا سُجَّدًا يَبْتَغُونَ

(٤٧) الراوي:- المحدث:ابن تيمية، المصدر:مجموع الفتاوى، الجزء أو الصفحة:٤/٤٠٨، حكم المحدث:لم يروه أحد بإسناد صحيح ولا ضعيف، وإنما يروى من طريق من هو معروف بالكذب.

فَضۡلٗا مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضۡوَٰنٗاۖ سِيمَاهُمۡ فِي وُجُوهِهِم مِّنۡ أَثَرِ ٱلسُّجُودِۚ .... ﴾ (الفتح: ٢٩). ئەمانەو چەندین ئایەتی تر ئەگەر سەیرێکی فەرموودەکانیش بکەین بە دەیان فەرموودەمان بەرچاو دەکەوێت لەبارەی فەزڵ و گەورەییانەوە، لەوانە: ((لا تسبوا أصحابي، فو الذي نفسي بيده! لو أن أحدكم أنفق مثل أحد ذهباً ما أدرك مد أحدهم ولا نصيفه))[٤٨].

بەڵێ.. هاوەڵان زۆر خاوەن فەزڵ و گەورەو مەزنن، من نامەوێ بەم پەلەیە هەرچی لە کتێب و حەدیسەکاندا هەیە بیهێنم و بینووسم، هەر کەسێ دەتوانێت خۆی سەرێك لەو کتێبانە بدات.، من لەم نوسینەدا دەمەوێت بڵێم پێغەمبەری خوا ﷺ هەرگیز ڕێگە نادات کە هاوەڵانی سەرجەم بەخراپە ناو ببرێن، چونکە ئەوان بەردی بناغەی ئەم دینەیان داناوە، ئەم زەویە دێمەی ئێمەش هەر بەوان پاراو بووە، کەوابوو نابێ هیچ کەسێکیش لەبەر خاتری ئەم و ئەو، ئەو ڕووداوە مێژووییانە بووروژێنێ و بە سوکایەتیی و شێوەی ناپەسەند ناویان بەرێ و وەك مامۆستای خاوەن کۆڕ بڵێت: (هەر لەسەردەمی عەلی و موعاویەدا ئایین بۆ مەرامی سیاسیی بەکار هات!) چونکە (سەلەف)و پێشنیانمان وا ناوی ئەو ڕووداوە دەبەن کە ئیجتهادێك بوو، لەنێوان دوو موجتەهیدا پێش هات و بە ئەنجامێکی باش نەگەیشتن، بەڵام عەلی کوڕی ئەبی تالیب بە حەقتر دەزانن و بۆچوونەکەی ئەو تەواوو لەبارتر بوو، چونکە ئەو لەوکاتەدا خەلیفەو ئەمیری موسڵمانان بووە و دەتوانێ بەپێی بەرژەوەندیی موسڵمانان کارەکان ئەنجام بدات، دەتوانێت تۆڵە لە بکوژەکانی (عوسمان) دوا بخات بۆ کاتێکی شیاوو گونجاو، لەوانەیە لەبەر هەندێ کێشەی ناوخۆیی سەرکەوتوو نەبێت و فیتنەکە گەورەتر بێت، ئەگەر ئەوڕۆ هەستێ بەئەنجامدانی تۆڵەکە، ئەگەرچی (موعاویە) پێی لەسەر ئەوە دادەگرێت کە: (دەبێ بەزوویی و بێ دواکەوتن تۆڵە بسێنرێت، ئێمە پێغەمبەر ﷺ پێمان دەڵێت لەو جۆرە کێشەو هەرایانە خۆ هەڵمەقوڵتێنن و بێ دەنگ بن لێیان، چونکە هاوەڵان خاوەنی ئەو هەموو جیهادو هەوڵ و تێکۆشانەن، کورتر

(٤٨) صحيح مسلم – كتاب فضائل الصحابة رضي الله تعالى عنهم، باب تحريم سب الصحابة رضي الله عنهم – حديث : ٤٧١٤ .

بڵـێین: موسـوڵمانانی پێشـوو ئـەو کێشـەی نێوانـەیان، بەکێشـەی نـاو دوو موجتەهیـد دادەنـێن و یـەکێکیان حـەقی پێکـاوەو ئـەویان نـەیپێکاوە، خـواش پاداشـی هـەردوولا دەداتەوە، بۆیە ئێمە ناتوانین بڵێین ئەو کارەیە بەکارهێنانی (ئـایین) بـوو بـۆ مـەرامی سیاسیی! ئێمە وادەزانین کردنی ئەو جۆرە قسانەو وروژاندنی ئەو باسانە لـەم کاتـەدا تـەنهاو تـەنها لەبـەر خـاتری چـەند کەسـێکی عەلمانیـەو دڵ ڕازیکردنـی دڵـی ئەوانـەو ڕووخانـدنی ئـەو کەسەیشـە کـە قسـەکانی پـێ دەکـەن، ئەمـە لەلایەکـەوە لەلایـەکی تریشـەوە ئەوانـەی پێشویشـمان ئـادەمیزادن و تووشـی هەڵـە دەبـن. ئەگەرچـی بەئیجتیهادیش بێت، حەق نیە بەو شێوە ساکارەیە سوکایەتیان پێ بکرێت، بەتایبەتی کەسێکی وەکو (عەلی کوڕی ئەبی تالیب) خەلیفەیەو پاراستنی ئەو دینەو ڕاگرتنی ئـەو وەزعـە لەئەسـتۆی ئەودایـە، دەبـێ هـەوڵی جیـدی بـدات بـۆ ڕاگرتنـی بارودۆخەکـە، هەوڵێکی ئاوا بۆ ڕاگرتنی هێوری و ئاسوودەیی نابێ پێی بگوترێت: بەکارهێنانی ئایینە بۆ مەرامی سیاسیی، ئێمە لەسەرمانە ئەو دینە کە خوای گەورە ناردوویەتی بەخۆیی و بەئامانجەکانیـەوە، بـێ دەسـتکاری و کورتکردنـەوە، نـابێ هـەر ڕۆژەی تـەئویل و تەفسیرێك بکرێتەوە لەبەر خاتری کاربەدەستانی ڕۆژگار، وەیان لەبەر زەمانە سـازی و خۆ سازاندن لەگەڵ دەسەڵاتداراندا!

ئینجا دەبێت بزانرێت هەدەف و ئامانج لەم کاتەدا لەئاوا کۆڕێك چیە؟! مـن وا دەزانم ئەمەش فێڵ و خیدعەیەکی تری عەلمانیەکانە بۆ بردنە دواوەوەی دین سەد ئەوەندەی تـر لەکۆمەڵگـەو دوورخسـتنەوەی دیـن و شـەریعەتی ئیسـلامیە لـە سیاسـەت و پچـڕاندنیەتی لـە دەوڵـەت و دەسـەڵات، دەیانـەوێ بڵـێن: هـەر جوڵانەوەیـەك بکرێـت لەلایـەن ئیسـلامیەکانەوە دژی سـوڵتەو عەلمانیەتـە، (بـەکارهێنانی ئـایین بـۆ مـەرامی سیاسیی کارێکی ڕەوا نیە، چونکە بۆ خوا نیە)، باشە! من لەو خاوەن کۆڕە دەپرسـم مەگەر ئیسلام (دین)و (دەوڵەت) نیە؟

مەگەر ئیسلام (دنیاو پاشەڕۆژ) نیە؟! ئەگەر وەڵام (نەخێر) بێت ئەوە پێی کافر دەبێت، خۆ ئەگەر وەڵام (بەڵێ) بێت دەپرسینەوە: ئایا هیچ شتێك بەدەست ئیسلامەوە ماوە؟ ئایا هەرچی زیانی عەلمانیەتی تێدا بێت، مۆڵەت بەموسڵمانان دەدرێت بیکەن؟

ئەگەر خەڵکێك مافی ئیسلام داوا بکەنەوەو بیانەوێ ئێستایش وەکو جاران ئیسلام دین و دەوڵەت بێت، ئایا ئەمە بەکارهێنانی دینە بۆ مەرامی سیاسیی؟! ئەوەی ئیسلام غەیرەز لە سوڵتەو دەسەڵاتدا ببینێتەوە، ئیتر ئەوی تری بەدین نەزانرێت، ئەمە بە دین نازانین هەرکەس بۆ خۆی لەمزگەوتەکەی خۆیدا نوێژ بکاو بۆنە ئاینیەکانیش ئەنجام بدات، بەڵام حەقی لە دانانی سەرۆك کۆمارو، دەستەی وەزیراندا نەبێت!! پێغەمبەری خوا ﷺ کە وەك حکومەت کاری دەکرد بۆ خۆی، پێغەمبەرو سەرۆك و فەرماندەی گشتی هێزی سەربازی بوو، دەستەی وەزیرەکانی و پەرلەمانەکەیشی (ئەبو بەکر) و (عومەر) و (عوسمان) و (عەلی) و (تەڵحە) و (زوبێر) بوو، گشت ساڵح و خواناس بوون، دەسا ئەگەر ئێستا داوای هەمان حکومەت بکرێتەوە، بەکارهێنانی دینە بۆ مەرامی سیاسیی؟!

* هێنانی پارەو ئیمکاناتی تر لەوڵاتانی کەنداو بۆ کوردستان و مزگەوت یان نەخۆشخانە، پاشان ریکلام و دیعایەو پڕو پاگەندە کردن لەلایەن ئەو کەسانەوە، یان لەلایەن ئەو گروپەوەو خۆ پێ هەڵکێشانی و دواتر داوای دەنگدان بۆ سندوقی موسڵمانان.. نازانم ئەمە چ خراپەو کارێکی ناشەرعی تێدایە؟ بەتایبەتی کە موسوڵمانان دەوڵەت و دەسەڵاتیان نەماوەو قودرەتی کردنەوەی تەنیا مزگەوتێکیان نیە، ئەگەر بەسواڵ و پاڕانەوە نەبێت لەم و لەو، لەولاشەوە عەلمانیەکان هەرچی پارەو ئیمکانیات هەیە لەبەردەستیاندایەو ئەو هەموو پرۆژانە دەکەن بۆ شارو گوند نشینەکان، ماوەیەکی تریش هەڵبژاردنەو ئەو خەڵکانەی لە دین تێگەیشتوون، دەیانەوێ دەنگ و ڕەنگێکیان هەبێ و هەر هیچ نەبێ سێ چوار کورسیەکیان هەبێ،

ئایا بەدەستی خاڵی و لات و ڕوت و قوت دەتوانێ بچێتە گۆڕەپانەوەو، داوای دەنگ و ڕا لە خەڵك بکەیت؟ لەپاڵ ئەو حیزبەدا خاوەنی هەموو شتێکە؟ بێجگە لە دەستکەوتی ناوەوە، هەر ڕێکخراوێکیش بێتە کوردستانەوە لە ڕێی ئەوانەوە دێت و هەرچیش بهێنن و بەهەر پرۆژەیەکیشی بکەن دیسان هەر دەچێتەوە گیرفانی ئەوان، ئاخۆ لە حاڵەتێکی ئاوادا بۆچی بۆ موسوڵمانان ڕەوا نەبێ بچن لەملاو لەولا سواڵ بکەن و بیهێننەوە کوردستان و دەیان نەخۆشخانەو قوتابخانەی پێ بکەن و، بۆ دواییش بیکا بەهەراو پڕوپاگەندە بۆ موسڵمانان، هەتا دەنگ و ڕەنگیان بەخەڵك بناسرێ و دەنگیان بۆ بدرێ، بەتایبەتی ئەمڕۆ کە موسوڵمانان بەشتێکی سەیرو سەمەرە دادەنرێن و، هیچ (مقومات)ی دەوڵەتیان پێوە نەهێشتووە! ریکلام و جاڕی وا بۆ دەبێتە ڕیاو حەرام و بۆ خوا نیە! بەڵام بۆچی مامۆستای خاوەن کۆڕ بەحیزبە عەلمانیەکان ناڵێت: ئێوە هەموو خەیرو بێرێکی دەرەوەو ناوەوە بۆ حیزبەکەی خۆتانی بەکار دێنن و، جەماوەری بێ دەرەتانتان یەخسیر کردووە بۆ خۆتان، مەگەر هەموو کەس نازانێ هەرچی شتە ئەمڕۆ لەدەست ئەو دوو حیزبەدایەو ئەوانیش بەئارەزووی خۆیان بۆ مەرامی سیاسیی خۆیان بەکاری دێنن! ئایا هیچ کەسێك دەتوانێ بچوکترین کاری دەستکەوێت، هەتا (ئینتیما)ی حیزبی نەبێ و شایەتمان بەجوامێریی و قارەمانێتیان نەهێنێ..؟!!

* مەسەلەی جیهادو چەك هەڵگرتن ڕووبەڕووی بەعس و فەتوای جیهاد دژ بەو بەعسیانە لەلایەن بزووتنەوەی ئیسلامیەوە بەڕابەرایەتی زانای ڕێزدارو خاوەنقەدر (جەنابی مامۆستا مەلا عوسمان) وا دەزانم زۆر جێگەی خۆی بوو و، کە لێنێکی زۆر گەورەی بزووتنەوەی ئازادیخوازی گەلی کوردی پڕ کردەوەو، شەرعیەتی بە مەسەلەی کورد دا، بەتایبەتی لای وڵاتە ئیسلامیی و عەرەبیەکاندا، ئەوان ماوەیەکی زۆر بوو پێیان وابوو کورد باغی و سەرکەشە لە حکومەتی شەرعیی ئەو سەردەمەی عێراق تێیدا دەژیا، لەگەڵ لایشەوە فەتوای کوشتنی گەلی کوردیان دەشەرعێنراو حەڵاڵ

دەکرد! بەهاتنی بزووتنەوەی ئیسلامیی و چەك هەڵگرتن دژ بەو ڕژێمە، ئەو گشت تەمو مژەی ڕەواندەوەو قەزیەی کورد لەنەتەوایەتیەوە بوو بەقەزیەیەکی ئیسلامیی کوردی، هەر بۆیە لەناو کوردستاندا زۆر ڕەواج و بایەخی درایە، هەم لەلایەن جەماوەرەوە هەم لەلایەن حیزبە کوردستانیەکانیشەوە، کەسێك نەبوو ئەو دەمە بزووتنەوەی پێ زەروورو پێویست نەبێ و، گلەیی هەبێ لێی، تەنانەتی مام جەلالی سکرتێری یەکێتی نیشتمانی ڕاگەیاندنی بزووتنەوەی بە تەواوکاری شۆڕشی کوردی داناو مەلابەختیاری ئەندام مەکتەب سیاسییش بە زەرورەتی ئەو سەردەمەی وەسسف کردوە!! ئیتر نازانم ئەو برا خوێندەوارە چۆن دەڵێ ماموستا مەلا عوسمان هەر چەکی هەڵ نەگرتایە باشتر بوو! بەڕای ئەو، ئەندامێکی یەکێتی زانایان بووبا لەڕاگەیاندنی بزووتنەوە باشتر بوو!

وا دەزانم ئەوەش ونکردنی جێ و ڕێی زانایانە، چونکە زانایان دەبێ (قائد)و ڕابەر بن، نەك (مەقوود)و فەرمانبەر، لەگەڵ ڕێزدا بۆ زانایان دەڵێم: ئایا ئەو هەموو زانایە لەژێر ناونیشانی یەکێتی زانایاندا کۆ بوونەتەوە دەتوانن تەنها ڕەخنەیەك لەهەر حیزبێك لەو حیزبانە بگرن کە یەکێتیەکیان بۆ کردوونەتەوە؟ گومان نیە، تەنها بۆ شەرعیەتدانە بۆ هەندێ مەسائیل کە لەبەرژەوەندی حیزبەکاندایە.!

سەیرو سەمەرە ئەمەیە کە ئەو موسوڵمانەی کاتی خۆی چەکی هەڵگرت و دژ بە بەعس جەنگاو خەباتی کرد، ئێستا کالآو بالآی قاچاغەو نابێ سەرو سیمای دیار بێت، بەڵام ئەوانەی پاڵیان لێ دابوویەوەو چەکیان لێ حەرام بوو، ئەمڕۆ بوونەتە کوێخای ئیسلامیەکان و، خۆیان بەکوێخا دەزانن و کارەکەیان بەکارێکی چاك دەزانن و ئەوانیش وەکو ماموستای خاوەن کۆڕ دەڵێن: ئەو چەکە هەر نەبوایە باشتر بوو، بە بەڵگەی ئەوە کە هەم ئەمریکاو هەم حیزبە کوردستانیەکان چەك بەباش نازانن بۆ موسوڵمانان، بەڵکو بەلای ئەوانەوە موسڵمانان دەبێ هەمیشە (تابع)و شوێنکەوتە بێت و قەد جارێ نابێ ململانێ بکات، بۆیە ئێستا حیزبە بێ چەکەکان بوونەتە کوڕە

گەورەو باش و ساڵح و نیشتمانپەروەر! چەکدارەکانیش بوونەتە خەڵکێکی لارو لاسارو دژ بەنیشتمان! لەوە دەچێت ئەو بەڕێزەش هەر لەوێوە قسەکانیان پێ کردبێت و چەواشە بووبێت! ئەگینە ئێمە دەزانین کە ڕاوبۆچوونی ئەو مامۆستایە لە (٨٠٪) لەگەڵ چەکدا بوو، بەڵام ئێستا کە بەئاماژەی دەرەوە ئیسلامیەکان خراونەتە کەنارەوەو (بڤە) بوون، خەڵکێکی زۆر -وەکو ئەو- کەوتوونەتە پاکانەو، وا خۆیان نیشان دەدەن کە هەر ئەوان دڵسۆزی دین و وڵات و نیشتمان بوون! دەسا خوای گەورە لە هەڵەو تاوانی هەموومان خۆش ببێت و نیەتەکانمان ساف بکات بۆ خۆی.

**وصلى الله وسلم وبارك على حامل هذه الرسالة العظمى،**
**سيدنا وقائدنا ومقتدانا محمد، وعلى آله وأصحابه المجاهدين المخلصين.**
**والحمد لله رب العالمين.**



# ئــەوەنــدە ڕکــەبەرێتــی بۆ ..؟!

وەڵامێکە بۆ وەڵامەکەی (جەلال ڕەووف ئەمین)

لەسەر بابەتی (ئازادی مرۆڤ لە ئیسلامدا) .

بە (٦) شەش بەش پێشکەش دەکرێت.

١٤٢٧/٦/٩ کۆچیی

٢٠٠٦/٧/٥ زایینــی

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

**بەشی یەکەم:**

مرۆڤ چەندە لە زانست و پیشەسازیی و تەکنەلۆژیادا سەرکەوێ و پێشەنگ بێت، ئەوەندە و، سەد ئەوەندە و هەزار ئەوەندە هێمان پێویستی بە ئەخلاق و (قییەم)ـە، ئەخلاق لە سیاسەتدا، ئەخلاق لەباری کۆمەڵایەتیدا، ئەخلاق لە پەیداکردنی نان و رزق و رۆزیی و ئابورییدا، ئەخلاق لە (قەڵەم) و پێنووسدا، ئەخلاق لە دیالۆك و ئاخاوتندا، ئەخلاق لە دەربرینی رەخنەو رەخنەکاریدا، ئەخلاق لەگەڵ بەرامبەردا، ئەخلاق لە لێکۆڵینەوەو توێژینەوەدا لە هەر بابەتێکدا، بنەماو رستەی: ﴿وإنك لعلى خلق عظيم﴾ هەموو شتێك دەگرێتەوە، بۆیە وادەزانم ئەوەندە کە بابایەکی (عەلمانیی) ئەشقیی و سەخڵەت دەبێ لە رای بەرامبەرەکەیی و تووشیی هەڵەو زیادە رەویی دەبێ، هەرگیز برایەکی ئیسلامیی نیوەی ئەوەندە خۆی ئەشقیی و سەخڵەت ناکات، بەڵگەی ئەوەیش نووسینی (عەلمانیە)کانەو قسە و ئاخاوتن و دیالۆکە لە میدیاکاندا .. توێژینەوە و لێکۆڵینەوە لە هەر بابەتێك دەبێ سنووری یاسایی خۆی نەبەزێنێ، بەتایبەتی ئەگەر کەسێك بییەوێ بەرامبەرەکەی قەناعەت پێ بکات، قورئان بە راشکاوانە دەفەرموێ: ﴿ فَبِمَا رَحۡمَةٖ مِّنَ ٱللَّهِ لِنتَ لَهُمۡۖ وَلَوۡ كُنتَ فَظًّا غَلِيظَ ٱلۡقَلۡبِ لَٱنفَضُّواْ مِنۡ حَوۡلِكَۖ.... ﴾ (آل عمـــــــران: ١٥٩) واتە: ئەگەر مرۆڤێکی دڵ رەق و توندو تۆسن و سەرکێش بای، بلاوەیان لێدەکردیی و کەست لە دەوردا نەدەما، بەلام ﴿ فَبِمَا رَحۡمَةٖ مِّنَ ٱللَّهِ لِنتَ لَهُمۡۖ .... ﴾ (آل عمران: ١٥٩) واتە: لە بەزەیی خودایە کە تۆ هێندە نەرم و نیانی لە گەڵیان.، لە یاساو (قییەم)ـی حیوارو دیالۆك، یان رەخنە دەربرین لە رای نەیاردا، خودا دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تَسُبُّواْ ٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ فَيَسُبُّواْ ٱللَّهَ عَدۡوَۢا بِغَيۡرِ عِلۡمٖۗ ... ﴾ (الأنعام: ١٠٨). واتە: دەربارەی ئەوانە کە داوای یارمەتی لە غەیری خودا دەکەن، یان بتان دەپەرستن قسەو ئاخاوتنی خراپ مەکەن، چونکە لەوانەیە ئەوانە بە نەزانی، لەبەر دژایەتی خۆیان، خراپ لەمەڕ خودا

بـــدوێن. یـــان دەفـــەرموێ: ﴿ وَلَا تُجَٰدِلُوٓاْ أَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ إِلَّا بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُ إِلَّا ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ مِنۡهُمۡۖ ... ﴾ (العنكبوت: ٤٦) واتـە: ئەگـەر لەگـەڵ ئـەهلی کیتـاب دەکەونـە وتووێـژەوە، بەوپـەڕی نـەرم و نیانیـەوە قسـەیان لەگـەڵ بکـەن، مەگـەر ناهـەقیکارانیان. یـان دەفەرموێ: ﴿ ... وَإِنَّآ أَوۡ إِيَّاكُمۡ لَعَلَىٰ هُدًى أَوۡ فِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٖ ﴾ (سبأ: ٢٤). واتـە: ئێمـەو ئێوەش یان بەرەو خودا شارەزاین، یان ئاشکرا لە ڕێی خودا لامان داوە، ئایەتی: ﴿ قُلۡ يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ تَعَالَوۡاْ إِلَىٰ كَلِمَةٖ سَوَآءِۭ بَيۡنَنَا وَبَيۡنَكُمۡ أَلَّا نَعۡبُدَ إِلَّا ٱللَّهَ وَلَا نُشۡرِكَ بِهِۦ شَيۡـٔٗا وَلَا يَتَّخِذَ بَعۡضُنَا بَعۡضًا أَرۡبَابٗا مِّن دُونِ ٱللَّهِۚ ... ﴾ (آل عمران: ٦٤). ئەی ئەهلی کیتاب ! دەسا وەرن ئێمەو ئێـوە لەسـەر ئـەو قسـەیە سـوور بـین، کـە بـۆ هـەموومان وەك یەکـە: غـەیرەز خـودا نەپەرستین، شەریکی بۆ پەیدا نەکەین، نەچین هەندێکمان هەندێکیان - جیا لە خـودا- بۆ پەرستن هەڵبـژێرین. یـا دەفـەرموێ: ﴿ فَمَنۡ حَآجَّكَ فِيهِ مِنۢ بَعۡدِ مَا جَآءَكَ مِنَ ٱلۡعِلۡمِ فَقُلۡ تَعَالَوۡاْ نَدۡعُ أَبۡنَآءَنَا وَأَبۡنَآءَكُمۡ وَنِسَآءَنَا وَنِسَآءَكُمۡ وَأَنفُسَنَا وَأَنفُسَكُمۡ ثُمَّ نَبۡتَهِلۡ فَنَجۡعَل لَّعۡنَتَ ٱللَّهِ عَلَى ٱلۡكَٰذِبِينَ ﴾ (آل عمران: ٦١). ئەمانەو دەیان ئایەت و فەرموودەی تر کـە مـرۆڤ فێـری شێوەی دیالۆك و ئاخاوتن لەگەڵ دۆسـت و نـەیاردا دەکـەن. ! هەقـە هـەموو کەسـێکی توێـژەر بـەهرەیان لێـوەرگرێ و لـەکاتی توێژینـەوەدا شـعورو هەسـتی بەرامبەرەکـەی بریندار نەکات، هەقە ئەو بیروباوەڕە هەڵیگرتووەو لای بەڕێزە، بـەڕێزەوە نـاو ببرێـت، هەتا گوێ بـۆ بگـرێ و بەڵگـەکان وەرگـرێ، جـا ئەگـەر تـۆ توانیـت ئـەو بیروبـاوەڕەی هـەڵیگرتووە —بـە بەڵگـە- لـەق بکـەیت و ئـەویش قەناعـەتی کـرد، ئـەوە بـە ئـەنجام گەیشـتوویت، خـۆ ئەگـەر لەسـەر بیرووبـاوەڕی خـۆی مایـەوەو دژایـەتی ئیسـلام و موسڵمانانی نەکرد، لەحاڵەتی ئاوادا نابێ هیچ کەسێك لە گوڵ کاڵتری پێ بڵێت.

جا لێرەوە دەمەوێ بە کاك (جەلال ڕەئووف ئەمین) بڵـێم: گرتنـە بـەری ئـەو شـێوەو شێوازە بۆ دیالۆك و حیوار، شێوەو شێوازێکی هەڵەو ناراستە، وە لە هـەر (ئـەخلاق) و (قییەم) ێکی توێژینەوە و لێکۆڵینەوە دوورە، ئەگەرچی لەژێر پەردەی (ئـازادی)یشـدا

بێت لە تەعبیرو راو بۆچووندا، چونکە سەرەرای باسکردنی ئەو هەموو ئەدەب و ئەخلاقە لە ئایەتەکاندا - لەسەرەوە بۆ شێوەی حیوارو گفتوگۆ، هەموو ئازادییەك هەم لەلای ئایینە ئاسمانییەکان، هەم لەلای یاساکانی ئەمڕۆی دنیادا، سنوورو چوارچێوەیەکی هەیەو رێگا نادەن مرۆڤەکان لەبەر نەزانین و هەڵچوون و توڕەبوون یان لەبەر هەر حاڵەتێکی تر، سنوور ببەزێنن و چی بە خەیاڵیاندا بێت بیکەن و بیڵێن، بێگومانیش هەر لە کڕین و فرۆشتن، هەتا دینداریی و، هەتا دەوڵەتی و حکوومەتی کردن و پەیوەندی لەگەڵ دەرەوەو، بازرگانی و ئاڵووگۆری کاڵاو شمەکەکان .. هتد، هەریەکە یاساو شێوازێکی بۆ هەیە.. بۆیە نابێ گەنجێکی مەست و سەرشێت بەناوی ئازادییەوە رێی پێبدرێ سەر بکاتە خواردنی تلیاك و ماددە سڕکەرەکانی تر، دەوڵەمەندێکی بێ ویژدان و چکووسی چڵێسنیش، نابێ رێی پێبدرێ بازرگانی بە ماددە سڕ کەرەکانەوە بکات، خاوەن قەڵەمێك هەقی نییە ئەتکی (حرمات)ی هیچ دینێك، یان هیچ کەسایەتییەك بکات، دەتوانێ بەشێوەی (موناظەرە) و گفتوگۆو مێزگرد لە تەلەفزیۆن و میدیاکاندا - لەگەڵ رەچاوکردنی ئەخلاقیاتی دیالۆك - بڵێت، بەڵام قسەی ناشیرین و ئەتکی (حرمات) رێی نابێتەوە.

**لێرەیشەوە دەڵێین:** چواندنی ئیسلام بە (حوشتر) و، ئازادیش بە (قاپقاپ) .. هێرش و حەملەیەکی توندڕەوانەو بەزاندنی یاسای ئەدەب و وێڵ و ئەخلاقیاتە لە فەرهەنگی توێژینەوەو لێکۆڵینەوەدا، چونکە دینێکی گشتگیرو (کامل) و (شامل)و خاوەن پێگە لەلای هەزاران هەزار فەیلەسوف دکتۆرو پسپۆر لە بوارە جۆراوجۆرەکانی زانستیەکانی ئەمڕۆو قبوڵکردنی بە (دین)و رێباز بۆ خۆیان، یان بڵێین دینی ملیارو نیوێك مرۆڤ و دابەشبوونیان بە (قارە)کانی دنیادا (بەو جێگایەیشەوە کاك جەلالی) تێدایە، چواندنی (دین) و (معتقدات) ی ئەو هەموو مرۆڤانە بەحوشترو دانانیان بەگێل و نەزان و نەفام کەدینی وا قبوڵ دەکەن.. بەراستی کاری وا جەریمەو تاوانەو هێرشیشە بۆسەر تەواوی پێغەمبەران و شوێنکەوتوانیان.

باشە! ئەگەر ئازادی لە ئیسلامدا نەبێ، پێم ناڵێن ! لای کام حکوومەت و دەوڵەت و حیزب ئازادی هەیە؟ هەرکەسێك لەهەر وڵاتێکدا زیندەگی بکاو بژی و رەچاوی یاساو سیستمی ئەو وڵاتە بکات، بێشك دەتوانێت بۆخۆی دانیشێ و کەسیش ناوی نەبات، خۆ ئەگەر دەستی کردە کاری لاری و لاساری و قسە گوتن بە (موقەدەسات)یان، بێگومان لێی قبوڵ ناکرێ، ئەگەرچی لە (لەندەن) و (واشنتۆن) و (پاریس)یشدا بێت، تۆ باسی ئازادی دەکەیت و رەخنە لەو ئازادییە دەگریت کە لە ئیسلامدا هەیە؟! بێگومان ئەو تووڕە بوون و و رکەبەرایەتییەی ئێوە، خۆی بۆ خۆی بەرهەڵستییە لە ئازادیی، چونکە ئەگەر ئەمڕۆ دنیا دنیای ئازادیی لە توێژینەوەو دیالۆك بێت، ئیسلامییەکیش هەقیەتی چی لە هەگبەکەیدایە بیڵێ و رێی لێ نەگیردرێ، بۆچی (عەلمانییەك) لە میدیاکاندا بە ئازادانە ئاخاوتن بکاو نابێ هیچ لەمپەرێکیش رێی پێ بگرێت ؟ بەڵام ئەگەر ئیسلامییەك بیروو ڕاو بۆچوونی خۆی لە سیمینارێکدا، یان لە لاپەڕەیەکدا، یان لە (میحراب)ی مزگەوتێکدا دەربڕی، ژیانی خۆی و ماڵ و منداڵی بکەوێتە خەتەرەوەو لەملاو لەولاوە ئاگادار بکرێتەوە بەگرتن و مووچە بڕین و بێ بەشکردنی لە مافە سەرەتاییەکان هەرەشەی لێبکرێ؟! تۆ خۆت لەم مەسەلەیەدا (حەکەم) و دەمراست بە.. ئەوەی لە جنێونامەکەی (سێکس و شەرع و ژن لە مێژووی ئیسلامدا) هاتووە دەربارەی سووکایەتی بەخواو بە قورئان و بە پێغەمبەران و بە هاوسەرو خێزانەکانیان و بە خولەفای راشیدین و بە (عەشەرەی موبەشەرە)و، بگرە بە تەواوی موسڵمانان، لە وەزارەتی رۆشنبیرییەوە مۆڵەتی چاپ دراو پاشانیش کۆڕو سیمیناریان بۆ بەست و خوێندرایەوەو نووسەرەکەش خەڵات کرا.! ئەگەر ئیسلامییەك، یان (عەلمانییەك) بە تەنها وشەیەك سووکایەتی بە (کاك مەسعوود بەرزانی)، یان بە (مام جەلال) بکات، چۆن خۆی دەبینێتەوە؟ سەرەڕای ئەوە، کەهەر مۆڵەتیش نادرێت بگاتە چاپ و بڵاوبکرێتەوە.. خۆ لە مەسەلەکەی دوکتور (کەمال سەید قادر) ئاگاداریت کە چۆن بە (٣٠) ساڵ حوکم درا؟! خۆ ئاگاداری لە کوردستان

کە ئەمڕۆ رووگەی ئازادییەو چۆن خەڵکانی حیزبیی ماف و حقوقی خەڵکانی غەیرە حیزبیی دەهاڕن و پێشێل دەکەن.! خۆ دەزانی هەرکەسێك ئەندامی یەکێك لەو دوو حیزبە بالأدەستە نەبێ، چۆن بەهاوڵاتی پلەدوو و پلە سێ دادەنرێت؟ خۆ ئاگادرایت پارتی و یەکیەتی چ سووکایەتی و ناجوامێرییەکیان بە یەکتر کرد؟ وە لە جەنگەکاندا زۆر بێ ویژدانانە مامەڵەیان لەگەڵ دیل و کوژراوی یەکتردا دەکرد! چۆن هەزاران پێشمەرگەی ماندوونەناس و قارەمانیان لەناو برد بە شێوەیەك کە ئێستا بەکەڵکی باسکردن نایەت،! خۆ دەزانی ئەندامان و لایەنگران و ژن و منداڵی یەکتریان چۆن دەربەدەر دەکردو ماڵ و سامان و ئەملاك و خانوو زەویی و زارو باخ و بەرەیان تالأن دەکردن و فەتوای حەلألییان دابوو؟! خۆ دەزانی ئێستا چۆن (پەرلەمان) و (حکومەت) و دام و دەزگاکانی حکومەت بۆ پارتی و یەکیەتی قۆرخکراون و هەرکەسێك تەزکیەو (نامەی لێخۆشبوون)ی ئەوانی پێنەبێت، نە پێشمەرگایەتی و شۆرشگێڕی دەخوات، نە شەهادەو مەهادەی نرخی هەیە.؟!!

مەگەر ئازادی لە (ئەمەریکا) و (بەریتانیا) و (ئیسرائیل)دا هەیە؟ ئەوە (ئەمەریکا)یە بۆتە داشەهارەو هەقی بەخۆی داوە، پەلامار لە هەر ولأتێك بدات کە بریاری ئەوی لا پەسەند نەبێت؟! ئەی ئەوە (بەریتانیا) نیە لەماوەی تەمەنیدا هەر داگیرکەرو زۆردار بووە، مەگەر شۆرشەکەی (شێخ مەحموود) ئەو نەیروخاند؟ ئەوە (ئیسرائیل) نیە بە هەموو هێزو توانایەکیەوە نەتەوەیەك - وەکو فەلەستینیەکان- بچەوسێنێتەوەو دەیەوێ نیشتیمانیان بەتەواوی لێ زەوت بکات؟ واتە: بۆ دەبێ ئەوەندە لە ئیسلام بدوێن، کە هەتا نەکەوتبووە ژێر دەسەلأتی تورکەکان و ئەم عەرەبانەی ئێستا، هەموو نەتەوەیەك بەئازادی تێیدا دەژیا ؟!

* **مەسەلەی کۆیلە**.. مەسەلەیەکی کۆنی بەر لەهاتنی ئیسلامە بە هەزاران ساڵ، مێژوو شایەتی ئەو حەقیقەت و واقیعەیە .. پاشان کە ئیسلام هات سەدان چارەسەری دانا بۆ کەمکردنەوەیی و نەهێشتنی بەدەر لەوانیش بە دەیان بەڵگە، بە سەدان ئایەت

و فەرمووده هانی مرۆڤ دەدات بۆ ئازادکردن و کۆتایی هێنان بەو مەسەلەیە، خۆ ئاشکرایشە دۆزی چاکی دیت لەو پێناوەدا، بەلاّم چونکە یاساکە هی ئەم نیە کە بریاری هەلّوەشاندنەوەی بدات یان نەیدات، کۆیلایەتی کۆتایی نایەت لەناو گەلاندا، خۆ هەرکات گەلانی جیهان و دەوروبەر -کە لە بنەرەتدا ئەوان کۆیلایەتیان داهێناوە- هەلّیانوەشاندەوەو قەدەغەیان کرد بەتایبەتی لە جەنگەکاندا، وە دیلەکان نەکرانە کۆیلە، ئەوە ئیسلام بەر لە هەمووان پیرۆزبایی لێدەکات و هەلّیدەوەشێنێتەوە.

واتە: رێدان بە کۆیلایەتی مەسەلەیەکی (المعاملة بالمثل)ـە، دکتۆر (محمد خير هيكل) لەکتێبی (الجهاد والقتال فی الشريعة الإسلامية) دا دەلّێت: (و معنى هذا، أنه إذا توقف الأعداء عن استرقاق من يقع فی الأسر عندهم من المسلمين فی حالة الحرب لايجوز شرعا بناء على المعاملة بالمثل، أن يضرب المسلمون الرق على من يقع في أسرهم من أهل الحرب). وە بۆ پشتگیری لەم راوبۆچوونەی خۆی دەلّێت: (أنظر على سبيل المثال: الشريعة الإسلامية والقانون الدولي العام: علي علي منصور (ص ٣٣٣) . وحقوق الإنسان بين تعاليم الإسلام وإعلان الأمم المتحدة (للغزالی: ص١١٣). وفقه السنة (للسيد سابق: ٦٨٨/٢). والعلاقات الدولية فی الإسلام (للشيخ أبی زهرة: ص١١٦) ومفاهيم إسلامية (للشيخ محمد حسن ألباسين/ ص٦٤). و عبارة أبو زهرة: ((إن كان الأعداء يسترقون كان للمسلمين أن يسترقوا من قبيل العاملة بالمثل، وإن كانوا لايسترقون فلا يحل للمسلمين أن يسترقوا، لأن ذلك يكون إعتداء، وهم منهيون عنه)) العلاقات الدولية ص١١٦ .

هەروەها دکتۆر دەلّێت: (هل يجوز استرقاق السبي في الإسلام، في عصرنا اليوم ؟ إن الجواب عن هذا السؤال يتوقف على معرفة هل أقر الإسلام الإسترقاق للسبي حين أقام دولته، وحارب أعداءه، بناء على العاملة بالمثل، فی وقت كان فيه نظام الإسترقاق بصورة عامة من الأنظمة القديمة المألوفة في العالم، حتى ظهور الإسلام) دوایی- بۆ چەسپاندنی ئەوە کە بەر لەهاتنی ئیسلام کۆیلایەتی هەبووەو باو بووە- دەلّێت:

(أنظر: الوحي المحمدي: (للسيد رشيد رضا (ص٢٥٢). والفلسفة القرآنية لعباس العقاد (ص٨٢-٨٣) والإسلام والإستبداد السياسي (للشيخ محمد الغزالى (ص١٢٣). والشخصية الإسلامية (ص٣/٢٣٨) للشيخ تحى الدين لبنهانى) لەگەڵ چەند کتێبێکی تر. هەروەها بەڕێز دکتۆر زەڵمی دەڵێت:(منابع الرق كثيرة، أهمها:

١- أسرى الحرب.

٢- القرصنة والخطف والسبي. وسادت هذه الطريقة عند الإغريقيين، فالأمة الإغريقية التى أنجبت العظماء من الفلاسفة كسقراط وأفلاطون وأرسطو وغيرهم.. كانت تحسب الإسترقاق من مظاهر الطبيعة والحضارة...)

لەنووسینی ئەو بەڕێزانەوە دەرکەوت کەکۆیلایەتی وەکو گوتمان بەر لە هاتنی ئیسلام هەر هەبووەو کاری پێکراوە، ئیسلامیش - پاش هەوڵێکی زۆر بۆ نەهێشتنی و وەلانانی- وەکو (المعاملة بالمثل) کاری پێکردووە، بەڵام هەرکات دەوڵەتانی شەڕفرۆش کۆیلایەتیان هەڵوەشاندەوەو نەیانهێشت، واتە: دیلەکانی جەنگیان نەکردنە کۆیلە، ئەوە ئیسلامیش بەر لەهەموان پێشوازی لەو بڕیارە دەکاو کاری پێدەکات.

کەوابوو ئەگەر کۆیلایەتی (خوێرایەتی) بێت، وەکو کاک (جەلال)ـ دەڵێت، ئەوا ئەو خوێرایەتییە ئیسلام نەیهێناوە، بەڵکو خەڵکانی شەڕفرۆش بەر لە ئیسلام هێناویانەو، ئیسلامیش کە هاتووە کەوتووەتە ناو ئەو واقیعەوەو ناچار بووە — وەکو (المعاملة بالمثل) کاری پێبکات، ئینجا ئەگەر ئەمڕۆ یاساکانی هەموو دنیا کۆیلایەتی حەرامکرد، ئەوا لە ئیسلامیشدا کاری پێناکرێ و بە هەتا هەتایە قەدەغە دەکرێ، مەگەر لەناو دەوڵەتاندا هەڵبداتەوە، دیسان ئەوسا ئیسلامیش ناچار دەبێتەوە وەکو بەرامبەرەکەی کاری پێبکاو بیکاتە گوشارێك بۆ سەر دوژمن، بەڵکو پەلامار و حەملەکەی راگرێت و کۆتایی بە جەنگەکەی بێنێت.

**چپەیەک**: لە کاك جەلال دەپرسم: هێشتنەوەی یاسای کۆیلایەتی و بەکۆیلەکردنی دیلەکان، باشتر نیە لەگرتووخانەکانی (ئەبووغرەیب)، وە (بەعقووبە)و (گوانتانامۆ)ـی

گەورەترین هێزو دەسەڵاتی دنیا (ئـەمریکا)، مـاف لێـدەری دیموکراسـیی و عەداڵـەت؟ چی بەو زیندانیانە نەکرا..؟ لە کارەبا لێدانیان و سەگ بەردانە گیانیان و هەڵواسینیان و کاری جینسیی و سێکسـی پێکردنیـان لەگـەڵ یـەکترو، تـەجاوزی جینسـیی لەلایـەن ئەمریکییەکان خۆیانەوەو پەتخستنە میلیان و ژنە سەربازێکی ئەمریکی رایانکێشێ..! ئەمەو سەد ئەوەندەی تریش..؟

هیوادرام بەچاوی ئینسافەوە ئەم چەند دێڕە بخوێنیتەوەو توڕەییەکەت بخەیتە لاوە، تۆڵـەی ئـازارو ئەشـکەنجەدانی کـوردان و بـە (ئـەنفال) کردنیـان لەلایـەن بەعسـی نەحلەتییەوە نەخرێتە سەرشانی ئیسـلام، بێگومانبـە دەوڵـەتان خۆیـان بـێ ویـژدان و دڕندەن، ئەگینا ئەی بۆ کوردەکانی روسـیاو ئێسـتای تورکیـای (عـەلمانیی) تەنانـەتی زمانیشیان لێ قەدەغەیە، مەگەر ئەویش هەر بە فرمانی ئیسلام بووە، یان عەلمانیەت؟ ئایا کاتێك کە کورد پارچە پارچە کرا، بەفرمانی ئیسلام بوو، یان بەفرمانی زلهێزەکـان بـوو؟ ئـەی ئێسـتا هـەر لـە دانـانی پەرلـەمان و حکومەتـەوە، تـا نـەوت و گشـت موشتەقاتەکانی تری، هەمووی بەدەست ئەمریکییەکانەوە نیە،؟! جا ئـەوە ئازادییـەو ئافەرین و چەپڵەی دەوێ ..؟؟!!

**بەشی دووەم:**

سووکایەتیی و شەڕە جنێو شتێکەو، ئـازادیی بـۆ مـرۆڤیش شـتێکی تـرە، مـرۆڤ بـە ڕێـزو بـە حورمـەت و خـاوەن قـەدر خولقـاوە.. ﴿ وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِيٓ ءَادَمَ ... ﴾ (الإسراء: ٧٠) مەسخەرەو لاقرتی و گاڵتە بە ئینسانەکان بە نووسین، وە یان بە هەر جۆرێکی دی لـە میدیاکاندا شتێکەو ئازادیش شتێکە .. ئازادی بە هەموو جۆرەکانیەوە — لـە سـنوور و چوار چێوەی خۆیدا — دراوە بە مرۆڤ، وەکو ئەو پینج خاڵە (بەندەی خوا) بـە نموونـە لـە گوتارەکەمـدا (ئـازادی مـرۆڤ ..) هێنامـەوە.! بـە کـەم بـەهاو سـووك دانـانی و تەماشاکردنی مرۆڤ بە هەر شێوەیەك حـەرام و قەدەغەیـە: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا يَسۡخَرۡ قَوۡمٞ مِّن قَوۡمٍ عَسَىٰٓ أَن يَكُونُواْ خَيۡرٗا مِّنۡهُمۡ وَلَا نِسَآءٞ مِّن نِّسَآءٍ عَسَىٰٓ أَن يَكُنَّ خَيۡرٗا مِّنۡهُنَّۖ وَلَا تَلۡمِزُوٓاْ أَنفُسَكُمۡ وَلَا تَنَابَزُواْ بِٱلۡأَلۡقَٰبِۖ ... ﴾ (الحجرات: ١١).

ئەوەی ئەمڕۆ لە میدیاکاندا بە یەکتری دەکرێ و ڕێی پێدەدرێ بۆ دامرکانەوەی کـەف و کوڵی چەوساوەکان، پاشان پشتگوێ خستنی داخوازیەکانیان و بگرە هـەر کەسـەش ڕەخنـەی گرتبـێ لێکۆڵینەوەشـی لـە گـەڵ دەکـرێ ! بێگومـان ئـەوە حیلـەو فێـل و فەرەجێکە زلهێـزە دکتاتۆرەکـان دایـان هێنـاو، پاشـانیش (مقلد)ـەکانی لای خۆمـان قۆزتوویانەتەوە، بازاڕی ڕۆژنامەو تەلەفزیۆنی حیزبەکەیانی پێگەرم دەکەن و دەیکەنـە مونافەسـەی حیزبـی و مەردمەکـەی پـێ فریـو دەدەن و لـە خشـتەی دەبـەن.! لـە کوردسـتاندا — خـۆت دەزانـی — ناتـەواویی و کـەم و کـورتی لـە خزمەتگوزاریـە سەرەتایەکانی ژیاندا زۆرە (وەکو جادەو شەقام و ڕێککردنـی کـۆڵان و مسـۆگەرکردنی ئاوو کارەبا و مەسکەن..) جا بۆ پەیداکردنی هەر یەك لەمانە، ئەگەر جەماوەر بییەوێ خۆ نیشاندانێك سازبدا بەرهەڵسـتی دەوەسـتن و ڕێـی پـێ نـادرێ، چـونکە دەسـتێکی ڕەش وا لە پشتیەوە وەکو ئەوان دەڵێن!

لە هەندێ جێگاشدا سەرە رای وەڵام نەدانەوەی داخوازیەکانیان، بە گوللـەو لێـدان و داپڵۆسان و پاشان قاچاخبوونی خۆنیشان دەرەکان بە بیانووی تێکدانی (ئەمنییـەتی

ناوچەکە) ! بە ناوی میمبەری ئازادیی، یان سەکۆی ئازادیی، یەك هەفتە لەسەر یەك وەزیر دوای وەزیر دەنێدرایە دەڤەرەکە، خەڵکانیش لەو سەکۆی ئازادییەدا کەف وکوڵی خۆیانیان دامرکانەوە، بەڵام پاش ئەوە بپرسەو ببینە..؟!.

*** سەبارەت بەناونانی منداڵ** کە ئێوە رەخنەتان گرتبوو لە هەندێ ناوو ئاخاوتنی بەندەی خودا.. پێغەمبەری ئازیزو پێشەواو رابەرمان (محمد ﷺ) لە فەرمووده گەلێکدا دایك و باب و سەرپەرستی منداڵان هان دەدات بە دۆزینەوەی ناوی پیرۆز و خۆش و مانا بەخشی باش بۆ منداڵ، وە گەلێك لەو ناوانەی گۆڕیی کە لە سەردەمی جاهیلیەتدا هەبوون، بۆ نموونە: ئیمامی (ترمزی) لە خاتوونە عائیشەوە دەڵێ: ((کان ﷺ يغير الإسم القبيح))[٤٩] واتە: پێغەمبەر ﷺ هەمیشە هەوڵی دەدا کە ناوی ناخۆش بگۆڕێ بە ناوێکی خۆش. (ترمزیی) و(ئیبن ماجە) لە (عبداللە ی کوڕی عومەر – خ) دەگێڕنەوە کە: عومەر کچێکی هەبوو – بە ناوی (عاصیە) پێغەمبەر ﷺ گۆڕی بە (جەمیلە). هەروەها (عاصیی، عەتلە، واتە: توورە) شەیتان، غوراب، حەباب، حە رب) و چەند ناوێکی تر لەو بابەتەی گۆڕی بەو ناوانە کە مانای گەشبینی و خۆشگوزەرانیی و ئەمن و ئاسایش دەگەیەنن.! پێغەمەبەر ﷺ فەرمووی: ((تسموا بأسماء الأنبياء وأحب الأسماء إلى الله عبد الله وعبد الرحمن وأصدقها حارث وهمام وأقبحها حرب ومرة)) ئەبووداود.[٥٠]

لە ئیسلامدا ناوی پێغەمبەران و پیاوچاکان – ئیتر بە هەر زمانێك بن – پیرۆز و پەسەندە، ئەگەرچی باشترین ناو، ئەو ناوانەن مانای بەندایەتی بۆ خودا دەگەیەنن، وەکو بڵێیت: (عەبدوڵلاّ، عبدالرحمان، عبدالباری..) خۆ ئەگەر لەو ناوانە لادرا، دەبێ ناوێکی وابێت مانایەکی خۆش ببەخشێ و لە ئایندەشدا منداڵەکە پێی سەخڵەت و شەرمەزار نەبێ، وەکو (ژیان، ژین، شاد، یاد، یاس) ئەم جۆرە ناوانە هیچ عەیب و

(٤٩)صحيح، صححه الألباني في الجامع الصحيح لسنن الترمذي/ ٢٨٣٩ .

(٥٠) صحيح، صححه الألباني في سنن أبي داوود/ ٤٩٥٠ .

نەنگێکیان تێدا نییە، بەمەرجێ بە نییەتی دژایەتی لە ناوە عەرەبییە ئیسلامییەکان نەبێت.

دەربارەی ئەو چەند رستەیش لە کتێبی (پەروەردە لە ئیسلامدا)دا هاتووە و ئێستا تۆی سەخڵەت کردووەو، لەکاتی خۆیشیدا سەخڵەتیی منی پێوە دیارە (.. ئەمانە شار بەدەر بکرێن..) دڵنیابە هۆیەکی هەبووەو، (رد الفعل)ـە، حەز دەکەم بۆت باس بکەم بەر لە وەڵامەکە، دەبێ ئەو راستییە بزانیت کە ئیسلامی پیرۆز هیچ جۆرە ناوێکی فەرز نەکردۆتە سەر سەرپەرستیکاری منداڵ، بەڵکو لەبەر خاتری منداڵەکەیەو بۆ ئەوەیە دوایی خەفەت بە ناوەکەی نەخوا — ئەگەر ناخۆش بوو — گوتوویەتی: ناوێکی باشی لێ بنرێت و، لەناو ناوەکانیشدا هەر ناوێك بەندایەتی بۆ خوا بگەیەنێت وەکو (عبدالله، عبدالرحمان ..) ئەوە لەناو ناوەکانی تر بەرێزترە، ئێمەیش وەکو موسڵمان و ملکەچ بۆ فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ دەڵێین: هەقە موسڵمانان ناوی پێغەمبەران و چاکان و هاوەڵان بگرنەوە لەباتی (جوعەل، کەلب، جەحش، ... هتد) جا لەو سۆنگەیەوە دەبینین (محمد، احمد .. ئەبوبەکر، عومەر، مصعب، میقداد ..) لەناو منداڵی موسڵماناندا زۆرە، ئەمەیش مانای رەدکردنەوەی ناوی کوردی نیە، چونکە ئێمە خۆمان و دەوروبەرمان (صهیب، مقداد، خوبەیب)مان هەیە، هەر وەکو (شێنا، سەناریا، کۆچەر، خەندە، رێزان، شاد..) یشمان هەیە، بەڵام کاتی خۆی موسوڵمانێك ناوی منداڵێکی نا (مصعب) کەچی لە دائیرەی کەسێتی ناسین، بە چ دەردەسەریی و نارەحەتییەك ناسنامەیان دایە .. برایەك بۆی گێرامەوەو گوتی: خوا کچێکی داینێ و ناومان نا (سومەیە) پاشان لە دائیرەی کەسێتی ناسین لە هەولێر، چوارمانگ هێنایانیان و بردینیان و گوتیان: دەبێ ئەو ناوە بگۆرن بە (ئارەزوو)! ئێمەیش قبووڵمان نەکرد، بەڵام بۆ دوایی کە ناسنامەکەیان داینێ بە ئارەزووی خۆیان ناویان نابوو (ئارەزوو) و هیچ دەسەڵاتێکیشمان نەبوو، ئیتر با ئێستا کە بە ئاسانی دەیان (حمزە) و (ئوسامە) یان گۆری بەو ناوانەی خۆیان حەزی لێدەکەن! ئینجا من بە

(کاك جەلال) دەڵێم: ئایا کاری وا تۆزقاڵەیەك ئازادی لێدەبینرێ؟! ئایا ئەوە بانێك و دوو هەوا نییە، یان پێوانە بە دوو مەن نییە؟! ئەو خۆی حەزی لە چ ناوێ بێت ئازادە چۆنی ناو دەنێت، بەڵام ئەوەی ئێمە ناوی (ئیرهاب)یەو تەسکەرەکەی نادەنێ ! جا لە حاڵەتی ئاوادا دەڵێین: ئەوانە کە رێ لە ئازادی موسڵمانان دەگرن هەقە شار بەدەر بکرێن! ئەگەر بە ویژدانەوە سەیری هەردوو مەسەلەکە بکەیت، بێگومان دەڵێیت هەقتە بڵێیت: خوا ئەوانەمان لە کۆڵ بکاتەوە!

*** سەبارەت بە (جاریە و کەنیزە** کە پاشاو ئەمیرو سەرکردەکان پێکدێنن) گوایا ئیسلام رازی نییە وەکو تۆ دەڵێیت ئازاد بن و ببنە سەرکردەو حوکمران! سەبارەت بە ئازادبوونی کۆیلەو کەنیزەکان و هەڵوەشاندنەوەی کۆیلایەتی لە ئیسلامدا، لە بەشی یەکەمدا کەمێکمان لەسەر نووسی و پێویست بە دووبارە ناکاتەوە .. بەڵام کردنی کۆیلە بە (سەرکردەو ئەمیری وڵات).. ئەگەر سەیرێکی کتێبە باوەر پێکراوەکان بکەیت کە باس لە مەرجەکانی هەڵبژاردنی (ئەمیر) دەکەن، بەراشکاوی هیچ کامێکیان مەرجی وایان رەچاو نەکردووە کە (ئەمیر) نابێ کۆیلە بێت، بروانە کتێبی (الأحکام السلطانیة للماوردی) (٤٥٠ هـ)، وە لە کتێبە هاوچەرخەکانیشدا (الدولة القانونیة والنظام السیاسي الإسلامی للدکتور منیر حمید البیاتی) .. ئەو کتێبانەش – ئەگەر شتی وایان هێنابێت – ئەوە لە روانگەی داب و نەریتی کۆمەڵگەی ئەو سەردەمەوە دەڕواننە مەسەلەکە، تەماشا دەکەن کۆیلە لە کۆمەڵگاکەدا بە (ئەمر)و (نەهی) ئاغاکەی دەجوڵێتەوەو، هەرچی ئەو رێی نەدات ناتوانێ بیکات .. باشە! کەسێکی ئاوا دەشێ بکرێتە سەرکردەو ئەمیر، لە کاتێکدا ئەمیر دەبێ (سمع) و (طاعة)یان هەبێ بۆیی و هەیبەتی هەبێ لایان؟! ئەگینا خۆ لە باسی گوێرایەڵی کردن و فەرمان بەرداری ئەمیرەکاندا هاتووە: ((اسمعوا وأطیعوا وإن استعمل علیکم عبد حبشي کأن

رأسه زبيبة))[٥١]. بەدەر لەوە کە باوو نەریتی کۆمەڵگا کەم بەهای کردووەو (سەمع) و (تاعەت)یشیان نابێ بۆی.

**مەسەلەی کەنیزەش کە بەشێکە لە رەخنەکانت..** دەڵێین: سپاردنی کارە سیاسییە گرنگەکان بە ژنان، وەکو دکتۆر (مصطفى السباعي) دەڵێت: ژنان هەموو ئەهلییەتیەکیان تێدایە بۆ وەرگرتنی ئەو پۆستانە، بەلاّم شتێ رێگر بێ و ببێتە جێگەی تێبینی، لە دەستدانی کارە سەرەکییەکانیەتی، وکو سەرپەرستی ناو ماڵ و چاودێری منداڵان و وەلاّمدانەوەو جێبەجێکردنی مافی مێردایەتیی و ڕوونەدانی تێکەڵی ژن و پیاوی نامەحرەم، خۆ ئەگەر توانرا لە پاڵ ئەو کارانەی خۆیدا کارە سیاسییەکانیش بێ زیانگەیاندن پێیان جێبەجێ بکرێن، ئەوا پیرۆزە.

مەبەست لەو رستەیەش بۆتە جێگەی رەخنەتان کە ئەمە دەقە عەرەبییەکەیەتی دەڵێت: (إذا ولدت الأمة ربتها ((ربها)) ..) ئەمەیە کە هەر کات مەردوم لە باتی ژنانی ئازاد کەنیزەو جاریەیان مارە کرد - لەباتی ئازاد کردنیان – ئەوجا لەو رێگایەوە کەنیزە زۆربووو پەرەی سەند، وەکو لە چەند سەردەمێکدا کرایە باوو عادەت، دیارە ئەوە نیشانەی قیامەتە، واتە: زۆربوونی کەنیزەو کۆیلە نیشانەی هاتنی رۆژی رستاخێزە. پێغەمبەر ﷺ دەیەوێ ئەو خەڵکە لە مامەڵە کردن بە کۆیلەو بە جاریەوە دوور خاتەوەو ئەوند خۆ خەریك نەکەن بە کڕین و فرۆشتنیانەوە، بەڵکو لە باتی ئەوە هەوڵی ئازادبوونیان بدەن، دەشتوانی بۆ پتر دەرکەوتنی هەق و راستیی سەیری (فتح الباري) راڤەی (بوخاریی) بکەیت .

مەبەست لەو رستە ئەمەبوو نەك ئەوە کە ئێوە لێی حاڵیبوون، گوایا ئیسلام بەکەم نرخ تەماشای کۆیلەو کەنیزە بکات ! دەرەنجام کۆمەڵێ مافناس – لەبەر بەزەیی و روحم بە مرۆڤە بێچارەکان ببنە پارێزەریان ! ئیسلامیش بخرێتە قەفەسی تۆمەت و بوختانەوە و هەرەشەیش لە هەڵگرانی دینی ئیسلام بکرێت و بگوترێ: (دڵنیابن دنیا

---

(٥١) صحيح، صححه الألباني في سنن إبن ماجة/ ٢٨٦٠ .

ئاخری ئێوەیە) !. بێ سۆ بڕیارو هەرەشەی ئاوا، زۆر دوورە لە شارستانیەت و ئەو دیموکراسیی و ئازادییەی ئەمڕۆ دەهۆڵی بۆ لێ دەدرێ لێرەو لەوێ، ئەوانەی دیدو تێڕوانینیان بەو جۆرە بێ و وابیر بکەنەوە بەرامبەر بە موسڵمانان و وابزانن دنیا ئاخریانە، زۆر هەڵەن و زۆریش لە هەموو بنەمایەکی دیموکراسیی و ئازادی دوورن و، ئەوان دڵنیابن کە وەکو بەعسییەکان دنیا ئاخریان نزیکە، چونکە بەعسیش سەد ئەوندە هەرەشەو تۆقاندن و کاری ئیرهابیی و داپڵۆسان و گرتن و نان بڕینی خەڵکانی تێکۆشەری کرد، بەڵام سەرەنجام سەری خۆیان پان بوویەوەو فڕێدرانە زبڵخانەی مێژوووەوەو تا قیامەت نەحلەتیان بەدوادا دەچێت.

(ئیبن کەسیر) لە ڕووداوەکانی ساڵی (٦٥٦)ی کۆچیدا دەڵێ: (تەتار) کە هێرشیان کردە سەر بەغدای موسڵمانان، لە کوشتنی منداڵ و ژن و پیاو و هەرکەسێك دەستیان پێگەیشتبا درێغییان نەکرد! خەڵکەکەی تریش ئەوەی مابوو خۆی خزانبوویە ناو بیرە ئاوەکان و شیوو دۆڵ و گەلە خانی حەیوانات و ئاژەڵەکان و چەند ڕۆژێ نەیان وێرا بێنەدەرێ و دەرکەون، گەلێکیشیان چووبوونە ژوورو دەرگایان لە سەرخۆیان داخستبوو و تەتارەکان دەهاتن، یان دەرگاکانیان دەشکاند، وەیان ئاگریان تێبەردەدان و دەیانکۆشتن، شیاوی ئامارژە بۆ کردنە ئەوندەیان لێکوشتن لە کۆڵانەکانەوە لافاوی خوێن هەڵسابوو ! وە دەچوون دەرگای مزگەوتەکانیشیان دەگرت هەرکەسێکی تێدا بووبا شەهیدیان دەکرد، بەکورتیی: مەگەر تەنها جوولەکەو گاورو هەرکەسێك ئەوان پەنایان دابا، یان پەنای بە (ابن العلقمی) رافزیی بردبا، ئیتر ئەو بەغدای پایتەختی خیلافەتی موسڵمانانە، بووە وێرانەو کەسێکی وای تێدا نەما. !

مێژوو نووسەکان هەندێکیان دەڵێن: یەك ملیۆن کەس کوژرا، هەندێك دەڵێن: نزیکەی دوو ملیۆن کوژران، ئەم ڕووداوەش لە کۆتایی مانگی موحەڕرەمی ئەو ساڵەبوو ونزیکەی چل ڕۆژ کوشت وکوشتاربوو لە سەر خەڵکی بێ دیفاعی بەغداد، دەرەنجام خەلیفە (المستعصم بالله) لە تەمەنی (٤٦) ساڵیدا کوژرا. خۆ هەر ئەوە تاوان نەبوو

بەرامبەر بە موسڵمانان، بەڵکو لە ماوەی چارەکە سەدەیەك شیوعییەکانی (چین) و (رووس) ٢٦ ملیۆن موسڵمانیان شەهید کرد! ئەمە مشتێك بوو لە ئازادی مرۆڤ لە وڵاتە پێشکەوتووەکاندا کە کاك جەلال بە قیبلەیان دەزانێت،! بەڵام کوان چییان لێهات ئایا ناویان کوێر نەبووەو هەتا دنیا دنیا بێت نەحلەتیان بەدوادا ناچێت؟ دڵنییاین ئەوانەیش وا ئێستا لێمان بوونەتە نەوشیروانی عادل چارە نووسیان هەر ئەوەیە.!

لە کاك جەلال دەپرسم: ئایا کورد – کە ئێستا خەڵکێکی راکردوو هەڵهات و لە گۆڕەپانی کوردستان بوونەتە خاوەنیی و ئیسلامییەکانیش کراونەتە عەرەب و دەیانەوێ مامەڵەی بەعسسیەکانیان لەگەڵ بکەن – دەپرسین: بەر لە هاتنی ئیسلام کورد چ کییان و قەوارەیەکی سیاسیی هەبوو، تا بە هاتنی ئیسلام ئەو قەوارەیەی لێ زەوتکرابێ و درابێ بە موسڵمانان؟! یان دوای نەمانی خیلافەتی ئیسلامیی، زلهێزە داگیرکەرەکان چییان بۆ کورد کردو ئیسلام نەیهێشت ؟! ئەگەر دوای پارچە پارچە کردنی جیهانی ئیسلامیی و بەشبەشکردنی کوردستانی گەورە وەکو گۆشتی قوربانی، دەپرسین: ئەگەر لە باتی ئەوە هاتبان ناویان لە سەر نەخشەی گشتیی تۆمار کردبا و ناوو دەوڵەتیان بۆ دانابا، کێ هەبوو بڵێ: قبوولی ناکەین کورد حکوومەتی هەبێ و لەسەر نەخشەی گشتیی کوردستان بنووسرێت ؟!.

* **سەبارەت بە لێدانی منداڵ**، کاتێ تەمەنی دەگاتە (دە) ساڵ نوێژ ناکاو، ئێوەیش کردووتانە بە رەخنە ! زاناکانی پەروەردەی ئیسلامیی، پەروەردەو تۆڵە دەکەنە (٦) خاڵ:

**١ - ئاراستەو (تەوجیە):**

بوخاریی و موسلیم لە (عمر بن أبی سلمة) وە دەگێڕنەوە و دەڵێ: من منداڵ بووم و پێغەمبەر ﷺ چاودێری و بە خێوی دەکردم، لە وەختی نان خواردندا دەستم بە ناو خواردنەکەدا دەگێڕا، کامم پێباشبووبا دەمخوارد! پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((یاغلام !

سم الله، وكل بيمينك، وكل مما يليك))[٥٢] واتە: ئەی خولاَم ! کاتێ نـان دەخۆیـت، بـەر لەوە ناوی خودا بهێنە، بەدەستی راستت بخۆ، وەلە بەردەم خۆتەوە بخۆ.

**٢- دلۆڤانی و نەرم نیانی و بە لوتف بوون لە گەڵیان:**

بوخاریی وموسلیم لە (سهل بن سعد)ـە وە دەگێڕنەوەو دەڵێ: خواردنەوەیـەکیان بـۆ پێغەمبەر ﷺ هێنا ولێیخواردەوە، لە هەمانکاتدا خۆلاَمێـك لـە لای راسـتیەوە بـوو، لای چەپیشی خەڵکێکی بە تەمەن بوون، بـە پێـی ئـەو سوونەتەی خـۆی دایـناوە، هەقـە دوای خۆی لای راست بیخواتەوە ئەگەرچی تەمەنیشی کەم بێت، ئینجا پێغەمبـەر ﷺ بۆ فێرکردن و راهێنانی خولاَمەکە پێی فەرموو: ((أتأذن لي أن أعطی هـؤلاء)) ؟ واتـە: رێم پێ دەدەیت بەر لە تۆ بیدەم بەوانە ؟ خۆلاَمەکە — کە ئیبن عەباس بوو — گـوتی: نەخێر، سوێند بە خـودا ئـەوی لـە تـۆوەوە بـۆم بمێنێتـەوە نایـدەم بەکـەس ! دیـارە دەیەوێ خۆی لە پاش ماوەکەی پێغەمبەر ﷺ بخواتەوەو پیرۆز بێت، پێغەمبـەریش ﷺ وەکو هەقێك خواردنەوەکەی دایە دەستی منداڵەکە. ! بەڵێ رێـز گـرتن لـە منـداڵ و لـە داخوازیـەکانی منـداڵ ئـاوا دەبێـت، پـەروەردەو هـەق و مـافی منـداڵان ئـاوا دەدرێ، بامناڵپارێزان چاو لە پێغەمبەر ﷺ بکەن .

**٣- لە کاتی هەڵە کردندا ئیشارەو ئاماژەی بدرێتێ ..**

**٤- تەوبیخ و سەرزەنشت بکرێ..**

**٥- ئاخر جـار ئەگـەر هەرکارەکـەی نـەکرد، سـووکە لێـدانێك بکرێـت:** بـۆ ئـەمـەش مەرجگەلێکیان داناوە لێرە دەرفـەتی باسـکردنیان نییـە . مەسـەلەی فـەرمانکردن بـە منداڵ نوێـژ بکـات، تـەنها بـۆ راهێنـان و هـۆگر بوونیـەتی پێیـەوە، نـەك سـەپاندن بـە سەریا، لەولایشەوە بەراستیی ناکرێ بـاوك و بـراو کـەس و کـار هـیچ هەیمەنـەتێکیان بەسـەر منداڵـدا نـەبێت، لـە کاتێکـدا منـداڵ هـەموو جـۆرێکی تێدایـە، هەیـە تـەنها بـە ئامۆژگاری دەگۆڕدرێ و کارەکـەی ئـەنجام دەدات، هەیـە هەرەشـەیەکی دەوێ، هەیـە سەرسەختە تووڕەبوون و لێیشی دەدوێ، ئەڵبەت ئەم لێدانە لێدانی خوێناوی کـردن و

(٥٢) صحيح البخاري – كتاب الأطعمة، باب التسمية على الطعام والأكل باليمين – حديث : ٥٠٦٦.

دەست و پێ شکاندن نییە، ئەم لێدانە تەنها بۆ ئەدەب و تەمێکردنە، وە بە هیچ شێوەیەك ڕێگە بە زیادە ڕەوی نەدراوە.

* ڕەخنە دەگیردرێ و دەگوترێ: **باشە بۆ لێی ناگەڕێن تا گەورە دەبێ و بڕیار دەدات بۆ خۆی ؟!** دەڵێین بێگومان هەموو شتێك کات و ساتی خۆی هەیە، هەرکە لەو ماوەیە تێپەڕی، کارەکەشی لە دەست دەردەچێ و بۆ دوایی بێ کەڵك دەبێ، بۆ نموونە: من بە تۆ دەڵێم ئەی بۆچی منداڵێك لە (٦)ساڵیدا دەنێردرێتە قوتابخانە، کە هێشتا سەلیقەی ئەوەی نییە بۆ خۆی بریار بدات؟ کێ دەڵێ: ئەو منداڵە حەزی لە خوێندنە، ئەی بۆ وازی لێناهێنرێت با گەورە ببێ و بۆ خۆی بریار بدات ؟ خۆ دڵنیایشم، هەرکات سستی و تەمەڵی کرد، لەلایەن سەرپەرستیکارەوە سەرزەنشت دەکرێ، بگرە لێیشی دەدرێت! بەڵام هەموو ئەو شتانە لەبەرژەوەندی منداڵەکەدایە، ئەگەرچی ئێستا سەرماو گەرماو برسیی و تینوویشی ببێ، یا ئازارو بێزار بچێژێت .. کاك (جەلال)! ئەم جۆرە شتانە زەوتکردنی ئازادی نییە، بەڵکو مەسەلە، مەسەلەی بەرپرسێتی و لێپرسینەوەیە، ئێمە - هەمووومان - بەرپرسین لە ئایندەی منداڵان، هەر لە (ئەخلاق) و ڕەوشتیانەوە، هەتا خوێندن و پەروەردەی جەستە و دەروونییان، هیوادارم تۆش ئاوا بچیت بە دەم ئەم مەسەلەوە.

بەشی سێیەم:

ئـەوی مـرۆڤ بێـت (ئـەمر) و (نـەهی) هەیـە، حـەلاڵ و حـەرامی هەیـە، وە هـەروەها دەستوور نووسین و پاشان راڤەی ئەو دەسـتوورەو کردنـی بـە (یاسـا) و (سیسـتم)ـی ولاّتی هەیە لەلایـەن پسـپۆرانی هـەموو حکوومـەت و دەوڵـەتانی دنیـاوە، ئەمـە مانـای زەوتکردنی ئازادی نیە لە هاولاّتیـان، بـەڵکو لـە بەرژەوەنـدیی هاولاّتیانـە، بـۆ ئەوەیـە مـافی هـەموو کەسـێك - دەسـەلاّتدارو بـێ دەسـەلاّت - رەچـاو بکـرێ و بپـارێزرێ، لـە بنەرەتدا مرۆڤ مافی گواستنەوەی هەیە (حرية التنقل) لە هەر سووچێکی زەویەوە بـۆ هەر جێگایـەك خـۆی حـەزی لێـدەکات، بـەلاّم پێویسـتە بـۆ ئـەو کـارە کۆمەڵـە یاسـاو رێسایەك هـەبێ، هـەتا فـەوزاو بـێ سـەرو بـەری ڕوونـەدات، ئەوەیـە کـە ئێسـتا تـا لـە ولاّتێکەوە دەچیتە ولاّتێکی دی، قیر سپی دەبێ..

هەرشتێك خزمەت بە (مرۆڤ) بکـات، ئیسـلام رێـی پێـداوەو بـۆی حـەلاڵ کـردووە، بـۆ نموونە: هەر خـواردن و خواردنەوەیـەك خزمـەت بـە رۆح و جەسـتەو دەروون و عـەقڵی مرۆڤ بکات حەلاّڵە، هەرچیش زەرەرو زیان بەخش بێت بۆی، لێی حـەرام کـراوە، بۆیـە (شـیر، ئـاو) رێـی پێـدراوە، بـەلاّم شـەراب و ئـارەق و هـەموو جـۆرە مەشـروبێك رێـی لێگیراوە .

گۆرانی - بەهەر ئاوازێك - بە تایبەتی ئەگەر بە هۆنراوەی شاعیرە دیندارو بـە هـۆش و گۆشەکان بن: (مەولەوی، مەحوی، نالی، ناری، تایەر بەگی جاف ..) حەلاّڵە (بەو مەرج و خالاّنـەی زانایـانی پێشـین و سـەردەم دایـان نـاوە)، چـونکە شیعرەکانیشـیان بـە ئەندازەی خۆیان خـاوەن وێـڵ و خـاوەن ئـەخلاقن، بـەلاّم هەڵـدان بـە سـنگی ژنانـا و، جوانکردنی مەشروب لای لاوان و کردنی بە گۆرانی حەرامـە، هەڵـدان بـە شـاخ و دۆڵ و چیا و باخ و باخـاتی کوردسـتان و سرووشـتە کـەم وێنەکـەی کوردسـتان بـۆ (پیـاوانی گۆرانی بێژ) حەلاّڵە، شمشاڵ و دەف، یان هەر موسیقایەك لەگەڵ شتی حەرامدا نەبێت وەکو بەرێز (دکتۆر عبدالکريم زەیدان) دەڵێت رێی پێدراوە .

کـاك (جـەلال!) هـەموو دیـن و دینـداریی و حکوومـەت و حیزبێـك، جـۆرە کـەلتوورو فەرهەنگێکی خۆی هەیە، ئیسلامیش کەلتوورو فەرهەنگی خۆی هەیەو، نابێ بـە شـتی

تر تێکەڵ بکرێ، هەرکەسەیش ئازادە قبووڵی بکات یان نا ؟ بەلآم وەکو دەستوورو یاسای هەر حکوومەتێك، دەبێ لای خەڵکانی ئەو حکوومەتە رێزی لێ بگیردرێ، بێگومان هەر ئاواش دەبێ لە ولآتی ئیسلامیدا رێز لە فەرهەنگ و کەلتووری ئیسلام بگیردرێ و سنوور بەزێنی نەکرێت.

(زەواج) و جووتبوونی ژن و پیاو - بەشێوەی شەرعیی - حەلآڵە، بەلآم جووتبوونیان بە ناشەرعیی و رووت و قووتی - وەکو ئەو رۆژە لە دایك بووبن و لە کەناڵە ئاسمانیەکانی خۆرئاواوە نیشانی کوڕان و کچانی لاو بدرێت حەرامە، من دەڵێم کاری وا لە کاری ئاژەڵیش ناچێت، نەك مرۆڤ، بێگومان کە ئێوەش قبووڵی ناکەن !، بۆیە هەرکات رێ لەو شێوە سێکسیە بگیردرێ، مانای رێگرتن نیە لە ئازادی.

*** سەبارەت بە موسیقا** .. کە جەنابت دەڵێیت: حەرام کردنی موسیقا پێچەوانەی هەموو پێشکەوتنێکە ..!.

تەواوی زانایان و موجتەهیدەکانی دینی ئیسلام یەکدەنگن کە: هۆکاری گرنگ و بایەخ لە هاتنی شەریعەتی ئیسلامدا پێنج شتە: (حفظ الدین، و حفظ العقل، وحفظ النسب، و حفظ النفس، و حفظ المال) هەرشتێك زیان بە یەکێ لەم پێنج شتە بگەیەنێت (بە مۆسیقایشەوە) بێگومان حەرام و قەدەغە دەکرێ لە مرۆڤ، خۆ هەموو دەزانین کە لەسەر شاشەی تەلەفزیۆنەکانی کوردستان و خۆرئاواوە چ هەراو هۆریاو رەقس و سەمایەك دەکرێت، بە تێکەڵی کچ و کوڕو بە ماچ و مۆچ و دەست بردن بۆ ئەندامە بزوێنەرەکانی هێزی سێکسی یەکتر، تەنانەتی لە هەندێ لە کەناڵە بە کرێ گیراوەکان و لەوانەوە بازرگانی بە جوانی ژنانەوە دەکەن، ژنان بە رووت و قوتی نیشان دەدەن و، برێکیشیان تایبەتن بە نیشاندانی رابواردن و جووتبوونی کچان و کوران (لە پێش و پاشەوە، بگرە لە دەمیشیانەوە) وە بۆ پتر وروژاندنی هێزی سێکسیان مۆسیقایشیان بۆ دەخەنە سەر ! ئیسلام ئەو جۆرە مۆسیقانە حەرام دەکات کە لەو جۆرە شتانەدا

بـەكار دێـن! ئـەوی زۆر جێگـەی نیگـەرانی بێـت، ئەوەیـە كـە ئـەو جـۆرە شـتانە بـە (پێشكەوتن) دادەنرێت، وەك "جەلال" بە راشكاوانە گوتی ! .

كاك (جـەلال) ! هـەر شـتێك پێشـكەوتن بێـت لـە بـواری پیشەسـازی و تەكنـەلۆژیاو مەزراو كشت و هونەری پاك و پەسەندو نوورانی كردنـی فیكـرو بـیری مـەردم، ئیسـلام ڕێی پێداوە.. بەلاَم ئاوێتەكردنی كچ و كوڕو لاوان بیَ هیچ سانسۆرێك و بە مۆسیقا پـتر ئاگری هەوەسـی سێكسـیان بـوروژێنریَ و بـەر بدرێنـە گیـانی یـەكتر ! لـە فەرهـەنگی ئیسـلامدا، كـاری واو مۆسـیقای وا حەرامــە و قەدەغەیــە، ئەگینــە مۆسـیقایەك بــۆ وروژاندنی جورئەت و غیرەتی سوپا و لەشكر بێت، بۆ تۆڵـە سـەندنەوە لـە دوژمنـان، یان لەگەڵ سروود و گۆرانی دینی و نیشتمانی شەرعیی بێت چ نەنگێكی هەیە ؟

*** سەبارەت بە ژنان،** گوایا هێرشمـان كردبێتـە سـەریان ..! دڵنیابـە هێرشـكردنە سـەرژنان لـە فەرهـەنگی (ئەحمەدكاكـە محمـوود) دا نییـە، چـونكە مـرۆڤ بـە هـەردوو جۆرەكەیـەوە (نێرومـیَ) چـاك و خراپـی هەیـە، هـەزاران ژنـی قارەمـان و شۆرشـگێڕی تێكۆشەرو صالَح و چاك و خواپەرسـت هەیـە، هـەر وەكـو هـەزاران پیـاوی ئـاوا هەیـە، دیسان هەزاران ژنی خراپ و نالەبارو خۆفرۆش و جاسوس هەیە،

هەر وەكو هەزاران پیاوی ئاوا هەیە، كـەوابوو كـیَ خراپـە پێیـدەڵێین خـراپ، كێـیش باش بوو پێیدەڵێین باش (لەپیاوو لە ژن) .

﴿ فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَاهَا ﴿٨﴾ ﴾ (الشـــمس: ٨). ﴿ قَدْ أَفْلَحَ مَن زَكَّاهَا ﴿٩﴾ وَقَدْ خَابَ مَن دَسَّاهَا ﴾ (الشمس: ٩ — ١٠) هەردوو ئایەتی قورئانن . بەلاَم كە ئەمرۆ ژنـان پـتر بازرگانیـان پێـوە دەكرێت، لەتەواوی میدیاكانـدا، لـە رۆژنامـەو گۆڤـارو تەلـەفزیۆن و هۆتێـل و مۆتێـل و چێشتخانەو بازاڕو تەنانەتی بازرگانی سیاسیشیان لە دام و دەزگاكانی دەوڵەتدا پێـوە دەكـریَ، ئـەوەتا تـا كەسـێكی نێرینـەی دەرچـووی زانكـۆو پـەیمانگاكان لای دەوڵـەت دادەمــەزرێت، بــە دەیــان ژن و مێیینــە دادەمــەزریَ و دەكرێتــە ســكرتێری وەزیــر و بەڕێوەبەر و دكتۆر لە عیادەكانداو، ماڵ و حاڵی خۆیانیان جێهێشتووە و جێگـەیان بـە

كوڕان لەقكردووە .. ئەگەر سەرزەنشتی ژنانی ئاوا بكرێ و گلەییان لێ بكرێت ناهەقە ؟!.

*** سەبارەت بە میراتی ژنان** كە هەندێ جار - نەك هەموو جار - نیوەی پیاو دەبەن .. ئەو مەسەلەیە هەرچەند لە كتێبەكاندا بە وردی شیتەڵ كراوەو پێویست بە (ألف ليلة وليلة) ناكات، بەڵام بە كورتە دەڵێین: زاناكان بۆ ئەوە دوو هۆكار باس دەكەن:

١- بەر لەهاتنی ئیسلام، هەركەسێك نەچووبا گۆڕەپانی جەنگە خێڵایەتیەكانەوە، هیچ بەشێكی نەبوو لە میراتدا، بەڵام كە ئیسلام هات بەو شێوە زۆر قەشەنگە یاسای میراتی دامەزراند، كە بەراستیی مەگەر تەنها زانا پسپۆڕەكانی ئەو بوارە بزانن چەندە عەدالەتی تیا رەچاو كراوە.!

٢- ژنان بەر لە مێرد كردن و، دوای مێرد كردنیش — لە فەرهەنگ و سیستمی ئیسلامدا هەموو رزق و رۆزیی و نەفەقە و مارەیی و بژێوییەكیان لەسەر پیاوانە، واتە: ژنان سەرچاوەیەكی سەرەتایی ژیانیان هەیەو بۆیان مسۆگەر كراوە، بەڵام پیاوان دەبێ بە رەنجە شانی خۆیان بۆ هەردوولا پەیدای بكەن،

جا ئەگەر لە میراتەكەیشدا ژنان وەكو پیاوان میرات بەرن، ئەوا ژنان دەبنە سەرمایەدارو پیاوانیش هەژارو مسكێن !.

سەبارەت بە كەم دینی و كەم عەقڵی ژنانیش — گوایە بەندەی خودا لە كتێبی (پەروەردە لە ئیسلامدا) گوتومە.. ئیستا دەڵێم: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((يا معشر النساء، تصدقن وأكثرن الاستغفار، فإني رأيتكن أكثر أهل النار " فقالت امرأة منهن جزلة: وما لنا يا رسول الله أكثر أهل النار ؟ قال: " تكثرن اللعن، وتكفرن العشير، وما رأيت من ناقصات عقل ودين أغلب لذي لب منكن " قالت: يا رسول الله، وما نقصان العقل والدين ؟ قال : أما نقصان العقل: فشهادة امرأتين تعدل شهادة رجل فهذا نقصان العقل، وتمكث الليالي ما تصلي، وتفطر في رمضان فهذا نقصان الدين))[٥٣]. واتە: ئەی

(٥٣) صحيح مسلم – كتاب الإيمان، باب بيان نقصان الإيمان بنقص الطاعات – حديث : ١٣٩ .

كۆمەڵی ژنان ! صەدەقەو خێرو خێرات بكەن و (أستغفرالله)ـی زۆر بكـەن، چـونكە لـە شەوی (میعراج)دا ئێوەم بە زۆرترینی جەهەننەمییـەكان دیـت، ژنێكـی زیـرەك و قسـە زان گوتی: بۆ دەبێ ئێمە زۆرترینی جەهەننەمییەكان بـین ئـەی پێغەمبـەری خـودا ؟! فەرمووی: چونكە جنێوو تانەو تەشەری زۆر لە مەردم دەدەن و، بەرامبەر بـە چـاكەی مێرد و هاوسەرتان پێنەزانن، كەسیشم وەكو ئێوە نەدیتووە كە بتوانێ بەسەر پیاوانی ژیر و فامیدەدا زاڵببێ، ژنەكە گـوتی: بـۆ دەبـێ ئێمـە كـەم عـەقڵ، كـەم دیـن بـین ؟! فەرمووی: ئەگەر كەم عـەقڵ و كـەم بـیرو كـەم هـۆش نـەبووبان، لەمەسـەلە گەلێكـدا، دوانتـان بـە شـایەتێك نـەدەبوون، كـەم دینیشـتان، واتـە: ئیتاعـەو كـەم پـاداش و جەزایشتان ئەوەیە: كە — بە هۆی بێ نوێژی و منـداڵ بوونـەوە - چـەندان شـەو و رۆژ تێدەپەڕێ، ئێوە بێ نوێژ دەمێننەوەو، مـانگی رەمـەزانیش دێـت، دیسـان بـەهۆی بـێ نوێژییەوە رۆژوو ناگرن، ئەمـەیش مانـای ئەوەیـە طـاعـەتتات كەمـەو پاداشیشـتان لـە قیامەتدا كەم دەبێ.

## به كورتی لەم بارەوە دەڵێین:

١- (عەقڵ) كە لە فەرموودەكەدا هاتووە، بە مانای كەم بیرو هۆشی ژنانە، هەر لەبەر ئەوەیشە كە لە هەندێ مەسائیلدا دوانیان بە شایەتێك دادەنرێن، ئایەتەكەش: ﴿...أَن تَضِلَّ إِحْدَىٰهُمَا فَتُذَكِّرَ إِحْدَىٰهُمَا ٱلْأُخْرَىٰ ..﴾ (البقرة: ٢٨٢) جەخت لەسەر ئەوە دەكاتەوە.

٢- (دین) كە لە فەرموودەكەدا هاتووە بەمانای كەم تاعەتیی و كـەم جـەزاو پاداشـی رۆژی قیامەتە. واتە: كەسێك هەمیشە خەریكی خـوا پـەرسـتیی و نوێـژ و رۆژوو تاعـەت بێت، وەكو كەسێك نییە بچڕبچڕ بیكات، ئەگەرچی بیانووی شەرعیشی هەبێت.

## * مەسەلەی زیرەكی و لێوەشاوەیی و لێهاتوویی مرۆڤ (ژن و پیـاو)

لـە هەردووكیانـدا هەیـە، كـەم ویـژدانی و كـەم دلۆڤـانی و كـەم سـۆزیش دیسـان لـە هەردووكیاندا هەیە، ئەوەیش كە ژنان پتر لە هەموو شتێك دەتوانن پیاوان فریوو بدەن و لە خشتەیان بەرن و بەرنامەیان لێ تێك بـدەن بەڵگـە نـە ویسـتە، چـونكە زۆرێـك لـە پاشـاو دەسـەڵاتدارانی حكوومـەت و پیـاوانی سیاسـیی ئەحزابـەكان، زۆر جـار ژنـان توانیویانە كاریان پێ تێك بدەن و بەرنامەیان لێبگۆڕن، تەنانـەتی نـەیارانیان لـە رێـی

(خانمە کاذیانـەوە توانیویانـە هـەموو نهێنییـەکی وڵاتیـان دەسـت کـەوێ، ئەمەیـە کـە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ما رأيت من ناقصات عقل ودين أذهب للب الرجل الحـازم مـن إحداكن))[٥٤].

منیش لێرەدا کۆتایی بە بەشی سێیەم دێنم و پشت بە خوا وەڵامی بەشـی چـوارەمی کـاک جـەلال دەدەینــەوە، هیـوادارم کـاک جـەلال وئەوانــەی تێگەیشـتنیان لـە باسـە ئیسلامییەکاندا کەمە، سوودی لێ وەرگرن و بەچاوی ئینسافەوە بۆی بـڕوانن، تابـەڵکو بە ئیسلامی پیرۆز قایەل بن و لە کەلی شەیتان بێنە خوارێ.

(٥٤) صحيح البخاري – كتاب الحيض، باب ترك الحائض الصوم – حديث : ٣٠٠ .

## بەشی چوارەم:

**مەسەلەی ئازادی** لای کەسێك بۆ کەسێکی دی جیاوازی هەیە، **هەیە** مومارەسەی (الشذوذ الجنسية) بە ئازادی دەزانیّ، بەڵکو دەکرێتە مەسەلێکی سیاسیی و قازانجی سیاسیی لێدەکرێت، خۆ لە بیرتە یەکێ لە سەرۆك کۆمارەکانی ئەمریکا لە لایەن ئەو کەسانەوە دەرچوو وە متمانەی پیێ درا، کە موعتاد بوون بە مومارەسەی شذوذی جنسیی، چونکە شەرعییەتی پێدابوو،! ئەی لە بیرتە لە ناو سوپای ئەمریکادا مومارەسەی جنسیی بە پێی یاسا حەڵاڵ کرا ؟!. هەیە مومارەسەی جینسیی لە پاش و پێش و دەمی ژنانەوە (سێ چوار کەس پێکەوە خەریکی یەك ژن دەبن) بە ئازادیی دەزانێ! خەڵکانی مرۆڤ دۆستی وایش هەیە، ئەو شتانە بەسووکایەتی بە ژنان دەزانێ و نەفرینی لێدەکات، چونکە تەنانەتی ئاژەڵیش کاری واناکات، ئەگەر نیوە دوورگەی عەرەبیی، بە هاتنی ئیسلام دەرگای ئازادی لێ والاّ نەکرابێ و، ئیستایش ئێوە بیچوێنن بە خڕەی گوێزەوە لە بیاباندا و حەزی لێبکەن و دەستییان نەکەوێت ! وەکو گوێز لە بیابان دەست ناکەوێ، مەگەر کام وڵات پڕە لە ئازادیی و سەربەخۆیی و هەموو خەونەکانی مرۆڤی تیا دێتە دی ؟!.

مەگەر (فەرەنسە) لەچکی سەری کچۆڵە خوێنکارەکانی دانەماڵی لە سەریان ؟ خۆ ساڵی پاربوو بڕیاری قەدە غەکردنی سەرپۆشی قوتابیی هەرسێ دینەکەی (ئیسلام و یەهوودو مەسیح)ی دەرکردو نەیهێشت بە لەچکەوە بخوێنن، بەڵکو دەبیێ بە سەرو سینگی رووتەوە بچنە قوتابخانەو زانکۆکان، جا بۆ چەند رۆژێکیش ژنان وکچانی ئەوێ رژانە سەر شەقامەکان و داوای هەڵوەشانەوەی بڕیارەکەیان کرد، بەلاّم چ کەڵکێکی بوو؟ باشە کاروکردەوەی بەو شێوە بۆ دەوڵەتێکی خاوەن ئەتۆم و لەم سەدەیەدا نەنگ و لەنگ نییە ؟ ئایا ئەوە رێز نانە لە ئازادیی مرۆڤ ؟.

ئەی جیاکردنەوەی قوتابخانەو هۆیگواستنەوەی هاتووچۆو چێشتخانە بۆ رەشپێسەکان لە ئەمریکاو بەکەم بەهادانانیان ئازادییە ؟ ئەی ئەو هەموو کوێخایەتیی

و هەق بەخۆدانەی ئـەمریكاو هەڕەشـە لـەم ولـەوو تـرس وەبەرنانـەی بـۆ هـەر وڵاتێـك كوێخایەتی ئەوی قبووڵ نەبێت ئازادییـە ؟ ئـەی ئاگـاداری ئـەو هـەموو هـەراو كێشـمە كێشـەی ئـەمریكا نیـت بـۆ حكومـەتی ئێرانـی خوڵقانـدووە لـە مـەڕ پیتانـدنی یورانیۆمەكەیەوە ؟ ئەی مەگەر ئەوە ئازادییە بۆ نەتەوەو گەلانی دنیـا، ئـەمریكا هـەق بە خۆ بدات بۆ پیتاندنی یورانیوم و دروستكردنی ئەتۆم و هەموو جۆرە چەكێكی كۆكژ و، هەق بە داگیركردنی هەروڵاتێك بە لێ بۆ ئەو نەكات بدات، بەڵام بۆ هەر دەوڵـەتێكی تر بییەوێ لە بواری زانست و پیشەسازییدا هەنگاو بنێت قەدەغە بێت !.

ئەی خۆ دەزانی كە گەلی فەلەستین چۆن بـە ئازادانـەو بـە ئـیرادەو خواسـتی خـۆی بزووتنـەوەی (حـەماس)ی هەڵبـژاردو حكوومـەتی پێكهێنـا.. بـەڵام ئێسـتا هـەموو دەرگایـەكی هاوكـاری نێودەوڵـەتیان لێداخسـتن و بـە (ئیرهـابیی) كەوتنـە دوایـان و سەدگرفت و موشكیلەیان بۆنانەوەو لە لایەن ئەمریكایشەوە گڵۆپی سەوز بۆ ئیسرائیل هەڵكرا. ! ! بەپێچەوانەی هەموو یاسایەكی نێودەوڵەتی كە هەقیەتی بەرگری لـە مـافی خۆی بكات، ئەوەبوو ئەویش لەپێش چاو دنیاوە بێ ویژدانانە بە هەموو جـۆرە تـۆپ و تانـك و فڕۆكەیـەكی سـەردەم بەربوویـە بارەگـای سـەرۆك ئەنجوومـەنی وەزیـران و وەزارەتی ناوخۆ، بگرە گشت شارو شارۆچكەكانیان، هێشتا بەدەر لەوەیش ئەنـدامانی حكوومەت و پەرلەمانەكەی فڕاندن و توندی گرتووخانەكانی كردن، هێمـان بەوەشـەوە نەوەستا، كاتێ حیزب الله ی لوبنانی دیتی ئەو بەبێ شەرم و بەزەیی لە دەسەڵاتداران و یاسا نێودەوڵەتییەكان بەر بۆتە گیانی گەلێكی ستەم لێكراوی بـێ دیفـاع، ناچـاربوو هێرشێكی بۆكردو دوو سێ سەربازێكی لێ دیلكردن، دوای ئەوە وەكو سـەگە هـارە بـە فڕۆكـەكانی هـەموو شـوێنە ئابوورییـەكانی لوبنـانی وێرانكـرد، سـەرەرای فڕۆكەخانـەو ڕێگـاو بـانی پەیوەنـدی نێـو شـارو شارۆچـكەكانی ! ئـەمریكاش دەڵـێ: ئیسـرائیل هەقیەتی بەرگری لە خۆی بكات !.

کـاك جـەلال ! بـۆ ناچـێت لـە حـاڵ و گـوزەرانی موسـڵمانەکانی (ئوزبەکسـتان و تورکەمانستان و کازاخستان و قرغیزیا و تەتاریا وباشکیریا و موردۆف و ماری و قـەرم و ئەرمینیا و جۆرجیا و ئوکرانیا و مۆسکۆ) بپرسـیت: تـا دەرکـەوێ لـەو مـاوەی (٧٠) ساڵەدا چـییان پێکـردن ؟ بـۆ ئەمـە سـەیرێکی کتێبـی: (موسـڵمان ئێرھابییـە، یـان عەلمانیی و خوانەناس) ؟ بکە، لە نووسینی: ئەحمەد کاکە مەحموود.

لاپەڕەیـەکی فـەرمی (سـۆڤیات – نیـوز) دەڵـێ: جگـە لـە مزگەوتـەکانی (بوخـارا) و (خیـوە) ژمـارەی مزگـەوت لـە رووسـیا دەگەیشـتە (٢٦٢٧٩) مزگـەوت، کەچـی سـاڵی (١٩١٣) تەنها (١٣١٢) مزگەوتیان کراوە بوون، ئەوانی دی ھـەموویان روخێنـران، یـان داخران !.

خۆ بێگومان ئاگایشت لە قەسابخانەی (صرب)ـەکانە کە لەو چەند ساڵەدا دایاننـا بـۆ موسـڵمانەکانی (بوسـنە) و (ھـەرزیگۆیین) ؟ دوای ئەمــە خــۆ ئەگــەر ئیسـتا بلـێم چواندنەکانی کاك جەلال: (حوشتر و قاپقاپیان نـەگوتووە) تـەنھا بەسـەر رۆژ ھـەلآت و رۆژئاوادا دەشکێتەوە.. !

رێم پێدەدەیت کاك جەلال! زۆر زۆرم لایە لـە تۆقانـدن و داپلۆسـان و رەشـەکوژیی و گـۆڕینی نـاوو داگیرکردنـی زەویـی و زارو گواسـتنەوەی موسـڵمانان بـە زۆرە ملـێ و ھەڵوەشانەوەی فەرھەنگ و کەلتووریان، نامەوێ زیاد لەمە کات لە خوێنەران بگرم.

تۆ دەڵێیت بەڵگەی ئایەتە قورئانییەکان بۆ بوونی ئازادی پووچەڵ دەبنەوە، کاتێك کە بە تەواوی لە قورئان بڕوانیی و بەڵگەکانی تری دژ بە ئازادی ببینی.. ئێمەش دەڵـێین: قورئان بە پێچەوانەی بۆ چونەکەی تـۆ دەڵـێ، چـونکەی زۆر بـە جـددی دنـەی مـەردم دەدات بۆ تێڕامانین و وردبوونـەوە لـە مانـاو مەبەسـتەکانی، قورئـان لـە گـەلێ جێگـادا دەفەرموێ: ﴿ أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ ٱلْقُرْءَانَ أَمْ عَلَىٰ قُلُوبٍ أَقْفَالُهَآ ﴾ (محمد: ٢٤) . واتە: ئاخۆ ئـەوان لـەو قورئانـە رانـامێنن، یـان دڵیـان داخـراوە ؟. کەواتـە قورئـان کـەلام و فـەرموودەی خـودای بەدیھێنــەری بوونــەوەرە، فــەرموودەی خــودای خولقێنــەری ئــەو ھــەموو

فەیلەسووف و پسپۆڕو خەڵکانی ڕەوانبێژو خۆشخوانەیە، هانی هەموان دەدات کە هەر کەس بە پێی جۆری زانستی خۆی لە قورئان بکۆڵێتەوەو بزانێ هیچ نەنگ و لەنگێکی تێدایە هەر لەو ڕۆژەوە هاتووە تا ئەمڕۆ،؟ تا ڕۆژی ڕستاخێز و هەڵسانەوەی گۆڕ، ئێمە دڵنیاین کە چەندە زانست پێشکەوێ، هەزار ئەوەندەش گەورەیی و ڕاستی قورئان دەردەکەوێ، بۆیە خودا دەفەرموێ: ﴿ أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ ٱلْقُرْءَانَ وَلَوْ كَانَ مِنْ عِندِ غَيْرِ ٱللَّهِ لَوَجَدُوا۟ فِيهِ ٱخْتِلَٰفًا كَثِيرًا ﴾ (النساء: ٨٢). واتە: ئاخۆ ئەوانە لە قورئان ورد نابنەوە؟ تا بزانن ئەگەر قورئان کاری کەسێکی تر بوایە — بەدەر لە خوا — ئەو کات ماناو مەبەستی ناڕێك و دژ بە یەکتری فرەیان تێدا دەدۆزیەوە.! خۆ بێگومان قورئان لە چەرخی ڕەوانبێژیی و خۆشخوانیدا هات، لەو دەمەدا هیچ کەسێك نەیتوانی هەڵەیەك بدۆزێتەوەو بۆی بچێتە سەر، یان ڕەخنە بگرێ و بڵێ قورئان پێشەکیی و پاشەکییەکانی تێکەڵ و پێچەوانەی یەکترن.

ڕاستە شەریعەتی ئیسلام (نەسخ)ی تێدایە، واتە: قۆناغ بۆ قۆناغ جیاوازیی و ئاڵ و گۆڕی تێدایە، ئەوەش بۆ ئەوەیە وردە وردە (ئەمر) و (نەهی)یەکانیان بدا بەسەردا، تا لە ژێریا دەرچن و بتوانن جێبەجێیان بکەن، هەر وەکو قۆناغەکانی قوتابخانە: سەرەتایی، ناوەندیی، دواناوەندیی.. هتد. بۆ نموونە: پێنچ ساڵ بەر لە کۆچ بۆ مەدینە لە شەوی میعراجدا نوێژ فەرز کرا، ئەو ماوەیە پێغەمبەرو موسڵمانان گشت ڕوویان لە (بيت المقدس) دەکرد، کاتێ هاتنە مەدینەش بۆ چەند مانگێك ڕوویان هەر لەوێ دەکرد، پاشان بە فەرمانێکی قورئانی ڕووگە گۆڕا بۆ مەککە (كعبة الله) لەبەر ئەو بەرژەوەندییە لە جێگەو شوێنی خۆیدا باسکراوە.

ئەو ئایەتانەش لای تۆ بە ئاڵۆز دەر دەکەون، بۆ نموونە: لە جێگەیەك دەڵێ: (لاإكراه في الدين). یان دەڵێ: ﴿ ...فَمَن شَآءَ فَلْيُؤْمِن وَمَن شَآءَ فَلْيَكْفُرْ ... ﴾ (الكهف: ٢٩) ئەم جۆرە ئایەتانە بەرامبەر بەوانەیە کە بۆ خۆیان دانیشتوون و هیچ فەوزاو ئاژاوەیەك نانێنەوە، ئەوانەیش خەریکی فەسادو گێرە شێوێنی و شەڕ فرۆشین، بەرامبەریان دەفەرموێ:

﴿ ...وَقَٰتِلُواْ ٱلۡمُشۡرِكِينَ كَآفَّةٗ كَمَا يُقَٰتِلُونَكُمۡ كَآفَّةٗۚ ... ﴾(التوبة: ٣٦). يان دەفەرموێ: ﴿ قَٰتِلُواْ ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَلَا بِٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ وَلَا يُحَرِّمُونَ مَا حَرَّمَ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَلَا يَدِينُونَ دِينَ ٱلۡحَقِّ مِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ حَتَّىٰ يُعۡطُواْ ٱلۡجِزۡيَةَ عَن يَدٖ وَهُمۡ صَٰغِرُونَ ﴾ (التوبة: ٢٩).

*** مەسەلەی پەیدابوونی (شافعیی و مالکی و حەنەفیی و حەنبەلیی) و سەدان موجتەهیدو زانای تر لە بواری زانستە جیا جیا شەرعییەکاندا، کە ئێوە بە رەخنەی دەزانن! لای ئێمە ئەوە بەشێکی ترە لە ئازادیی و بیرکردنەوە کە هەر زانایەك بە پێی راو بۆچوونی خۆی دەتوانێ لە ئایەت و فەرموودەکان بکۆڵێتەوە، زیاد لەو مانایەی خۆی مانای تری لێوەرگرێ و حوکم و ئەحکامی لەسەر بنیات بنێت، بەمەرجێ لەگەڵ دەقە گشتییەکاندا دژ نەوەستن و لەگەڵ ئایەت و فەرموودەکاندا بگونجێن، وەکو خۆشیان لەجێگای خۆیاندا گوتویانەو دەڵێن: هەر وەکو یاسا ناسەکان لە دەستوور دەکۆڵنەوەو پاشان هەریەکەیان گەلێ راوو بۆچوونی لێوەردەگرێ و، دەشکرێ بە یاساو کاری پێدەکرێ.**

**سەبارەت بەو ئایەتانەیش بەرێزت ماناکەت هێناون و پێت وایە تۆزقاڵەیەک بەلای ئازادیدا نەچوونە**، دەڵێین: ئایەتی (٨) ی تەوبە کە دەفەرموێ: ﴿ كَيۡفَ وَإِن يَظۡهَرُواْ عَلَيۡكُمۡ لَا يَرۡقُبُواْ فِيكُمۡ إِلّٗا وَلَا ذِمَّةٗۚ ... ﴾ (التوبة:٨) واتە: چۆن پەیمانێك! ئەوان هەرکاتێ بزانن پێتان دەوێرن، بەبێ ئەوەی گوێ بدەنە سوێند خۆری، یان خزمایەتی، بەگژتاندا دێن؟.

بۆ باشتر تێگەیشتن لە مانای ئەم ئایەتە، پێویستە تۆزێ بگەرێینەوە بۆ پێشەوە، تا دەرکەوێ کاتی ئەو تورە بوون و مەیووسبوونە لە خوانەناسان کەی بووە؟

پێغەمبەر ﷺ لە (حودەیبیە)دا - کاتێ رێگەیان نەدا بچێت (عومرە) بکات - لەگەڵ قورەیشدا رێکەوتنامەیەکی (١٠) ساڵەییان مۆرکرد، گەلێ خاڵ و مەرجی تێدا هاتبوو، لەوانە: هیچ لایەکیان هێرش نەکەنە سەر سوێندخۆران و هاوپەیمانانی ئەو لایەنەکەی

تر، وە هاوکاری هیچ کەسێك نەکەن بۆ هێرشکردنە سەریان، هەموو دەزانین کە تیرەی (خوزاعــە) ســوێندخۆری پێغەمبــەر ﷺ و هاوپــەیمانی بــوون، هــەروەك (بــەنی بکــر) هاوپەیمانی (قورەیش) بوو، بەلاّم ئەوەنـدەی نەخایانـد ئـەو دوو تـیرەی لـە مەککـەدا هاتنە جەنگ، قورەیش کە - نـەدەبوو هاوکـاری بـەنی بـەکری سـوێند خـۆری بکـات - پەیمانەکـەی شـکاند و دەسـتی دایـە هاوکـاری بـەنی بـەکر، دیـارە بـەو هاوکاریـە، پەیمانەکەی هەڵوەشاندۆتەوەو راستی نـەکرد و ساختەچـی دەرچـوون، (خوزاعـە)یـش نوێنەریان ناردە (مەدینـە) و پێغەمبـەریان لێ ئاگـادار کـرد، ئـەویش ئەگەرچـی مـانگی رەمەزانیش بوو، لەبەر خاتری ئـەوەی پـەیمانی هەیـە لەگـەڵ (خوزاعـە) دا کـە دەبـێ هاوکـاری سـەربازی بکـات لـەکاتی پێویسـتدا، ئەگەرچـی (موشـریکن) و ئیمانیـان نەهێناوە، سوپایەکی دە هەزار کەسی رێکخست بـۆ سـەر قورەیشـی پـەیمان شـکێن و چوو بەهانای (خوزاعە) وە.. ئینجا خوای گەورەو دلۆڤان پاش خیانەتەکەی قورەیش، ئەو چەند ئایەتەی سەرەتای (تەوبە) دەنێرێ کە:

١- ئەوانەی پەیمانیان هەیەو هەڵیان نەوەشاندۆتەوە، ئێوەیش وەفا بە پەیمانەکەیان بکەن و رێزی لێبگرن.

٢- ئەوانەی پەیمانیان نییە، ماوەی چوار مانگیان بۆ دیاری بکەن، با بە ئازادانە چـی دەکەن، بیکـەن، دەگوێزنـەوە بـۆ جێگایـەکی تـر، یـان موسـڵمان دەبن و هـەر لـەوێ دەمێننەوە، چونکە تەجروبەی (٢٢) ساڵ لەگەڵیان سەلماندوویەتی کـە بـە هـیچ جـۆر واز لـە پـیلان و نەخشـەی جـەنگ و پـەیمان بەسـتن بـۆ هێرشـکردنە سـەر موسـڵمانان ناهێنن، ئێستا چار ناچارە، ناکرێ سوپای موسڵمانان لە بەرگری و بەرەوانی لە خـۆی بێت و گەلێ جار بچێتە دەرەوەی (مەدینە) و (مەککە)، کەچی هێشتا لە پایتەختەکەی ئەمین نەبیت، لەبەرئەوە دەبێ ناوچەکەیانی لێ پاك بکرێتەوە، وەکو هەر دەوڵەتێك لە دنیادا مافی پێدراوە: هەرکەسـێك ببێتـە هـۆی تێکـدانی (ئـەمنی قـەومی) ولاّتەکـەی، بەتایبەتی لە ولاّتەکەیدا و پاش تاقیکردنـەوەو ئـەزموونێکی دووروو درێـژ کـە بـە هـیچ

جۆرێك نایەتە سەر مێزی ڕێکەوتن، هەرکاتێکیش هاتبێ لاواز و بێ دەسەلاًت بووەو بۆ هەل و فورسەت گەڕاوە..

خـوا بەوانـە دەفـەرموێ: ﴿ كَيْفَ وَإِن يَظْهَرُوا عَلَيْكُمْ لَا يَرْقُبُوا فِيكُمْ إِلًّا وَلَا ذِمَّةً ... ﴾ (التوبة:٨). چۆن پەیمانێکیان لەگەڵ دەبەستن کە تاقیکردنەوە سەلماندوویانە هەرکات بزانن پێتان دەوێرن، گوێ نادەنە سوێند خۆری و خزمایەتی.. ئیتر لەگەڵ ئەوانەی نییە کە حورمەتی سوێند خۆرییان لایە، بۆ نموونە: کاتێك (بەنی بەکر) چوو بە گژ (خوزاعە) ی هاوپەیمانی پێغەمبەردا ﷺ، بەشێکیان بەشدارییان نەکرد، لەبەر ئەوە پەیمانەکەیان هەر مایەوەو مامەڵەی تایبەتیان لەگەڵ کرا.

* ئایەتی (٢٣)ی هەمان سوورەت: ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَتَّخِذُوا آبَاءَكُمْ وَإِخْوَانَكُمْ أَوْلِيَاءَ إِنِ اسْتَحَبُّوا الْكُفْرَ عَلَى الْإِيمَانِ ... ﴾ (التوبة: ٢٣) بەواتای: ئەی گرۆی خاوەن باوەڕان! ئەگەر باب و برای ئێوە لایان وابوو کوفرو نا باوەری لە ئیمان و باوەر هێنان باشترە، ئێوە مەیانگرنە دۆست (لەسەر حسابی عەقیدەو ئایدۆلۆژیا).

بەڵێ عەقیدەو باوەڕ دەبێ تەنها بۆ خوا بێت، لەهەر پەیوەندییەکی خزمایەتی، نیشتمانی، نەتەوەیی بەهێزتر بێت، نابێت لەبەر ئەوشتانە خاو بیتەوەو سست و کاڵ و کرچ بیت لە ئیمانەکەتدا، ئەگینا دەبیتە (موشریك) وەك ئەوان.

(قورتوبی) دەڵێت: (والإحسان والهبة مستثناة من الولاية) واتە: پیاوەتی و چاکە کردن و هەیبە و بەخشین بە خزمانی خوانەناس و موشریك، لەو دۆستایەتییە جیا کراوەتەوە.. واتە: لەگەڵ باوکی موشریکدا، برای موشریکدا.. هتد، دەتوانی هەموو جۆرە سەردان و هاتووچۆ و هاوکارییەك بکەین. ئیمامی (بوخاریی) دەڵێت: (ئەسما) گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ! ((قدمت علي أمي راغبة في عهد قريب وهي راغمة مشركة، فقلت يا رسول الله إن أمي قدمت علي وهي راغمة مشركة، أفأصلها؟ قال: نعم، صلي أمك))[٥٥] دایکم لە مەککەوە هاتووە بۆ لام و حەز دەکات بمبینێ -

(٥٥)رواه البخاري ومسلم/ أنظر صحيح الترغيب والترهيب: ٢٢

لەهەمانکاتیشدا موشریکەیشە - مەگەر دەتوانم بیبینم؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: سەری لێبدەو سیلەی رەحم جێبەجێ بکە.

لە سوورەتی (لوقمان) دا بەرامبەر بە دایك و باوك دەفەرمووێ: ﴿ وَإِن جَـٰهَدَاكَ عَلَىٰٓ أَن تُشْرِكَ بِى مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ فَلَا تُطِعْهُمَا ۖ وَصَاحِبْهُمَا فِى ٱلدُّنْيَا مَعْرُوفًا ۖ ... ﴾ (لقمان: ١٥) واتە: ئەگەر بۆ شیرك و بتپەرستی زۆریان لێکردیت (دایك و باوکت) بەگوێیان مەکە، بەڵام بۆ کاری دنیاو ژیان و بژێویی و چاکەو پیاوەتی هاوڕێیان بە.

کاك جەلال! حەز دەکەم کەمێك قوڵتر لەم جێگەیەدا قسە بکەین، مەسەلەی دۆستایەتی و خۆشەویستی لەسەر حسابی عەقیدەو باوەر لەگەڵ کافران شتێکەو (پیاوەتی چاکەو سەردانیشیان بە پێی عورف و باوی کۆمەڵگە شتێکی ترە، یەکەمیان رێی لێگیراوە، واتە: نابێ لەهەر رێگەیەکەوە زیان بە موسڵمانان بگات، لەو رێگەیەوە بچێتە پێش لێیان، وەکو مەسەلەکەی (حاطب بن بلتعة)، دووەمیشیان (چاکەو پیاوەتی و لێپێچانەوەو سەردان و بێرەو بچۆ) بەدەقی قورئانی پیرۆز رێ پێدراوە، ئەگەرچی ئەو کەسە کافرو خوا نەناسیش بێت، بەمەرجێ نەیەنە سەرتان و شەڕتان پێ نەفرۆشن و هاوکاری خەڵکانی تر نەکەن بۆ گەلەکۆمێ لەگەڵتان، وەکو لە سوورەتی (مومتەحینە) ئایەتی (٨ - ٩)دا دەفەرموێ: ﴿ لَّا يَنْهَىٰكُمُ ٱللَّهُ عَنِ ٱلَّذِينَ لَمْ يُقَـٰتِلُوكُمْ فِى ٱلدِّينِ وَلَمْ يُخْرِجُوكُم مِّن دِيَـٰرِكُمْ أَن تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوٓا۟ إِلَيْهِمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُقْسِطِينَ ﴿٨﴾ إِنَّمَا يَنْهَىٰكُمُ ٱللَّهُ عَنِ ٱلَّذِينَ قَـٰتَلُوكُمْ فِى ٱلدِّينِ وَأَخْرَجُوكُم مِّن دِيَـٰرِكُمْ وَظَـٰهَرُوا۟ عَلَىٰٓ إِخْرَاجِكُمْ أَن تَوَلَّوْهُمْ ۚ وَمَن يَتَوَلَّهُمْ فَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّـٰلِمُونَ ﴾ (الممتحنة: ٨-٩)

واتە: خوا رێتان لێناگرێ کە ئێوە لەگەڵ ئەوانەی بە گژتاندا نەچوون و لە زێدەوە دەریان نەناون، چاکەیان دەربارە بکەن و بە یەکسانی رەفتاریان لەگەڵ بکەن، خوا مرۆڤی خاوەن ئینسافی خۆش دەوێت.، تەنها لەگەڵ ئەوانەدا رێگەتان نادات ببنە دۆست، کە لەسەر دین شەریان لەگەڵ کردوون و ئێوەیان لە زێدی خۆتان ئاوارە کرد، لەسەر دەرکردنیشتان بوونە پشتیوانی یەکتر، هەرکەسیش ببێتە دۆستی ئەوانە، دیارە ستەمکارەو ناهەقی کردووە.

ماناو مەبەستی ئەم دوو ئایەتەی بەردەستمان بوونەتە بنەرەت و بنچینە بۆ مامەڵە کردن لەگەڵ خەڵکانی نا موسڵمان تا ڕۆژی قیامەت، ئەو ئایەت و فەرموودانەش کە ڕێ لە دۆستایەتی دەگرن، ئەو کافرانەن هەمیشە دژایەتی و نەیاری موسڵمانان دەکەن و، لەگەڵ ئەم و ئەو دەبنە هاوپەیمان بۆ جەنگ لەگەڵ موسڵمانانداو دەر پەڕاندنیان لە زێدی خۆیان، بۆیە لە سوورەتی (تەوبە)دا پاش تاقیکردنەوەی هەموو شێوەو شێوازێکی پێکەوە ژیان و ئەوان هەر خەریکی پیلان بوون، کۆتا بڕیاری بۆ دەرکردن و ئاگاداری کردن بەو دوو خاڵە لە ئایەتی (٨) دا باسمان کردن. ! بەڵێ هەرلایەنێك خاوەن پەیمان و خاوەن وەفایە بە پەیمانەکەی، ڕێز لە خۆیی و پەیمانەکەی دەگیردرێ، مەگەر نیشانەی هەڵوەشانەوەی لێ دەرکەوێ، ئەوکاتە بە پێی ئەم ئایەتە کە خوا دەفەرمووێ: ﴿ وَإِمَّا تَخَافَنَّ مِن قَوۡمٍ خِيَانَةً فَٱنۢبِذۡ إِلَيۡهِمۡ عَلَىٰ سَوَآءٍۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلۡخَآئِنِينَ ﴾ (الأنفال: ٥٨) ئاگادار دەکرێتەوەو پێی رادەگەیەنرێت کە هیچ پەیمانێکی نەماوەو بە نەیار دەدرێتە قەڵەم، تا ئەویش حسابی خۆی بزانێ و چی دەکات بیکاو، نەشبێتە خیانەت، ئەو خۆی بە خاوەن پەیمان بزانێ و تۆش بە خاوەن پەیمان نەزانێت.

* ئایەتی (٢٨) ی سوورەتی (آل عمران): ﴿ لَّا يَتَّخِذِ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ٱلۡكَٰفِرِينَ أَوۡلِيَآءَ مِن دُونِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَۖ ﴾ (آل عمران: ٢٨). واتە: (با باوەڕداران، جگە لە باوەرداران نەگرن بە دۆست..) ڕێ لە موسڵمانان دەگرێت کافران بگرنە دۆست، مەبەست بەو دۆستایەتیە، دۆستایەتییەکە لەسەر حسابی عەقیدەو ئایدۆلۆژیاو لەناخی دڵەوە بێت، خۆ ئەگەر لەلایەنی کۆمەڵایەتییەوە بوو، وەکو سەردان و هاوکاری و بەخشش و هەدیەو دیاری قەیدی نییە، هەر ئەم مانایەش مەبەستە لەم ئایەتانە کە دەفەرموون: ﴿ لَّا يَتَّخِذِ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ٱلۡكَٰفِرِينَ أَوۡلِيَآءَ مِن دُونِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَۖ ... ﴾ (آل عمران: ٢٨) ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ ٱلۡيَهُودَ وَٱلنَّصَٰرَىٰٓ أَوۡلِيَآءَۘ بَعۡضُهُمۡ أَوۡلِيَآءُ بَعۡضٖۚ وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمۡ فَإِنَّهُۥ مِنۡهُمۡۗ ... ﴾ (المائدة: ٥١) ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ عَدُوِّي وَعَدُوَّكُمۡ أَوۡلِيَآءَ تُلۡقُونَ إِلَيۡهِم بِٱلۡمَوَدَّةِ ... ﴾ (الممتحنة: ١).

*** ئایەتی (٤ / محمد) کە دەفـــەرموێ: ﴿ فَإِذَا لَقِيتُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فَضَرْبَ ٱلرِّقَابِ... ﴾** (محمد: ٤) **واتە: هەرکات توشی ئەو کافرانە بوون - لــە جەنگــدا - لــە ملیان دەن.**

ئەم ئایەتەی سوورەتی (محمد) بە چەند قۆناغێك بـەر لـە سـوورەتی (بەرائـە) هـات، بۆیە دەفەرموێ: هەرکات تووشیان بوون لە جەنگدا ئەوکات جـەنگیان لەگەڵدا بکـەن، بەڵام بۆ دوایی خوانەناسان کە هەر خەریکی پیلان و فات و فیـت بـوون و خـەریك بـوو پایتەختەکەشیان لێ داگیر بکـەن، ئـەوکات سـەرەتای سـوورەتی (بەرائـە) هـات و ئـەو بریارانەی دا کە لەوێ باسکران.

جا کەوابوو چ نەنگ و عەیبێکی تێدایە ئەگەر لـە (قیـادەو سـەرکردایەتیەوە)وە هـانی سەربازەکان بدرێ بۆ دەست وەشاندن لەو جۆرە مرۆڤـە شـەڕ فرۆشـانە کـە تەنانـەتی تەماعیشیان کردبوویە سەرکردایەتی و پایتەختەکەیان ؟.

## بەشی پێنجەم:

كاك جەلال رەخنە دەگرێ و دەڵێ: چۆن باسی ئـازادی كتێبـدارەكان (أهـل الكتـاب) دەكەن، لە كاتێكدا قورئان نزیكەی (٢٠٠٠) هەزار ئایەتی دژی كتێبدارەكان نووسراون و **تیایاندا كراون بە (مـەیموون) و (بـەراز)**و جگـە لـەوەیش ئەگـەر لیژنەیـەكی پسـپۆڕ ببرێتە ناو شاری مەدینە، ئەوا دەركەوتنی ئێسـك و پروسـكی گـۆڕی بـە كۆمـەڵی ئـەم خاوەن كتێبانە دەردەكەون كە لەسەر دەستی (محمـد) جێنۆسـایدكراون..؟. جـا بـەر لەوە لەبارەی ئەو رەخنـەوە شـتێك بڵـێین: پێویسـتە بزانـرێ كـە (یهـوود)ی كتێبـدار، مێژوویەكی زۆر دوروو درێژیان هەیەو بە پێنج قۆناغدا تێپەڕیون:

١- لە (١٦٤٥) ی پێش میلاد- تا (١٩٩٦) ی پێش مـیلاد كـە دەكاتـە (٣٥١) ی پـێش میلاد.

٢- لەوێوە بۆ (١٠٨٠)ی پێش میلاد، واتە: (٥٦٥) ساڵ .

٣- لەوەوە بۆ (١٦١٦) واتە: (٥٣٦) ساڵ .

٤ - (٥٨٧) ساڵ پێش لە دایكبوون .

٥ - ١٣٥ ساڵ پاش لەدایكبوون، تا سەدەی نۆزدە، وەكو لە (دائرة المعـارف)ی بـەرێز (فرید وجدی) دا هاتووە، بێگومان لەو ماوەیەدا مەگەر هـەر خـوا بزانـێ چـیانكرد دژی نەتەوەكانی ترو خۆیشیان چییان هێنا بە سەرخۆیاندا، تەنانـەتی لەگـەڵ رۆمانیەكانـدا رێكـەوتن بـۆ (ئیعـدام)و لـە نـاوبردنی (عیسـا) پێغەمبـەر، گاورەكـانیش پێیـان وایـە ئیعدامكرا ! ئەگەرچی ئەمە پێچەوانەی دیدو بۆچـوونی دەقـەكانی قورئـانی پـیرۆزە ! بێ سۆ قۆناغێكی دوورو درێژ لـە مێـژووی گـەلێكی ئـاوای پـڕ لـە ناسـۆرو سـەركەوتن، دەبـێ ئێسـتایش زۆریـان لەگـەڵ بگـوترێ و زۆرێـك لـەو نـازو نیعمەتانـەیان وە بـیر بهێنرێتەوە كە خـوا پێیـدان، هـەر لـە پاشـایەتیی و پێغەمبـەرێتی و رزگاركردنیـان لـە دەست دام و دەزگاكانی فیرعەون و.. هتد، بۆ ئەوە پێیـان بگـوترێ هەقـە ئێـوە ئـەی یەهوود ! بەر لـە هـەموو كـەس بـاوەڕ بـەم پێغەمبـەرە تازەیـەو پەیامەكـەی بكـەن و

دینەکەی قبووڵ بکەن، بۆیە دوو بەشی جزمی یەکەمی سوورەتی بەقـەرە بـە (یا بنـی إسراءیل) لەوان باس دەکات: جاریٚ نیعمەتەکانی خوایان وەبیر دێنیٚ، جاریٚ هەڵـەکان و سەرزەنشتیان دەکات. باشـە گـەلێکی خـاوەن مێـژووی ئـاوا هەقـە بچێت گوێرەکـە بپەرسێت ؟ هەقە لەبەر - عینادی- بە مووسا بڵێن: تـا خـوا بـە چـاوی سـەر نـەبینین باوەڕت پێناکەین ؟ هەقە بچن فێڵ لە مووسا پێغەمبەر بکەن بۆ گرتنی ماسییەکان لـە ڕۆژی شەمەدا ؟ گەلێك خاتوو مەریەم تۆمەتبار بکات بە زیناو داوێن تەڕی ..! گـەلێك .. گەلێك.. ئەگەر خوا - وەك تۆڵە — مەسخیان بکاتەوەو هەنـدیٚ ببنـە (مـەیموون) و، هەندیٚ (بەراز) و قورئان بیگێڕێتەوە چ نا ئازادییەکی تێدایە ؟ خۆ دەبیٚ مێـژوو وەکـو خۆی باس بکریٚ، کیٚ چاکە، چاکە، کێیش خراپە خراپە، سەرەرای ئەمەش لـە هـەموو قورئاندا لە سیٚ جێگادا ئەو باسە هاتووە: ئایەتی: (٦٥) ی سوورەتی بەقەرە. ئایەتی (٦٠) ی مائیدە و، (١٦٦) ی ئەعراف .

## چەند تێبنییەک:

١- ئایـەتی: ﴿ وَلَقَدْ عَلِمْتُمُ ٱلَّذِينَ ٱعْتَدَوْا۟ مِنكُمْ فِى ٱلسَّبْتِ فَقُلْنَا لَهُمْ كُونُوا۟ قِرَدَةً خَٰسِـِٔينَ ﴾ (البقـرة: ٦٥) واتە: دڵنیابن زانیوتانە چیمان بەسەر ئەوانەدا هێنا ڕۆژانی شەممە دەست درێژیان کـردو لـە سـنوور دەرچـوون، ئینجـا بڕیارمانـدا ببنـە مـەیموونی دوور لـە میهرەبـانی و دەلۆڤان .

٢ — ئایـەتی: ﴿ وَسْـَٔلْهُمْ عَنِ ٱلْقَرْيَةِ ٱلَّتِى كَانَتْ حَاضِرَةَ ٱلْبَحْرِ إِذْ يَعْدُونَ فِى ٱلسَّبْتِ ... ﴾ (الأعراف: ١٦٣). لێیان بپرسە ئەوشارەی لـە سـەر قـەراخی دەریـابوو کـە ڕۆژی شـەممە سنوورشکێنییان کرد.. چـییان بـە سـەر هـات؟ بـە راشـکاوی رای دەگەیـەنن کـە ئـەو مەسەلە بە فیعلی روویداوە، وە جوولەکەی سەردەمیش پێیانزانیوە و لێی بە ئاگان.

هەندیٚ تەفسیر دەڵێن: دوای ئەوە خوا قاری لێگرتن و کلکی مەیموونی لـیٚ ڕوانـدن و هەندێکیشیان کلکی بەراز، هەر وەکو مەیموون و بەرازیش دەنگیان دەهـات، ئـەوانیش

لە شەرمەزاریا لە ماڵ دەر نەدەچوون بۆ سەر ئیش و کارەکانیان، خەڵك چوو بۆ چاودێری حاڵیان و دیتیانن مەسخ بوونەتەوەو بە ئاماژە دەهاتنە ئاخاوتن! پاشان لە خەجاڵەتیا هەندێ ناوچەکەیان بەجێهێشت و بەرەو وڵاتی میسر چوون، بەڵام لەرێگەدا تیاچوون، هەندێکیشیان هەر لەماڵەوە مانەوەو مردن، خەڵکانی تر بە پێی عادەتی خۆیان مۆمیایان کردن و لە تابووتی تەختەدا دایاننان، جا بۆ دوایی لە ساڵی (٢٠٠٠) هەندێ شوێنەوارناس گۆرستانیان دۆزییەوە ئەو مۆمیانەیان دەرهێناو وێنەیان گرتن.

**چـــپەیەک**: باشە! چەند ساڵە (داروین) جاڕ دەدا کە مرۆڤ لە بنەرەتدا (مەیموون)ـەو کەسێکی ئەوتۆش نییە رەتی بکاتەوەو عەلمانییەکانیش حەزی لێدەکەن لەو مەیموونانە بن،! ئەی بۆچی ئەگەر خوا قاری لە خەڵکێکی لاسار وەك جوولەکە گرتبێ و کردبێتی بە مەیموون، ئاوا دەکەونە بەرگریی و هەزار سوێندیان بۆ دەخۆن کە شتی وا نەبووە! ئەمەیە مەنێك و دوو پێوانەیە!.

گەلێك وەکو مەسیحییەکان پێیان وابێت کە خودا لە سێ ئوقنوم (الله، الابن، روح القدس) پێکهاتووە! نابێ بڵێت: ﴿لَّقَدۡ كَفَرَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ ثَالِثُ ثَلَٰثَةٖۘ .... ﴾ (المائدة: ٧٣) ؟ خەڵکانێك پێیان وابێت (عیسا) کوڕی خودایە! نابێ ئەو بۆچوونە هەڵەیەیان ئاشکرا بکاو پێیان بڵێ: ﴿ لَّقَدۡ كَفَرَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلۡمَسِيحُ ٱبۡنُ مَرۡيَمَۚ .. ﴾ (المائدة: ١٧) ؟ ئەمانەو سەدان هەڵەو بۆچوونە ناراستەکانی تریان شیدەکاتەوە، لە هەمانکاتیشدا – وەکو لە جێگەی خۆیدا باسکرا – لە شێوەی دینداری خۆیاندا ئازادو سەربەستن و رێیان لێناگیردرێ.

ئیسلام لەسەر بنەمای یەکخواپەرستیی دامەزراوە، ئیسلام هاتووە کۆمەڵە ئەخلاق و قییەمێك لە کۆمەڵگادا بنیات بنێ، هەقیەتی عەقیدەی (تثليث الإله)و کردنی عیسا بە کوڕی خوداو، درۆو دەلەسەو فێڵ و فەرەج و سوود خواردن وخەیانەت و پیلانی تریان باس بکات بۆ مەردم، تا خەڵکانی تر وەدوویان نەکەون.!

*** مەسەلەی گۆڕی بە کۆمەڵی کتێبدارەکان لە شاری (مەدینە)دا** - وەکو تۆ دەڵێیت، بۆ راستیی و ناراستیی ئەو هەواڵە — ئەگەرچی هەندێ سەرچاوەیش باسی بکات — ئێمە بەڵگەیەکی ئەوتۆمان بە دەستەوە نییە، بەلام گریمان راستیش بێت، دەبێ کورتە مێژوویەکی (یەهوود)ی کتێبدار باس بکەین کە چۆن شەووو رۆژ گەلەکۆمێ و پێکەوەنانی دەستەو بەستە بوو دژ بە پێغەمبەر ﷺ و دەیان ویست بەهەر شێوەیەك بووە ریشەکەنی بکەن و کپی بکەنەوەو بەیەك دەست لێیدەن !. هەموو سەرچاوەکانی (سیرە)و ژیننامەی پێغەمبەر ﷺ دەڵێن: هۆکاری هەڵگیرسانی شەڕی (ئەحزاب = خەندەق)یش هەر یەهوود بوو، چونکە کاتێ دیتیان پێغەمبەر ﷺ لە جەنگی ئوحود سەرکەوت، ئەمان ئاگری حیقدو حەسادەت بەربووە جەستەیان و سەرۆکەکانیان: (سلام بن أبي الحقيق، سلام بن مشكم، كنانة بن الربيع..) پەیوەندیان بە قورەیشەوە کردو هەڵیان نان کە هێرش بکەنە سەر پێغەمبەر ﷺ، ئەمانیش هاوەڵ و هاوکارێکی باش دەبن و، پاشان قورەیش سازبوون و پەیوەندییان بە (غطفان)و خێڵەکانی ترەوە کردو ئەوانیشیان ئامادەکرد، بۆ دواییش هۆزەکانی (بنی سليم، بنو أسد، فزارة، أشجع، بنو مرة)یش پشتگیرییان لێکردن و بە هەموویانەوە (١٠) هەزار کەسیان ئامادە کرد بە سەرۆکایەتی (أبو سفيان)و ڕوویان لە مەدینە کردو نزیکەی (٢٠) شەو مەدینە لە گەمارۆدا بوو، هەندێ جاریش ئەوەند نزیك دەبوونەوە هێرشیان بۆ سەر ماڵی پێغەمبەر ﷺ دەکرد! پێغەمبەرو هاوەڵان نەیان دەتوانی وەکو پێویست نوێژەکەشیان بکەن، لەبەر ئەوەبوو فەرمووی: ((شغلونا عن الصلاة الوسطى، صلاة العصر، ملأ الله أجوافهم، وقبورهم نارا))[٥٦]. دەبێ ئاماژە بۆ ئەوەیش بکەین کە هەر هاتە مەدینە رێکەوتننامەیەکی لەگەڵ مۆرکردن، لە بەشێکیدا هاتبوو: (.. وأن قبائل يهود أمة مع المؤمنين، لليهود دينهم، وللمسلمين دينهم.. وأن بينهم النصر على من حارب أهل هذه الصحيفة، وأن بينهم النصح والنصيحة والبر دون الإثم، وأن بينهم

---

(٥٦) صحيح مسلم – كتاب المساجد ومواضع الصلاة، باب الدليل لمن قال الصلاة الوسطى هي صلاة العصر – حديث : ١٠٣١

النصر على من دهم يثرب..) لەگەڵ ئەوەیشدا کە بوونە هۆی هەڵگیرساندنی جەنگی (خندق) و پاشانیش، کە پێغەمبەر ﷺ تازە لەو جەنگە گەڕابوونەوە، هاتن (١٥٠٠) شێر و (٢٠٠٠) هەزار ڕم و (٣٠٠) دیرع و (٥٠٠) مەتاڵەیان، بۆ ریشە کێشکردنی موسڵمانەکان ئامادە کرد، پێغەمبەریش ﷺ هەر چەند لە ئەحزاب تازە گەڕابوویەوە، بە ناچاری (٣٠٠٠) کەسی بردە سەریان و گەمارۆیدان و خۆیان تووشی ئەو تۆڵەیە کرد!.

Bodley،R.V.C لە کتێبی (حياة محمد الرسول) دەڵێت: موحەممەد ئەو دەمە ئەوان ویستیان بێنە سەری، تەنها خۆی بوو لە نیوە دوورگەی عەرەبیی، ئەو دەڤەرەش رووبەرەکەی سێیەکی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بوو، ژمارەی دانیشتوانیشی (٥) ملیۆن کەس بوو، تەنها نزیکەی (٣٠٠٠) هەزار سەربازێکی هەبوو بۆ پاراستنی ئەو هەموو رووبەرە، جگە لەوەیش وەکو پێویست پڕ چەك نەبوون، جا ئەگەر (موحەممەد) لەم مەسەلەیەدا سەرنەکەوتباو، ئەو تۆڵەیەی (بنی قريظة)ی نەدابا.. ئیتر جارێکی تر ئیسلام لە نیوە دوورگەی عەرەبیدا نەدەما، بێگومان کە ئەو تۆڵە بەو جۆرەیە سەخت بوو، بەڵام خۆ وە نەبێ لە مێژوودا تەنها "موحەممەد" کاری وایکردبێت، ئینجا موسڵمانەکان و هاوەڵانی بە هەقیان زانی، تیرەکانی عەرەب و یەهوودیش پاش ئەو تۆڵەیە جارێکی تر، بیر لە خەیانەت و پەیمان شکێنی ناکەنەوە، هەر بەوەش سەربازگەی نیفاق و مونافقەکان پۆزەیان شکا، شیاوی باسە، ئەمەی ئەم کردی لەگەڵ یاسای جەنگ لە شەریعەتی (بنی ئیسرائیل) خۆیاندا رێی پێدراوە، ئەوەتە لە (سفر التثنية /الإصحاح: العشرون: ١٠-١١-١٢-١٣) هاتووە: لە هەر شارێك نزيك بوویتەوە (مەبەستی جەنگاوەرەکانە) بانگیان بکە بۆ ئاشتیی و سازش، جا ئەگەر وەڵامیان دایتەوەو شارەکەت بۆ فەتح بوو، ئەوە تەواوی خەڵکەکەیت بۆ رام دەبێ و دەبنە کۆیلەت، خۆ ئەگەر لەگەڵت رێك نەکەوتن و بەشەڕ هاتن، گەمارۆیان بکە، جا ئەگەر خواسەریخستیت بە سەریاندا، بە شیر لە ملی تەواوی نێرینەکانیان

بدەو، ژن و منداڵەکانیشیان دەبنە دەسکەوت و غەنیمەت بۆت، واتە: کاری بەو شێوەیە لە تەوراتەکەی خۆیاندا هاتووەو ئەگەر ئەوان سەرکەون پەیڕەوی دەکەن. !

ئیسلام بۆ ئەوە هات کە مرۆڤ لە هیچ شتێك نەترسێ و هیچ شتێك - جگە لە "الله" — نە پەرستێ: ﴿ ...فَلَا تَخۡشَوُاْ ٱلنَّاسَ وَٱخۡشَوۡنِ ... ﴾ (المائدة: ٤٤).

خاوەنی کتێبی (كشف الآثار في قصص أنبياء بني إسرائيل) لە نووسینی پیاوێکی (نەصرانیی) دەڵێت: (قسطنطين الأعظم) فەرمانی دا بە بڕینی گوێی (یەهوود)و دەرپەڕاندنیان لە زێدی خۆیان و ناردنیان بۆ چەند هەرێمێکی دی، پاشان (ئیمپراطور)ی رۆمی سەدەی خەبات دەکاو، پێنجەم بڕیاری دا بە دەرکردنی یەهوود لە (ئیسکەندەریە)و وێرانکردنی کەنیشتەکانیان. بڕوانە لاپەڕە: ٢٧. هەروەها هەمان سەرچاوە دەڵێ: (وقد ثبت تأريخيا أن اليهود أجلوا من فرنسا سبع مرات.. لاپەڕە: ٣٠ – ٣١. وحدث لهم فى النمسا وإسبانيا وبريطانيا من القتل والطرد والإكراه الكثير.. وقد أجلى (إدوارد الأول) ملك بريطانيا خمسة عشر ألفا بعد أن نهب أموالهم) لاپەڕە: ٣٢. (ويذكر (توماس نيوتن) فى كتابه عن نبوآت الكتب المقدسة، أن النصارى عند ما فتحوا بيت المقدس فى الحروب الصليبية قتلوا أكثر من سبعين ألفا من المسلمين) . وقتل في فرنسا في مذبحة واحدة — وهى الشهيرة بمذبحة (برتولاوس) واحد وثلاثون ألفا من البروتستانت. وقتلت محاكم التفتيش حرقا بالنار حوالي مأتين وثلاثين .. هذا من غير المسلمين. أما المسلمون فقد ذكرنا أنه لم يبق في إسبانيا من الثلاثين مليونا من المسلمين مسلم واحد ! كلهم غدر بهم، فمن قتيل أو طريد أومكره على تغيير دينه .

کاك جەلال! ئەو گۆڕە بەکۆمەڵە تۆ باسی دەکەیت، وەکو لە پێشەوە گوتم ئێمە نازانین ئاخۆ راستە یانا ؟ بەڵام نموونەی کاری وا بەرامبەر بە موسڵمانان و، تەنانەتی غەیرە موسڵمانانیش زۆر روویداوە لە مێژوودا، لەو نووسینە عەرەبییەدا بێ وەرگێڕان هەندێکم باسکرد، بەڵام دڵنیابە سەد ئەوەندەو هەزار ئەوەندەش سەختر لەوە کراوە

بە ئینسانەکان، سەرچاوە گەلێك دەڵێ: شیووعییەکانی (رووس) بۆ سەقامگیرکردنی دەسەلأت لە رووسیا (١٩) ملیۆن خەڵکی ژێر دەستەی خۆیانیان کوشتووە.

کاك (جەلال) ! ئەوەش بزانە چونکە ئیسلام لە دوای ئەو دینانەوە هاتووەو ئەوانی (نەسخ) کردۆتەوە، بە سەدان درۆو پڕوپاگەندەیان بۆ هەڵبەستووەو خزێنراوەتە سەرچاوە ئیسلامییەکانەوە، تەنانەتی دەسکاری هەندێ (فەرموودە)شیان کردووە، بۆیە ئێستا - سوپاس بۆ خودا- دەیان بەڵکو سەدان زاناو پسپۆر لە بواری فەرموودە ناسین و و مێژووی ئیسلامدا شەووو رۆژ خەریکن شەن و کەوی فەرموودەو مێژووەکەی دەکەن، لەم دواییەدا بوو زانایەك بە ناوی (ئەلبانی/ خوا لێیخۆش بێت) چەند بەرگێکی لەو بارەوە شەن و کەو کردو ناوی نان: (الأحاديث الصحيحة) و (الأحايث الضعيفة) سەرەرای زانا پێشووەکانمان — رەحمەتی خودایان لێ بێت — هەر وەك لە مێژووی (طبري) کۆڵیونەتەوەو لە بێژنگ دراوە، جا لەبەر ئەوە هەر راو بۆ چوونێك لەگەڵ قورئان، وە یان لەگەڵ فەرموودەکاندا دژ بووەستێ، لای ئێمە پەسەند ناکرێ و باوەڕی پێناکەین و بە هەڵبەسراوی دەزانین. !

**سەبارەت بەوە کە ئێمە وتبێتمان: نابێ (پەرلەمان) هەموو جۆرە بیروو بۆ چوونێکی تیا کۆ ببێتەوەو بگوترێ ئەمە بڕیاری گەلە** .. پاشان هێرشێکی خۆت ئاسایی دەکەیت! جا بۆ روونکردنەوەی ئەو (مەقوولە)یە دەڵێین: لە جیهانی ئیسلامدا بە تایبەتی، دەبێ هەر دینی ئیسلام سەرکەوێ و بڕیارەکانی ئەویش باڵادەستبن، دیارە لە پەرلەمانیشدا هەروا، وادەزانم ئەمەش مافی هەموو حکوومەت و حیزبێکە، لە کاتێکدا زۆرینەی دانیشتوانی ئەو دەڤەرە هەڵگری بیرو رای ئەوبن، بێگومان دەبێ پەرلەمانیش لەوان پێك بێت، خۆ لەگەڵ ئەوەیشدا دەبێ لەگەڵ هەموان بە عەدلی خودایی رەفتار بکرێ و هەموو مافێکیان بۆ مسۆگەر بکرێ. دیارە ئەوە تێروانین و بۆچوونی هەندێ لە زانا بەرجەستەکانی سەردەمە، وەکو (مەودودی) و هەندێکی دی، ئەگینا تەنها ئایەتێك یان فەرموودەیەك نەهاتووە رێ لە خەڵکانی ناموسڵمان بگرێت

بچنە پەرلەمانەوە بەرێژەی خۆیان، هەر بۆیە کۆماری ئێران، لە مادده (٦٤) ی دەستووردا دەڵێت: (.. وينتخب الزرادشت واليهود كل منهما نائبا واحدا، و ينتخب المسيحيون: الآشوريون و الكلدانيون معا نائبا واحدا، وينتخب المسيحيون الأرمن في الجنوب والشمال كل منهما نائبا واحدا..). وە لە کتێبی: (الحريات العامة في الدولة الإسلامية/ للشيخ الغنوشي) دا هاتووە: (أما غير المسلمين من مواطني الدولة الإسلامية، وهم الذين رضوا بإعطاء ولائهم كاملا للدولة الإسلامية.. فلا مانع من أن توكل إليهم الوظائف في أجهزة الدولة، وأن يتواجدوا في المؤسسة الشورية). هەروەها بەرێز(عەبدولکەریم زەیدان) لە کتێبی (أحكام أهل الذمة) وە بەرێزان (فەتحی عوسمان) و، (ئیسماعیل الفاروقی) و، (فهمی هویدی) هەریەك لەمانە ماف دەدەن بە غەیرە موسڵمان لە شورادا ئەندامێتی هەبێ بە پێی رێژەی خۆی.

کەوابوو ئەگەر ئەو غەیرە دینانە کە لە دەوڵەتێکی ئیسلامیدا دەژین و رێزیان لە بنەماکانی ئیسلام دەگرت، ئەوا دەکرێنە ئەندام، خۆئەگەر دژایەتیان دەکردو هەوڵی لاواز کردن و لە ریشە هێنانیان دەدا، ئەوا رێگە نادرێت.

*** سەبارەت بەوە کە هەریەک لە گرووپەکان - وەکو تۆ دەڵێیت - خۆی بە خودا دەزانێ و پاشان سیناریۆکەی (شێخ زانا) یش!**

بۆ ئەوە دەڵێین: هیچ گرووپێکی ئیسلامیی نییە خۆی بە خودا بزانێ، بەڵکو هەموو خۆیان بە بەندەی خودا دەزانن و بۆ خوا کار دەکەن و دژ بە بێ ئەخلاقیی و ناعەدالەتیی و دیکتاتۆری و ئیستیبداد بە ئیجتیهادێکی ئیسلامیانە تێدەکۆشن، چۆن بۆیان بگونجێ خۆیان ئامادە دەکەن و کاری بۆ دەکەن،

خۆ ئەوکەسانەش بۆیە لە دەستووری ئیسلامیی دەترسن - چونکە رێگا بە قومار بازیی و ئارەقخواردنەوەو رابواردنی ناشەرعیی و تێکەڵی نێرو مێ بە غەیرە شەرعیی نادات — هەر ئەوانەن هەمیشە لێی دەترسن و دژایەتی دەکەن و نایانەوێ ببێ! هەر لەبەر ئەوەیشە هەرکات ئەم موسوڵمانانە جووڵانەوە سەد درۆو دەلەسەیان بۆ

هەڵدەبەستن، لەگەڵ دروست کردنی سەد سیناریۆ کە مەگەر هەر خودا خۆی بزانێ چەندە راستە.!

**سیناریۆکەی شێخ زانایش** من ناچمە ناو تەفاصیلەکەیەوە، چونکە خۆت دەتوانی لە دەسەلآت و هاولآتیانی هەولێر ئەو راستیە وەرگری، کورد گوتەنی: (ئەو هەویرە ئاوی زۆری دەوێ) لەوان بپرسە: ئەو وەخت دەزانی کێ شێخ زانای دروست کردو بۆچی دروستی کرد، خۆ دەزانی ئەو ماوە کە هێمان لەگەڵ دەسەلآتی هەولێردا تێکنەچووبوون چەند ئەندامی نەیاری خۆیانیان پێکوشت ! بەلآم کە دنیا گۆراوو بەرنامەش گۆرا، ناچار بوون ئەو سیناریۆیە دروست بکەن!! موسوڵمان ئەگەر موسڵمان بێت، قەت فاحیشەچی نیە، دەبێ بە فەرمانی کێ دەستبازی، یان مومارەسەی جینسی لەگەڵ کچان بکەن و بە کامێرا وێنەی بگرن؟ کام ئایەت و فەرموودە، یان کام حیزب و لایەنی ئیسلامیی ئەوەی لا حەلآڵە ؟!، بێگومان ئەوە لە ئەخلاقیاتی موسڵمانان نەبینراوەو ناوەشێتەوە، کاری وا تەنهاو تەنها بە خەڵکانی بێ دین و عەلمانی دەکرێت، ئەمە لەلایەکەوە، لەلایەکی تریشەوە ئەوجۆرە شتانە لای عەلمانیەکان کەی جێگەی رەخنەو نەنگ و لەنگە، تا چەپڵەیان لێبدرێ ئەگەر مەبەست لیخنکردنی سومعەی موسڵمانان نەبێ بەگشتیی، هەر بۆیە مامۆستاو موسڵمانە راست و لە خۆ بوردووەکانی هەولێرو کوردستان بە توندی دژی ئەو سیناریۆیە وەستان و رەتیان کردەوە.

*** سەبارەت بەوەش کە ئێمە ناراستەوخۆ لە نیشتمان پەرستیی و نەتەوە پەرستیی دەدەین و بێ ئاگاین لەسردووی:(دینمانە، ئایینمانە، هەر نیشتمان)..** جابۆ وەڵامی ئەو رەخنەیە ئێمەش بەراشکاوانە دەڵێین: ئایینی پیرۆزی ئیسلام لەسەر بنەمای (تەوحیدو، یەکخواپەرستی) دامەزراوە، بۆیە بەهیچ کەسێك رێگا نادات غەیرەز خودا بپەرستێ، بەلآم خۆ مرۆڤەکان هەڵدەنێ نیشتمانیان لا خۆشەویست بێ و جیهادو خەبات بۆ ئازادبوونیی بکەن، بەدەر لەوەش

خۆ لای ئیسلامییەکان خۆشەویستی بۆ نیشتمان و خەبات بۆ پاراستنی و ئازادکردنی لە ژێر دەسەڵاتی داگیرکەراندا، بەشێکە لە دینداریيان، بەڵکو هەر دینداریٚ تێنەکۆشی بۆ ئازادی و پاراستنی نیشتمان بە موسڵمان دانانریٚ، کەوابوو سروودەکەی ئێوە کە تەعبیر لە نیشتمان پەرستی دەکات هەڵەیەو لای ئیسلامییەکان هیچ بایەخێکی نیە بەوجۆرە، ئێوە (پەرستن) و (خۆشەویست)یتان تێکەڵ کردووەو لێتان تێکچووە، بەڵام ئیسلامییەکان لەباتی پەرستنی، خۆشیان دەویٚ و بەگیان و بە ماڵ جیهادی بۆ دەکەن.

* **مەسەلەی ترس و (رأس الحكمة الخوف)** وەکو تۆ دەڵێیت، کە راستیەکەی (رأس الحكمة مخافة الله)یە لای ئێمە، گوایا لە سەرەتای ئیسلامەوە تا ئێستا ئیسلامییەکان لەناو خەڵکدا ترس دەچێنین بۆ دروێنەی ئەقڵیان، تا وایانکرد کە مرۆڤ (لە خودا، لە شەیتان، لە محمد، لە سەرکردەکان، لە شێخ، لە ئاغا، لە دایك و باوکی، لە مامۆستاکەی، لە قەبرستان، لە تاریکی.. هەتا ئەمریٚ هەر بترسیٚ..) ئینجا لێرەوە دەست دەکریٚ بە (شکاندنی چەند کەللە شەکر) و هەڕەشەو گوڕەشەیەکی بیٚ تام و دوور لە عەقڵیەتی ئەم سەدەیە، بەتایبەتی دوور لە عەقڵیەتی ئەوانە دەچنە ئەوروپاو دەیانەویٚ لای ئەوان عاقڵ بن و فێری دیالۆك و حیواری سەردەم و هێمنانە بن!

کاك (جەلال) وا دەزانم بەشی هیچت تیا نەهێشتۆتەوە، خەڵك دەڵیٚ: سەد رەحمەت لە کوفن دزی پێشوو (جنێونامەکەی مەریوان)! دڵنیاشبە ئەو قسانەت هیچیان راست نین، چونکە بەر لەهاتنی ئیسلام بوو کە مرۆڤ لە دارو بەردو شیوو دۆڵ و ئەشکەوت و سەرکانی و دۆعای فاڵچی و کوڵەنانی و جن و دێوو درنج دەترسان: ﴿وَأَنَّهُۥ كَانَ رِجَالٌ مِّنَ ٱلۡإِنسِ يَعُوذُونَ بِرِجَالٍ مِّنَ ٱلۡجِنِّ فَزَادُوهُمۡ رَهَقًا﴾ (الجن: ٦). قورئانی پیرۆزەو ئاخاوتنی جنیەکان دەگێڕێتەوە کە ئەوانیش سەریان لە عەقڵیەتی ئەوانە سورمابوو کە لەو جۆرە شتانە دەترسان و دەیان گوت: (أعوذ بسيد هذا الوادي)!.

ئیسلام هات بۆ ئەوە تەواوی ئادەمزاد ئاگادار بکاو پێی بڵێت: لەم بوونەوەرەدا — بەدەر لە خودای دلۆڤان — دەسەلاتدارێکی تر نییەو، هیچ شتێك نییە (خێر)و (شەڕ)ێکی بەدەست بێت و بتوانێ زەرەرو زیان بە مرۆڤ بگەیەنێت، نەڤاڵچی و کوڵەنانی، نە ئەستێرەو ئەستێرەناس، نەنویشتەو دوعانووس، نەدەستگرەوەو خوێنەرەوەی دەس، نەگۆڕو قەبرسان و..!! بەڵکو تەنهاو تەنها دەسەلات بۆ خودایەو، هەقە شەرم و حەیا تەنها لەو بکرێت، ئەمەیە راو بۆچوون و بیرکردنەوەی مرۆڤی موسڵمان لەم بوونەوەرەدا، دەکرێ ئێوە ئەو بۆچوون و بیرکردنەوەتانە لە ئەستێرە ناس و فاڵچی و کوڵەنانییەکان وەرگرتبێ، ئێوەن ئێستاش لە ئەستێرەکان دەترسن، دەترسن لە فلانە (برج) لەدایك بوبوون و بەخت و چارەنووستان رەش بێت، ئێمە گاڵتەمان لێ دێت کاتێ باسی بەخت و چارەنووس دەکەن بە هۆی لەدایکبوونەوە لەو بورجانەدا.!

کاك جەلال ! چاك بزانن کە ئیسلام بۆ راستکردنەوەی ئەو بیرو باوەڕە لارو چەوت و هەلانە هاتووە، دژ بەو شتانەیە ئێوە دەیانلێن و، بە(خورافە) و (ئوسطورە)شیان دەزانێ، ئێوەیش بە ناهەق لە موسڵمانان دەترسن!.. باشە ! ئەگەر کەسێك داوای ژیانەوەی ئیسلامێکی (محمد)ی راستەقینە بکاو، داوای ئەو ئیسلامە بکات خودا ناردوویەتی و پێی رازییە (نەك زلهێز و کاسەلێسەکانیان) بۆ دەبێ بە ئاگرو ئاسن وەلام بدرێتەوەو، سەدان ناوو ناتۆرە بخرێتە دوای؟ خۆت دەزانی کوردیش چەندین ساڵ لە پێناو مافە رەواکانی خۆیدا، خەبات دەکاو تێدەکۆشێت، ئایا ئێستا هەقە پێی بڵێیت (ئیرهابیی)و لێی بترسن ؟ چۆن دەبێ هەرکەسێك شۆرش بکاو داوای هەقی خۆی بکات، لەبەر ئەوە لە بەرژەوەندی چەند کەسێك نەبێ، سەد ناوو ناتۆرە بخرێتە دوایی و ناوی ئیرهابیی لێ بنرێت ؟ ئەی بۆ وەلام نەدرێتەوەو وتوو وێژی لە گەڵ نەکرێ، نیو سەدە زیاترە کورد داوای مافی خۆی دەکاو هەزاران فرو فێڵیان لێکردو تۆمەتبار کرا، ئایا ئەوە بوو بە هۆی وازهێنان لەمەسەلە شەرعییەکەی خۆی ؟

کوردەکانی تورکییـە چـەندین سـاڵە دەچەوسـێنرێنەوەو سـتەمیان لێـدەکرێ و مـافی سیاسیی و کۆمەلایەتیی و ئابووریی و فەرهـەنگ و کـەلتووریان لێ زەوت دەکـرێ و بـە هیچ شێوەیەك وەلام نادرێنەوەو ئیستاش خراونەتە لیستی (ئیرهاب)ـەوە ! کەچی هەر ئەو زلهێزە کـە ئـەوی بـە ئیرهـابی دانـاوە، هـاتووە لای خۆمـان فرمێسـك بـۆ کـوردان دەرێژێ و دیفاعێکی کاڵ و کرچ دەکات لێیان. !

دانانی خەڵکێك بە کـوڕی چـاك و، خـەڵکێکیش بـە ئیرهـابیی و توندڕەو - بـە مـەرجێ هەردوو بەشخوراو — پێوانەیان بەرژەوەندییەکانیانە لە ناوچەکەدا، نـەك ئینسـانیەت و مرۆڤایـەتیی و عـەدل و عەدالـەت، ئیسـتاش هەرکەسـێك لـە موسـڵمانەکان ببـزوێ و بجووڵێ، بە پێوانەی زلهێزەکان دەبێتە ئیرهابیی، دوایـیش (مقلـد)ـەکانی لای خۆمـان بەدوایانـدا دەچـن و هەوایشـیان لێ قەدەغـە دەکـەن !. داخوازییـەکانی کـورد مـافی سیاسـیی و کۆمەلایـەتیی و فەرهـەنگیی و ئـابووریی و جوگرافییاییـە ... ئەگـەر لـە لایەکەوە پێی بڵێن فەرهەنگت ئازادبێ و بەزمانی خۆتـانیش بخـوێنن، بـەلام مافـەکانی تریـان وەلا بخـرێ، دەکـرێ بێـدەنگ بـێ و بـەو ئەنـدازە رازی بێـت ؟ مەسـەلەی ئیسلامیش، مەسەلەیەکی سیاسـیی و کۆمەلایـەتیی و دەسـەلات و حـاکمێتی خودایـە، ئینجا نوێژو رۆژوو حەج و زەکات و رێگرتن لە ماددە حەرامەکان و، خۆشگوزەرانی بـۆ جەماوەرو...هتد، باشە ! ئەگەر لە باتی ئـەو هـەموو خاڵـە گرنگانـە - کـە تـەواوکاری یەکترن - رێ بەوەزارەتی ئـەوقاف بـدەن - کەنایشـیدەن - مزگـەوتێکی زۆربکاتـەوە، بەلام سوڵتەو دەسەلات چی پێخۆشبوو دەبێ وتاربێژی هەینی لە مزگەوتەوە لەوە تـێ نەپەڕێ، لە کاتی حەجیشدا چ کەسێکیان لاپەسـەندبوو ناردیـان بـۆ حـەج، ئەمانـەیان کردو رێیان پێدان، کەچی لە بەرامبەر قەزیەکانی ترەوە، وەلامیـان ئـاگرو ئاسـن بـوو، دەکرێ بەو شتە بەراییە سـەرەتاییانە رازی بـێ و دەسـت لـە مەسـەلە گرنگـەکانی تـر هـەڵگرێ و بـە دینـداریش دابنـرێ ؟ کـاك جـەلال! وەکـو مـافی کـورد تـەنها زمـان و فەرهەنگ نییە، ئیسلامیش تەنها ئەو مەنارە نییە (مەریوان) چـوواندوویەتی بـە (٣٦٠)

(.....) پەرستگای هندییەکانەوە، ئەگەر ئەو کاتە هەستن داوای ئیسلامە (شامل) و (کامل)ـەکەی (محمد) بکەن و هەموو ڕێگایەکی سیاسیی و دیپلۆماسیی و، ئەوسا جیهادیش بگرنە بەر، دەبێ بۆ لێیان بترسن ..؟!.

**بەشی شەشەم:**

دیارە كاك جەلال زۆر حەز دەكات قسەو ئاخاوتنی موسڵمانان بە درۆ بخاتەوەو بۆیان نەچێتە سەر، بۆیە كاتێ (منی بەندەی خودا) باسی ئازادیم كردووەو نموونەیەكی ئازادیم لە شەڕی حونەین هێناوەتەوە، ئەو گەڕاوە بەسەرچاوە ئیسلامییەكاندا - خۆزگە بۆ هیدایەت و موسڵمان بوون بووبا- لەو گەرانەدا رێی لە زنجیرەی هاوەڵانی پێغەمبەر ژمارە (١٢) كەوتووە، دەڵێ: (موحەممەد كە پەلاماری **هۆزی هەوازین و سەقیفی** دا سوپاكەی پێكهاتبوو لە ئیسلام و بتپەرستانی مەككە، لە كاتێكدا (سەفوان) یەكێك بوو لە بتپەرستەكان و لەگەڵ موحەممەد بوو، سەیریان كرد دۆڵێك پڕبوو لە مەڕو مالآت، محمد گوتی: ئەی سەفوان ! ئەو دۆڵەت بەدڵە؟ وتی بەڵێ. وتی: دۆڵەكەو هەرچی تێدایە بۆ تۆ...). ئینجا بۆ خۆی دەڵێ: لێرەدا ئەوە دەبینین ئیسلام لەوەتەی هەیە لە قۆناغی پەلامارداندایە، كێ ئاگای لە خۆی نەبێت ئەو پەلاماری دەدا، گرنگ نییە لەگەڵ كێ رێك دەكەوێ و سەری كێ دەخوات.. دەشڵێت ئەو هۆزە پەلامار دران لە كاتی خۆیدا بە منداڵیی محمدیان بەخێو كردبوو، بۆیە (شەیما)ی شیر خوشكی كەوتە ناو (٦٠٠٠) جاریەو بەدیل گیراوەكانەوە.

جا بۆ ئەو وەڵامە پێویستە بگەڕێینەوە بۆ هاوكاری هەڵگیرسانی ئەو جەنگە، تا بزانرێ راستە وەكو كاك جەلال دەڵێ ئاگایان لە خۆیان نەبووە، كاتێ محمد پەلاماری داون؟

مێژوو نووسەكانمان دەڵێن: پاش بەسەر چوونی دوو هەفتە بەسەر فەتحی مەككەدا، موسوڵمانان دەیانویست بحەوێنەوەو ئیسراحەت بكەن، كەچی هەواڵ بە پێغەمبەر ﷺ گەیشت كە هەردوو هۆزی (هەوازین) و (سەقیف) رێككەوتوون و سوپایەكی (٢٠٠٠٠) بیست هەزار كەسییان ئامادە كردووە پێكەوە هێرش بكەنە سەر پێغەمبەرو هاوەڵان بۆ جەنگ ! بەڵام چ جەنگێك ؟ جەنگی سەرو ماڵیی و لە ڕیشە هێنان، بۆیە بە خۆیان و ژن و ماڵ و منداڵ و ئاژەڵیانەوە رژانە دەشتی (ئەوتاس).، مالیكی فەرماندەیان

بڕیاریدا ئەم سوپا گەورەیە بچێتە سەر تەپۆڵکەی (حونەین)و تەنگە بەرایی شیوی (حونەین)یان لێبگرن.. دەرەنجام لەم نەخشە سەربازییەدا موسوڵمانەکان شکان و هەڵهاتن، پێغەمبەر سەرو چەند کەسێکیان بە حیکمەتی خۆی مایەوەو توانی بۆ جارێکی تر سوپای رێك بخاتەوەو حەملە بەرنەوە سەریان .. جا کاك جەلال راست بوو کە محمد بێ ئاگا پەلاماری بۆ بردن ؟

سەبارەت بە (صەفوان)یش.. پێغەمبەریش ﷺ هەتا کرابا بۆی (موشریك) و بتپەرستی نەدەهێنا جەنگەکانەوە، بەلام لەم جێگایەدا دیتی کە ئەو دوو هۆزە، جگە لە خۆیان و خێڵە وردەکانیشیان هێناوە بۆ جەنگ و "محەممەد"یش زۆر نییە لە فەتحی مەککە بۆتەوەو سوپایەکی ماندوو شەکەت، وا دەزانم بۆ بەرهەڵستی لەو لەشکرو سوپا بێ ویژدانە، ئەگەر سەدان کەس وەکو (صەفوان) بەشداری بکات و تەماح بخاتە بەری، کارێکی خۆ قوتار کردنەو رەددی داگیرکەرەو هیچی تێدا نابینم (ئەگەر لەبیرت بێت هەردوو هەرێمەکەی خۆیشمان سوپای ئەملاو ئەولایان هێنایە سەریەکترو بە قارەمانیەتیش لێکدرایەوە)! ئەمە لەلایەکەوە، لەلایەکی ترەوە هەموو هۆزو خێڵ و تیرەو حیزب و حکوومەتانی ئێستاش چیتان لە دوژمن دەسکەوت بە هی خۆیانی دەزانن و دەبێتە ماڵیان، دیسان هەر لە ناو کوردستاندا ئەوە روویدا.. کەوابوو ئەو هەموو مەڕوو مالات و ژن و مندالانە بەپێی یاسای ئەوکاتە بەتایبەتی هی لایەنی شەڕ فرۆش دەبێتە ماڵی لایەنی سەرکەوتوو، ئەوکاتەیش ئەو لایەنە ئازادە، دەیبەخشێ چی لێدەکات.

پێغەمبەریش ﷺ زۆر بە حیکمەتە بۆ سەر خستنی بانگەوازەکەی، هەتا بۆی کرابێ رێگای ئاشتی گرتۆتە بەر، هەر بۆیە لە جەنگی (خەندەق) دا فەرموی پێیان: شەڕم لێلادەن، سێیەکی بەرهەمی (مەدینە) تان دەدەمێ، شیاوی باسە بە هەموویشی بەڵێنی دابوونێ کە ئەگەر هاوکاریتان بکەن بۆ سەرکوتکردنی محمد ﷺ، بەرهەمی ساڵێکی تەواوی (خەیبەر)یان بدەنێ.

گەلێ جاریش پیاو ماقووڵ و ناودارەکانی قورەیش ئەوانەیان هێمان موسڵمان نەبوو بوون، یان تازە موسڵمان بوون لەو دەسکەوتانە هەدیەو دیاری دەدانێ، تابەڵکو دڵیان نەرم ببێ و موسڵمان بن، یان هەر هیچ نەبێ (گوڵ نەبن، درکیش نەبن)، یەکێ لەوانە (صەفوان)ی کوری (أمیة) بوو، سێ سەد وشتری درایە، سەردارانی (غطفان) و (تمیم) یەکی (١٠٠) وشتری پێدان، (٦) کەس لە ناودارانی قورەیشیش لەگەڵ (٥٢) کەسی دیکە لەوانە موسڵمان ببوون بەشدارکران، ئەمانە لە قورئاندا ناویان بە (مؤلفة القلوب) هاتووە.

جا بۆ دواییش نوێنەری هەوازین هات، پێغەمبەر ﷺ تەواوی ژن و منداڵەکەی تەسلیم کردنەوە، (شەیما)خانی شیر خوشکیشی کە لەناو دیلەکاندا بوو، هەرکە پێی زانی وەکو پێغەمبەر ﷺ ناردیی و هێنای بۆلایی و ئەویش عەباکەی خۆی بۆ راخست و داینا بە رێزەوە، پاشان لەسەر داوای (شەیما)خان بەرێزەوە ناردیەوە بۆ شوێن و جێگەی خۆی.

*** مەسەلەی (عبدالرحمن)ی کوری(عەوف)**.. گوایە کاتێ کۆچی کردۆتە مەدینە لەماڵی (سەعدی کوری رەبیع) حەساوەتەوەو هیچی نەبووە، سەعد گوتوویەتی: دوو باخ و دوو ژنم هەیە، باخ و ژنێکیان بۆ تۆ.. کەچی بۆدوایی زۆر دەوڵەمەند بوو: چوار ژن و (١٠٠٠) حوشتر و (١٠٠) ئەسپ و (٣٠٠) سەر مەڕو زێڕو زیوێکی پاش مردن لێ جێما.. (ئەمەی لەکوێی هێنا؟) ئەگەر نیعمەت و تالأنی نەبێ وەکو تۆ دەڵێیت؟!.

هەموو مێژوو نووسەکان کاتێ باسی (عبدالرحمن) دەکەن، بە پیاوێکی بازرگانی دەوڵەمەندو سەخی و ئەهلی خێرو خێرات و دەست گوشاری باسدەکەن .. کاروانە بازرگانیەکەی (عبدالرحمن) کە پێکهاتبوو لە (٧٠٠) راحیلەی ئەو سەردەمە، کە لە

شام گەڕایەوە، بەناوبانگە لای هەموو خەڵکانی دەڤەرەکە، هەموویشی شایەتە کە باری هەر (٧٠٠) سەدەکەی بەخشی لەڕێی خودا.

(عبدالرحمن) هەمیشە دەستی بەدەمی خەڵکانی فەقیری مەدینەوە بوو، قەرزی دەدانێ، قەرزی بۆ دەبژاردن، پێی دەبەخشین.. (عبدالرحمن) بازرگانێکی وابوو، لە رووداوێکدا (٥٠٠) ئەسپی کڕی بۆ سوپای موسڵمانان، لەگەڵ ئەمانەشدا ترسی قیامەتی زۆر بووە، هەموو جارێ بیری لەو سەروەتەی خۆی دەکردەوە، بیریشی لەو رۆژە دەکردەوە کە موسعەب شەهید بوو کوفنەکەی نەدەگەیشتەوە بە سەرو قاچیدا ! (حەمزە) شەهید بوو، تەنها (بوردە)یەك بوو بۆ کوفنەکەی، کەچی ئەم هەموو سەرەوەت و سامانە رژاوە بەسەریدا. !

(عبدالرحمن) ئەوەیەو سەد ئەوەندەی تریش. ! ! بێگومان (عبدالرحمن) لەو کەسانە نیە لە پڕێك دەبنە کوڕێك، ئەوانەی لە پڕێك دەبنە کوڕێك ئەوانەن باوەڕیان بە (ما وراء الطبيعة) نیەو، بە ئارەزووی خۆیان ئەسپی لێ تاو دەدەن و رم بازی دەکەن و حەلاڵ و حەرامیان لا باشە، باوەڕیان بە خواو بەرنامەی خواو کتێب و پێغەمبەرانی خوداو رۆژی قیامەت و زیندوو بوونەوە نیە، سەرکردەی ئێمە: ((خرج رسول الله ﷺ من الدنيا ولم يشبع من خبز الشعير))[٥٧]. ((توفي رسول الله ﷺ ودرعه مرهونة عند يهودي، بثلاثين صاعا من شعير))[٥٨].

تەنانەتی ئێستاش ئەگەر سەیرێکی سەرکردەو مەکتەبی سیاسیی و کۆمیتەو حیزبی عەلمانیەکان و حیزبی ئیسلامیەکان بکەیت بەچاکی دەزانی (کێ لە پڕێك بۆتە کوڕێك)؟!.

---

(٥٧) صحيح البخاري – كتاب الأطعمة، باب ما كان النبي صلى الله عليه وسلم وأصحابه يأكلون – حديث : ٥١٠٣

(٥٨) صحيح البخاري – كتاب الجهاد والسير، باب ما قيل في درع النبي صلى الله عليه وسلم – حديث : ٢٧٨٠

**کاک جەلال ! لێرە کۆتایی بەو ئاخاوتنە دێنم و دەڵێم:**

ناکرێ مرۆڤ خۆی بۆ خۆی دروست بووبێ، یا خۆی دروست کردبێ، بەڵکو دەبێ بەدیهێنەرێکی هەمیشە زیندوو و نەمرو زاناو بیناو ژنەواو دەسەڵات تر (لەهەموو دەسەڵاتێك) هەبێ، ئەگینا خوایەتی پێناکرێ و دەرفەتی بەڕێوەبردنی ئەم بوونەوەرەو ئاسمان و زەویی و دەشت و چیاو بەرزو نزمی و وشکانی و دەریاو، باوو بۆران و بورکان و تەقینەوەکان و، بومەلەرزەو گڕو کڵپەی شاخەکان کاتێ دەتەقنەوەو، مرۆڤەکان بە چاك و خراپیانەوە، بە دادگەرو نادادگەریانەوە... بوونەوەر بە خوایەکی ئاوا دروست بووەو دەچێت بەڕێوە، خۆ لەجێگەی ئەودا "ژیریی" ڕێگە نادات (دروستکەر) کەسێك نەبێت و بە (صدفة)و ڕێکەوت ئەم بوونەوەرە بوو بێت! یان سروشت و تەبیعەتی کەڕو کوێرو ئیفلیج بێت ! بۆیە سەدان و هەزاران زانایانی شارەزا لە جۆراوجۆری زانا، موسڵمان بوون و باوەڕیان بە خوا هێنا، کتێبی (الله يتجلى في العصر العلوم) زۆرێکی هێناون.

منیش لێرە لە خودا دەپاڕێمەوە هیدایەت و ڕێنماییت بکات بۆ ئیمان و باوەر بە خۆیی و بە بەرنامەکەیی و لە سزای جەهەننەم دوورت بگرێ، بۆئەوەیش حەز دەکەم ئەندازەیەك خۆت ماندوو بکەیت و کتێبی باش بخوێنیتەوەو هاورێی باش بگریت و لە خەڵکی خراپ دوور کەویتەوەو هاتووچۆی جێگای خراپ نەکەی، منیش بەڵێن دەدەم هاوکاری باش بم بۆ شارەزابوون و ڕێنما کردنت.

## سەرنجێک:

لەم نووسینەدا زۆر ریعایەتی حەقی کاك جەلالم کرد، چونکە دەمزانی لە ئیسلام حاڵی نەبووە، منیش دەبێ بە حیلم و بە هێمنانە لەگەڵی بدوێم، ئەگەرچی ئەو زۆر تورەو توند بوو. !

(اللهم اهد قومي فإنهم لا يعلمون)



# لادانی گومان لەسەر
# پرســیارە هــەتا هــەتاییــەکـــان !!

**- من أين = لە کوێوە..؟**

**- وإلى أين = بۆ کوێ..؟**

**- ولماذا = وە بۆچی..؟**

**١٤٠٩/١١/١٨ کۆچیی ٢١ – / ٦ / ١٩٨٩ زایینی ، نووسراوە**

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

الحمدلله خالق الكون ومديره، والصلاة والسلام على إمام الهادي سيدنا محمد وآله وصحبه.

برای موسڵمانی لاوم: درووستبوونی ئەم بوونەوەرەیە هەرگیزاو هەرگیز ناگونجێ لە خۆیەوە درووست بووبێ، وە یا سرووشت و شتی وا بەدیهێنابێت، چونکە گەلێك بەڵگەی زانیاریمان هەیە بۆ سەلماندنی ئەم ڕاستییە، بێجگە لە عەقڵ و ژیری مرۆڤی سەدەی بیستەم – بە تایبەت – جا لەبەر ئەوە پێویستە بزانرێ (مرۆڤ) لەم بوونەوەرەدا کارو سپاردەی چیەو چ ئەرکێك دراوە بەسەریا، وەك دەڵێت: (ما مهمة الإنسان في هذا الوجود).؟

پێویستە لە خۆت بپرسیت: بۆچی هێنراومەتە خانەی بوونەکانەوە.؟ وە لەم بوونەوەرەدا چ شتێکم پێ سپێردراوە.؟ وە پەیام و نامەم چۆنەو چیە لەم ژیانەدا.؟ ئەم پرسیارە پێویستە لەسەر مرۆ – هەموو مرۆیەك – لەخۆی بپرسێت، وە ئەندازەیەك بیر لە وەڵامەکەی بکاتەوە، بەڕاستی هەرچی شتی نەزانراو هەیە – هەرچەند سەر ئەنجامەکەیشی گەورەبێت – هەندێ جار چاوپۆشی لێ دەکرێ، بەڵام پەی نەبردنی مرۆڤ بەهۆی هاتنە دنیایەوەو، دەرك نەکردنی بە مەبەست لە ژیان و، تێ نەگەیەشتنی لە جۆرو کەسایەتی پەیامەکەی لەم سەرزەوییەدا جێی چاوپۆشی نییە.؟

گەورەترین زشتیی و نەنگی سەبارەت بەم "بووە" خاوەن ژیریی و خواهیشە "مرۆڤ" ئەوەیە کە: بێ ئاگاو غافڵ بژیی و، بخوات و سوود لە ئارەزووات وەرگرێ، وەك ئاژەڵ، بەڵام بیرێ لە سەرئەنجامی خۆی نەکاتەوەو، لە چۆنییەتی نەفس و گیانی هیچ شتێك نەزانێ، وە نەزانێ ئەم ژیانە – تا دەمرێ – سرووشتی چۆنە.؟..

ئینجا بێ خۆ ئامادەکردن ڕوو بکاتە سەر ئەنجامی نەزانراوی..!! وە هەر خەریکی کاری بێ سەرو بن و بێ ئاگایی و نەفامیی و لادان بێت، لە ماوەی ئەو تەمەنە

درێژەیدا، یان کورتەیدا، جا لە کاتێکدا پەشیمان دەبێتەوە، کە پەشیمان بوونەوە هیچ کەڵك و سوودێکی "بۆ ڕزگارکردنی" لێ ناکرێ.

جا لەبەر ئەمە پێویستە هەر مرۆڤێکی وریاو زیرەك بە پەلە لە خۆی بپرسێت: بۆچی درووست بووم و مەبەست لە درووست بوونەکەمدا چیە.؟

## پرسیارە هەتا هەتاییەکان

بەڵێ.. پێش ئەوەی وەڵامی ئەم پرسیارە بداتەوە، یان وەلاّم بدرێتەوە، بەڵکو پێش ئەوەی بپرسێت، پێویستە دوو پرسیاری تر ئاڕاستەی خۆی بکات، تا وەڵامەکەی ڕۆشنتر بێت لای، بەشێوەیەك کە هیچ تۆزو گەردەلوولێك بەرگری نەکات لێی.

**پرسیاری یەکەم**: من کێم...؟ لە کوێوە هاتووم...؟ یا بڵێ: کێ منی هێناوەتە خانەی بووەکانەوە..؟

**پرسیاری دووەم**: بۆ کوێ دەڕۆم، دوای ئەوە هاتمە خانەی بوونەکاەوە..؟ وە دوای مردن بۆ کوێ دەڕۆم و دەگەڕێمەوە.؟

هەندێ لە بیرتیژەکان ئەم پرسیارانەی سەرەوە بەم وشانە دێنن: لە کوێوە = من أين.؟ بۆ کوێ = والى أين.؟ وە بۆچی = ولماذا.؟ ئەم سێ پرسیارە لەگەڵ مرۆڤدا هەر لە سەرەتای بیرکردنەوەیدا هەبوون، وە لەمەولایش هەر لە گەڵی دەبن و داوای وەلاّمێکی تێرو تەواو دەکەن، ئاشکرایە بێ ئەم وەلاّمەیە بوونی ئادەمیزاد یەك ناگرێ، وە ناتوانێ جێگەی خۆی دیاری بکات لەم بوونەوەرەدا، هەر وەك ناتوانێت پەیامی خۆی بدۆزێتەوە، ئەی چۆن یەك ئەگرێ ئەگەر نەزانێ خۆی چیە..؟ وە بۆچی پەیدا بووە..؟ وە لە کوێوە هاتووە..؟ وە بۆ کوێ دەڕوات..؟

ئەم پرسیارانە کە هەموو فەلسەفەو پێتوولێك — چ لە خۆرهەلاّتدا، چ لە خۆرئاوادا — هەوڵی داوە وەلاّمیان بداتەوە، بەڵکو ئەگەر خۆی غافڵ و بێ ئاگا بکات لە وەلاّمەکەیان هەر بە فەلسەفە ناژمێردرێت.!

- من أين = لە كوێوە..؟
- وإلى أين = بۆ كوێ..؟
- ولماذا = وە بۆچی..؟

من لە كوێوە هاتووم..؟ وە كێ بوو منی هێنایە گێتییەوە (ژیان)ەوە..؟ وە ئەم جیهانە فراوان و گەورەیە كێ درووستی كردووەو لە كوێوە هاتووە..؟

وە بۆ كوێ دەڕۆم و كۆچ دەكەم دوای ئەوەی هێنرامە خانەی بووەكانەوە..؟ دیسانەوە ئەم بوونەوەرە بۆ كوێ دەڕوات.؟ وە دوای هەڵدانەوەی تەواوی لاپەڕەی كتێبەكەم كە پێی دەڵێن (تەمەن) بەرەو كوێ و بۆ كوێی تر..؟

وە لەم جیهانەدا بۆ درووستكرام..؟ ئایا پەیامی تایبەتیم هەیە..؟ ئەبێ ئەو پەیامە كامە بێت..؟

## پرسیاری یەكەم: من أين = لە كوێوە..؟

ئەم پرسیارە - كە یەكەم پرسیارە - گرێ كوێرەی دەستی (مادی)یەكانە.. ئەوانەی تەنها بڕوایان بەوە هەیە پێنج هەست پێكەرەكان هەستی پێ دەكەن..! دەنگی (فیطرە)و سرووشتی خۆیانیان تاساندووە.! ملە ملێ دەكەن لەگەڵ ژیرییاندا، وە دەمدرێژی دەكەن - هەر بە كوێرییەكی سەرسوڕمانە - دەڵێن: ئەم بوونەوەرەو هەموو ئاژەڵ و ڕووەك و كەژو كۆو چیاو ئادەمیزاد لەخۆیەوە درووستبووە...!! ئەو هەموو شتە پڕ لە یاساو ڕژێمە ڕێك و پێكە دەستكردی ڕێكەوتی شەل و كوێرە..!!

ئەمە بۆچوونی (مادی)یەكان بوو.. بەڵام ئەوانەی وەڵامی (فیطرە)تی خۆیان دەدەنەوەو ددان دەنێن بەوەدا كە: بۆ خۆیان و ئەم بوونەوەرەی دەورووبەرەیان خوایەكی گەورەو بەدەسەڵات هەیەو ڕووی دڵیانی تێ دەكەن، لەگەڵ پڕ كردنیان لەهیواو ترس و پشت پێوە بەستن و....هتد. ئەم بۆچوونەیان لە قووڵایی دڵیانەوە

هەڵئەقوڵێ، ئەمەیە ئەو (دین)و ملكەچیە كە لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە: ﴿ فَأَقِمۡ وَجۡهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفٗاۚ فِطۡرَتَ ٱللَّهِ ٱلَّتِي فَطَرَ ٱلنَّاسَ عَلَيۡهَاۚ لَا تَبۡدِيلَ لِخَلۡقِ ٱللَّهِۚ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلۡقَيِّمُ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ ﴾ (الروم: ٣٠).

ئەم دەنگە كپ دەكاتەوە لە دەروونی خۆیدا، یان دەیتاسێنێ بە ئەنقەست لەكاتی خۆشیی و دەسەڵاتـــدا..! كەچی هەركات ڕووداوێكی تاڵ و هەمواری لێ ڕوو بدات و هیواو پەنای بڕا لە ناو مەردما، ئینجا لەو كاتەدا ئەم دەنگە دێتە دەرەوەو ڕوو دەكاتەوە خـوای خـۆی بە ملكەچیی و زەلیی و دەنگی (یا الله، یا الله)ی لێ بەرز دەبێتەوە.

پیاوێك لە ئیمام (جافری صادق)ی پرسی "خـوا لێی ڕازی بێت" سەبارەت بە خودی زاتی (الله) فەرمووی: ئایا سواری دەریا نەبووی..؟ وتی: بەڵێ.! فەرمووی: ڕێككەوتووە كە گێژەڵووكەو با گژە شەپۆلتان پێ بدات..؟ وتی: بەڵێ! فەرمووی: هیوات بڕا لە كەشتیەوان و هۆ ڕزگار كارانی تر..؟ وتی: بەڵێ. فەرمووی: دەی ئەو هێزەیەی كە بە دڵتا هاتووە خودا (الله)یە. ئـەم ئایەتانەیش هـەر بـۆ ئەم مەبەستە هێما دەكەن:

﴿ وَإِذَا مَسَّ ٱلۡإِنسَٰنَ ضُرّٞ دَعَا رَبَّهُۥ مُنِيبًا إِلَيۡهِ .. ﴾ (الزمر:٨). ﴿ وَإِذَا غَشِيَهُم مَّوۡجٞ كَٱلظُّلَلِ دَعَوُاْ ٱللَّهَ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ ﴾ (لقمان: ٣٢). ﴿ وَإِذَا مَسَّكُمُ ٱلضُّرُّ فِي ٱلۡبَحۡرِ ضَلَّ مَن تَدۡعُونَ إِلَّآ إِيَّاهُۖ .... ﴾ (الإسراء: ٦٧).

- **دیكارت** دەڵێت: من خۆم لەگەڵ هەستكردنم بە ناتەواوی لە زاتمدا، هەست دەكەم كە زاتێكی تێرو تەواو هەیە، وە خۆم بە ناچار دەبینم كە باوەڕم ببێ ئەم (بووە) ئەم (زات)ـە تێرو و تەواوە ڕوواندوویەتی ئەویش (الله)یـە.

لەبەر ئەوە هەست و (شعوور) لە (فیطرە)و سرووشتێكی بناغەییەوە هەڵ دەقوڵێ، چونكە باوەڕ (ئیمان) گەلێك لەسەرووی سرووشت و هۆیەكانەوەیە، ئەوەتە باوەڕ

شتێکی هاوبەشە لەنێوان تەواوی ئادەمیزادەکاندا لەسەراسەری جیهاندا، وە لە تەواوی هەموو ڕەگەزو هۆزەکاندا لە جۆراوجۆری دۆخەکانی مێژوودا.

- **بـــرگسون** – فەیلەسووفی فەڕەنسی – دەڵێت: (مـن و چـەندەها دەستەو کۆمەڵی تر لە داییکبووین بێ زانیاریی و هونەرو بەشە فەلسەفییەکان، بەڵام هیچ کۆمەڵێك لە دایك نەبووە بێ ئایین بێت).

- **أرنست ينان** – زانای مێژوو ناسی دیانەت و ئایینەکان – دەڵێت: (بێگومان دەگونجێت کە هەموو شتێك ڕۆڵی خۆی تەواو بکات و بڕواو بەسەر بچێ، وە هەروەها دەست ئەدات کە ئازادی بەکارهێنانی ژیریی و زانیاریی و پیشەسازیی پووچەڵ بکرێتەوە، بەڵام نەگونجاوو (مستحيل)ـە ئایینداری بسڕێتەوەو نەمێنێ... نە هەر ئەوەندە بەڵکو هەتا هەتایە بەڵگەیەکی گۆیا ئەبێت لەسەر پووچەڵی پێڕەوگەو ڕچەی (مادی)یەکان، ئەو ڕێچکانەی دەیانەوێ بیری ئادەمیزاد هەر لە بواری تەسکدا بمێنێتەوەو قەتیس بمێنێ و، لەم ژیانەی گێتیەدا دەرنەچێ..؟!

بەڵێ (فیطرەت) دەستی مرۆڤ ڕادەکێشێ بۆلای خوای گەورە، بەڵام فیطرەت بە تەنها.. نە (ویژدان)ی ڕووتەو نە ژیری تەنهایشە، بەڵکو (فیطرەت) تێکەڵە لە هەردووکیان، واتە: (فیطرەت) کە دەستی مرۆڤ ڕا دەکێشێ بۆلای خوا پێك هاتووە لە دووشت:

أ) **ویژدان.**

ب) **ژیریی.**

بۆیە (ژیریی تەنها) بەلایەوە وایە کە: باوەڕبوون بە خوا شتێکی زەروورییی و ناچارییەو هیچ کەسێك ناتوانێ خۆی لێ حەشار بدات.. چونکە ژیریی – بێ پێش چاوگرتنی زانیاریی و شتی وا - بڕوای بە یاسای هۆکارییەتی (السببية) هەیە، بەلایەوە هیچ کردارێك بێ کاریگەرو بکەر نابێت، هەر وەك هیچ پیشەیەك بێ وەستاو درووستکەر نابێت.

یاسـای (سـەبەبییەت) ئەوەیـە کـە کـابرای (أعـراب)ی وەڵامـی دایـەوەو زۆر بـە سادەییەکەوە کاتێ پرسیاری زاتی خـــوایـــان لێ کرد، وتـی: پشـقڵێك ڕێنمـوونی دەکات بۆ حوشترێك، وە جێ پێیەك لەسەر ئەوەی کـــە کەسێك لەوێوە ڕۆیشتووە، ئەی چۆن ئاسمانێکی پڕ لە ئەستێرەو، زەوییەکی پـڕ لـە ڕێگـەو بـەرزیی و، نزمیـی و، دەریایـەکی خـاوەن شـەپۆل ڕێنمـوونی ناکـات لەسـەر بـوونی زاتێکـی گـەورەو بـێ وێنـە..؟!

زانای سرووشت ناس - ناوبانگ بە (ئیسحاق نیوتن) دەڵێت: (نەکەونـە گومانـەوە لـە بوونی خوادا، چونکە هیچ کات بە مێشکدا نایەت کە (ڕێکـەوت) بـە تـەنها یاسـای ئـەم بوونـە بێـت..؟!! بـەڵێ هـەتا ئـادەمیزاد زانیـاری پەیـدا بکـات بەسـەر شـتە سـەر سوڕهێنەرەکانی بوونەوەرداو لەم سەرەتاوە لـەلای توێکڵەکەیدا نەوەسـێتەوە، بـڕوای پتر دەبێت بە پـەروەردگارو تـەواوی صـیفەتەکانیی.. بۆیـە (سبنسـر) لـە (هرتـل)ەوە دەگێڕێتەوە کە: (هەتا زانیـاری بـەرفراوانتر بێـت بەڵگـەکانی بـوونی خوایـەکی هـــەتا هەتایی و هەبـوو، پتر دەبن و چنگمان دەکەون، زەوی ناسەکان و زانایانی بیردۆزیـی و، گەردوون ناسەکان و سرووشت ناسەکان — هەر هەموویان — دەستیان کـرد بەیـەکا بۆ بونیاتنانی قەڵای زانیاریی، کە ئـەویش قەڵای تەنیایی گەورەیی خوایە.!

**سبنسر** دەڵێت: ئەو زانایەی کە دڵۆپێك ئاو دەبینێ و دەزانێت کە پێك هـاتووە لـە ئۆکسجین و هایدرۆجین بە ڕێژەیەکی تایبەتی خۆی.. بەشـێوەیەك ئەگـەر ئـەو ڕێژەیـە زیادو کەم بکات شتێکی تری لێ پەیـدا دەبێـت غـەیری ئـاو.. زانایـەکی ئـاوا بـڕوای بـە گـەورەیی و دەسـەڵاتی خـوا هەیـە پـتر لـە زانایـەکی ناسرووشـتی، کـە هـەر ئەوەنـدە سەیری ئەو ئاوە بکـات کـە دڵۆپـێ ئـاوەو هیچـی تـر.! وە هـەروەها ئـەو زانایـەی کـە سـەیری پارچـەیە، دەنکـە (تـەرزە) بکـات بـە وردی، خێـرا بـۆی دەردەکـەوێ کـە چ دەستێـــکی دانای بە توانا ئەو نەخشەیەی کێشاوە.. بێگومان هەست بـە (کـارجوانی)

درووستکەرەکەی دەکات پتر لەو زانایەی کە تەنها لەو ڕووەوە سەیری دەکات کە بارانەو بەستوویەتـــی، لەکاتی سەرکەوتنی پلەی سەرما.!

**فرنسیس بیکون** دەڵێت: هەندێك لە فەلسەفە مرۆڤ ڕادەكێشێ بۆ (الحاد)و بێ خوایی، بەڵام قووڵداچوون و خۆ خستنە ناوییەوە ژێری ڕائەکێشێ بۆ بڕوا هێنان.. چونکە ژێری مرۆڤ: کاتێ چەند هۆیەکی پرژوبلاو لە بەردەمیا وەستا، چەواشە دەبێت و پەی بە ئاواتی خۆی نابات، بەڵام ئەگەر بە وردی چاو هەڵخات، ئەو کاتە کۆمەڵێك هۆ پێش چاو دەکەوێ و دەزانێ ئەوان چۆن ئەڵقەیان لەیەك داوە.. ئەو کاتە بە ناچاری خۆی تەسلیمی زاتی (الله) دەکات.

**برای موسوڵمانم**: ئەوە گەواهی و شایەتیدانی کۆمەڵە زانایەك بوون کە لە زانیاریی گەردووندا ڕۆ چووبوون و گەیشتبوونە بنکی دەریا، بینیت چۆن گەواهی بە بوونی خوای تێدابوو، بەڵام گومان و دوو دڵی و بێ خوایی لەو کەسانەوە پەیدا دەبێت کە کەمێك فەلسەفەیان خوێندووە، یا تەنها توێژێکی زانیارییان لێکداوەتەوە.!

بڕوا بوون بە خوای گەورە وەنەبێ تەنها شتێکی (فیطر)ی زکماکی بێت، بەڵکو شتێکە زانیاری مرۆڤ ناچار دەکات پێی، وە بەبێ ئەم بڕوا بوونە ئەم پرسیارە کە قورئانی پیرۆز دەیکات، بێ وەڵام دەمێنێتەوە: ﴿ أَمْ خُلِقُوا۟ مِنْ غَيْرِ شَىْءٍ أَمْ هُمُ ٱلْخَٰلِقُونَ ﴿٣٥﴾ أَمْ خَلَقُوا۟ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ ۚ بَل لَّا يُوقِنُونَ ﴾ (الطور: ٣٥ — ٣٦).

واتە: بەڵێ ئاشکرایە کە لە شتێك درووستکراون، کە خۆیانیان درووست نەکردووە، وە هیچ کەسێك نە لە مان، وە نە لە پێش ئەماندا، وە نە لە دوای ئەوانەوە داوای ئەوە ناکات کە ئاسمان و زەوی ئەو درووستی کردبێت.! کەوابوو ئەی درووستکەرییان کێیە.؟

ئەم پرسیارە تەنها وەڵامێکی هەیە، مرۆڤ ناتوانێت ئەگەر وازی لێ بهێنێت، غەیری ئەو وەڵام بداتەوە کە (موشریك)ـەکان دەیان دایەوە: ﴿ وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ لَيَقُولُنَّ خَلَقَهُنَّ ٱلْعَزِيزُ ٱلْعَلِيمُ ﴾ (الزخرف: ٩)

کاتێ پرسیاری درووستکەری ئاسمانـەکان و زەوییـان لێ بکرایـە، دەیـان وت: خـوای بەتوانا و زانا درووستی کردوون.!

## پرسیاری دووەم: إلى أين المسيـــر ؟ سەر ئەنجام بۆ کوێ..؟

(مادی)یە خوا نەناسەکان بەشێوەیەك وەڵامـی ئـەم پرسـیارە دەدەنـە دەسـت ئـەو مرۆڤـەی کـە زۆر بـەڕێزو ڕێـز لێگیـــراوە، دەیهێننـە پلـەی هـەرە خـوارووی پەسـتی ئاژەڵی...!! چونکە زۆر زۆر بە سادەیەکەوە دەڵێـــن: مـرۆڤ دوای مـردن و تیاچـوون بەرەو نـەمانێکی هـەتا هـەتایی و بـێ سـەرو شـوێن مـل دەنێـت، زەوی قـوتی دەدات، هـــــەر وەك ملیۆنەها گیان لەبەرو ئاژەڵەکانی تری نقووم کردووە، وە ئەم مرۆڤـە — بەلای ئەوانەوە — جارێکی تـر نابێتـەوە بـەو تـوخم و ڕەگەزانـەی تیایـا بـووە، بـەڵکو ئەپووێ و ئەڕزێ و (با) هەر زەڕڕەیەکی دەخاتە شوێنێك ..!!

ئەم مرۆڤە پڕ لە حیکمەت و زانسـتەیە — بـەلای ئەوانـەوە — ئـەوە پاشـە ڕۆژو سـەر ئەنجامییەتی.. وەك دەڵێن: (أرحام تدفع، وأرض تبلـع.!). واتـە: زك و منالّـدان پـاڵی پێوە دەنێت و ئێقی ئەکاتەوەو زەویش قووتی دەدات..! ئیتر لەمە زیاتر نییە.!! نـە پاداشت هەیـەو نـە تۆڵـە، مرۆڤـی زۆر چـاککارو ڕێـك و پێـك لەگـەڵ مرۆڤـی خراپکـارو نامـــەردا یەکسانن، ئـەم مرۆڤـەی تـەواوی ژیـانی لـە بەرژەوەنـدی وڵات و نیشـتمان و ئاییندا بەسەر بردووە.. لەگەڵ ئەوی تردا کە مانای خەبات و وڵات و ئـایینی نـەزانیوە بـەلای ئەوانـەوە یەکســـانە.! ئـەو دوو مرۆڤـە کـە یـەکێکیان بەسـەر خـوێنی گـەلی چەوسـاوەوە ژیـاوەو، ئەویشـیان خزمـەتگوزاری کـردوون لەیـەك تـرازوودا هـەڵیان دەسەنگێنن..!!

کەوابوو جیاوازی لە نێوان ئەم مرۆڤە ژیرەدا لەگەڵ گیانلـەبەرانی تـردا چـی بێـت..؟ گوێدرێژێك و مرۆڤێك چ ڕێزێك جیایان دەکاتـەوە..؟ بۆچـی مـرۆڤ ئـەم هێـزو توانایـەی

پێی بەخشراوە، ئەم هەموو بوونەوەرە ئەپشکێنیٚ... لە کاتێکدا وەك (سەگێك) هەردووکیان بڕۆن وون بن، بێ تۆڵەو پاداشت..؟!

ماددییەکان بەم جۆرە وەڵامی ئەم پرسیارە دەدەنەوە.... بەڵام موسوڵمانی ژیرو وریا دەزانن ئەم ڕێگەیە بۆ کویٚ دەڕوات؟ بۆ ئەوە درووست نەکراون نۆکەری (دنیا) بکەن، بەڵکو دنیا بۆ ئەوان درووست کراوە.

دەزانن بۆ ژیانی هەتا هەتایی درووستکراون، دەزانن لەم دونیایەدا میوانن، بۆ ئەوە خراونەتە دنیاوە خۆیان ئامادە بکەن و هەر شتێك بە کەڵکیان بێت بۆ ئەولایان بەدەستی بێنن، وە بە پەیژەی ژیریی و کەماڵدا سەرکەون تا ئامادە بن و خۆشە بن بۆ ژیانە نەبڕاوەکەی بەهەشت، بۆ ئەوەی لێرە بە پاکی بگەڕێنەوە تا پێیان بڵێن: ﴿.. سَلَٰمٌ عَلَيۡكُمۡ طِبۡتُمۡ فَٱدۡخُلُوهَا خَٰلِدِينَ ﴾ (الزمر: ٧٣).

زۆر قورسە بۆ ژیری مرۆڤ بڕوای ببیٚ بە درووستکارێکی زاناو دانای وا، کە ئەم بوونەوەرەی بە جوانترین شێوەو بە یاسایەکی قەشەنگ و تێرو تەواوەوە دانا بێت، کەچی بڕوایشی وابێت کە بازاڕی ئەم ژیانە دەپێچرێتەوەو دادەخرێت بیٚ هەق و حیساب..!!

لەکاتێکدا کەسانێك بوون دزییان تیا کردووە، سامان و داهاتی وڵات فڕێنراوە، بە هەزارەها کوشتاری ناهەق کراوە.. بەلایەوە وابێت کە دەستی پڕ لە دادگەری خوا، تۆڵە لەو تاوانکارانە ناسێنێت، هەقی ئەو ستەم لێکراوە وەرناگرێتەوە کە بێجگە لە خوا کەسی نیە یارمەتی بدات، بەلایەوە وابێت پاداشتی ئەو مرۆڤە چاککارە نەداتەوە کە لە دنیادا گاڵتەی پێکراوە..!

ئەم جۆرە بۆچوونانە درووستکاری بوونەوەریان لێوە دوورە، هەروەك بۆچوونی ئاوا دژە لەگەڵ ئەو دادگەرییەی ئاسمان و زەوی لەسەر دانراوە..

چـەند جوانـە قورئـانی پـیرۆز پەنجـە ڕادەکێشـێ و سەرزەنشـتی کەسـانێ دەکـات بەلایانەوە وابێت کە مرۆڤ هەروا بـێ هـەق و حیسـاب — دوای مـردن — دەڕوات و هـیچ پرسـیارو وەڵامێکـی لەسـەر نیـە: ﴿ أَفَحَسِبْتُمْ أَنَّمَا خَلَقْنَاكُمْ عَبَثًا وَأَنَّكُمْ إِلَيْنَا لَا تُرْجَعُونَ ﴿١١٥﴾ فَتَعَالَى اللَّهُ الْمَلِكُ الْحَقُّ .... ﴾ (المؤمنـون: ١١٥ — ١١٦). ﴿ أَيَحْسَبُ الْإِنسَانُ أَن يُتْرَكَ سُدًى ﴾ (القيامـة: ٣٦). ﴿ أَمْ حَسِبَ الَّذِينَ اجْتَرَحُوا السَّيِّئَاتِ أَن نَّجْعَلَهُمْ كَالَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ سَوَاءً مَّحْيَاهُمْ وَمَمَاتُهُمْ ۚ سَاءَ مَا يَحْكُمُونَ ﴿٢١﴾ وَخَلَقَ اللَّهُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ بِالْحَقِّ وَلِتُجْزَىٰ كُلُّ نَفْسٍ بِمَا كَسَبَتْ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴾ (الجاثيـة: ٢١ — ٢٢). ﴿ وَمَا خَلَقْنَا السَّمَاءَ وَالْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا بَاطِلًا ۚ ذَٰلِكَ ظَنُّ الَّذِينَ كَفَرُوا ۚ فَوَيْلٌ لِّلَّذِينَ كَفَرُوا مِنَ النَّارِ ﴿٢٧﴾ أَمْ نَجْعَلُ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ كَالْمُفْسِدِينَ فِي الْأَرْضِ أَمْ نَجْعَلُ الْمُتَّقِينَ كَالْفُجَّارِ ﴾ (ص: ٢٧ — ٢٨). ﴿ وَمَا خَلَقْنَا السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا لَاعِبِينَ ﴿٣٨﴾ مَا خَلَقْنَاهُمَا إِلَّا بِالْحَقِّ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٣٩﴾ إِنَّ يَوْمَ الْفَصْلِ مِيقَاتُهُمْ أَجْمَعِينَ ﴾ (الدخان: ٣٨ — ٤٠).

## پرسیاری سێیەم: لماذا خلق الإنسان؟ بۆچی مرۆڤ درووستکراوە..؟

ئەم پرسیاری سێهەمە پێویستە مرۆڤ لە خۆی بپرسێت - دوای ئەوە کە زانیی و بۆت دەرکـەوت کـە درووسـتکراوی درووسـتکارێکەو پـەروەردەکراوی پەروەردەکارێکـە - بەسادەییەکەوە: لەم ژیانەدا بۆچی من درووستکراوم.؟ وە بۆچی مـن جیاکراومەتـەوە لە بووەکانی تـر..؟ وە کاری گرنگی مـن چییە لەم بوونەوەرەدا...؟

وەڵامی ئەم پرسیارە بەلای خاوەن بڕواکانـەوە ئامادەیـە: شـتێکی ئاشـکرایە هـەموو درووستکراوێك دەزانێ هۆی درووستکردنی درووستکراوەکەی چیە.؟ ئـەزانێ بـۆ بـەو شێـوازە درووستی کـردووە..؟ نە بە شێوازێکی تر..؟

خوای پەروەردگار کـە درووسـتکارو بەڕێوەبـەری کاروبـاری مرۆڤـە، بـا پرسـیاری لێ بکەین: ئەی پەروەردگار بۆچی ئەم ئادەمیزادەت درووست کرد.؟ تەنها بـۆ خـواردن و

خواردنەوە..؟ بۆ یاریی و گەمەو گاڵتە درووستت كرد..؟ درووستت كرد بۆ ئەوەی بەسەر زەوییدا بسووڕێتەوەو لە گژو گیای زەوی بخوات و، ئینجا ببێتەوە بە گڵ،!
ئیتر لاپەڕەی ژیانی تەواو ببێ و هیچ پرسیارو وەڵام نەبێ و بێ سەرو شوێن بڕوات..؟
ئەگەر هەر ئاوا بێ سەروو شوێن بڕوا، كەوابوو هۆی ئەم هێزو دەسەڵاتە چییە — وەك: ژیریی و، هەست و ڕۆح و گیان — پێیدراوە..؟

خوای گەورەو پەروەردگار خۆی لە قورئانی پیرۆزدا ئەم وەڵامەی داوەتەوە كە: بۆیە ئینسانی درووستی كردووە تا ببێ بە جێنشین و (خەلیفە) لەم سەر زەوییەدا، وەك لە چیرۆكی حەزرەتی (ئادەم)دا و لە سوورەتی (البقرە)دا: ئەم مەبەست و گفتوگۆی فریشتانە ڕوون بووەتەوە: ﴿وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّي جَاعِلٌ فِي ٱلْأَرْضِ خَلِيفَةً ... ﴾ (البقرة: ٣٠).

یەكەم شتێك لەم جێنشینیی و (خەلافەت)ەدا بەدی دەكرێ ئەمەیە كە: مرۆڤ پەروەردگاری خۆی بە تەواوی بناسێ و بیپەرستێ، بۆیە خۆی (جل جلالە) دەفەرموێت: ﴿ ٱللَّهُ ٱلَّذِي خَلَقَ سَبْعَ سَمَٰوَٰتٍ وَمِنَ ٱلْأَرْضِ مِثْلَهُنَّ يَتَنَزَّلُ ٱلْأَمْرُ بَيْنَهُنَّ لِتَعْلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ وَأَنَّ ٱللَّهَ قَدْ أَحَاطَ بِكُلِّ شَيْءٍ عِلْمَۢا ﴾ (الطلاق: ١٢).

لەم ئایەتە پیرۆزەوە دەركەوت كە مەبەست لە درووستكردنی ئاسمانەكان و زەوییدا ناسینی (زاتی خوایە). وە دیسانەوە لە ئایەتێكی تردا هەمان مەبەستمان بۆ ڕۆشن دەكاتەوە بە ڕوونتر: ﴿ وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ﴾ (الذاريات: ٥٦).

وە لە هەندێ فەرموودەی (قدس)ییدا هاتووە: ((عبادي إني ماخلقتكم لأستأنس بكم من وحشته، ولا لأستكثر بكم من قلة، ولا لأستعين بكم من وحدة على أمر عجزت عنه، ولا لجلب منفعة ولا لدفع مضرة، وانما خلقتكم لتعبدوني طويلا وتذكروني كثيرا وتستبحوني بكرة وأصيلا)). واتە: ئەی بەندەكانم بۆ ئەوەم درووست نەكردوون — لەبەر تەنیایی — دڵ بە ئێوە ببەستم و (ئولفەت)تان پێوە بگرم، لە كەمی ژمارەدا نەبووە تا بەهۆی ئێوەوە زۆر ببین، وە نەبێ لەبێ دەسەڵاتیدا ئێوەم درووست

کردبێت و بێ ئێوە ئیش و کارم پێ نەکرێ، لەبەر خاتری دەستکەوتنی کەڵك و سوودێك، وە یا دوور خستنەوەی زەرەرو زیانێك بوو بێت، نەخێر..!! لەبەر ئەوانە نیە، بەڵکو بۆ ئەوەیە بمپەرستن و یادم زۆر بکەنەوەو (تەسبیحات)م بۆ بکەن بەیانیان و ئێواران.

هەرکەسێك تۆزێ ورد بێتەوەو سەرنج بدات لەم بوونەوەرەدا بۆی دەردەکەوێ کە هەرچی درووستکراوە ئەژیی و ژیان بەسەر دەبات، کارمەندی غەیری خۆیەتی و خزمەت بەوی تر دەکات، ئەوەتە ئەبینین ئاو بۆ زەوی کار دەکات، زەوییش بۆ ڕووەك، ڕووەکیش بۆ ئاژەڵ، ئاژەڵیش بۆ مرۆڤ.

ئەی مرۆڤ بۆ کێ .؟ واتە ئەگەر ورد بیتەوە دەبینی هەرچی شتە — بە زنجیرە - ئەژیی و کاریش دەکات بۆ غەیری خۆیی و دیاریشە چۆن ئەژیی و بۆ کێش ئەژی، بەڵام ئادەمیزاد ماوەتەوە کە بۆ کێ کار دەکات..؟

ئەو وەڵامەی (فیطرەت)و سرووشتی ئادەمیزاد پێی ڕازی ببێت ئەمەیە کە: ئادەمیزاد بۆ ناسینی خودا درووستکراوە، بۆ خواپەرستیی، بۆ ئەوەی هەستێ بە ئەرکی سەرشانی خۆی، ڕەوان نییە — بە هیچ شێوەیەك - مرۆڤ خۆی بکات بە خزمەتگوزاری شتێکی تر لە زەوییدا، وە یا لە ئاسماندا، چونکە ئەوانە هەموویان ڕامکراون بۆیی و خزمەتگوزاری ئەو دەکەن، هەر لە خۆرەوە، هەتا مانگ و زەویی و... هتد.

کەوابوو چۆن ڕەوایە ئەم نۆکەرییان بکات، لە کاتێکدا ئەوان بۆ نۆکەری و خزمەتی ئەم درووستکراون..؟ بۆیە کڕنووش بردن بۆ خۆرو مانگ و ئەستێرەو ئاوو ڕووبارو ئاژەڵ و دارو درەخت زۆر جێگەی سەرزەنشتکردنی ئادەمیزاد بووە، بەتایبەتی قورئانی پیرۆز ئەو بابەتانە زۆر دەخاتە پێش چاوی ئادەمیزادوو دای ئەچڵەکێنێ و تانەو تەشەری لێ دەدات و پێی دەڵێ: مرۆڤ تەنها بۆ خوا درووست کراوە، بۆ پەرستنی ئەوە، نە دارو بەردو خۆرو...هتد.

پەرستنی هەرچی شتی تر هەیە — بێجگە لە زاتی خودا — هـەر هـەمووی چـاو و ڕای (شەیتان)ەو سەر لێشێواوییە.

* لایـەنی گرنگـی هـەموو پەیامـە ئاسمانییـەکان تـەنها زاتـی (الله)یـە و هـەر ئـەویش بپەرستن ﴿ ...ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنۡ إِلَٰهٍ غَيۡرُهُۥٓ.... ﴾ (الأعراف: ٦٥).

بەڵێ ئەم پەرستنی زاتی خودایە بە تـەنها، مەسـەلەیەکی کۆنـەو خـوای پـەروەردگار بەڵێنی لە یەکەم ئـادەمی وەرگرتـووەو، ئـەویش ملـی بەندایـەتی بـۆ ڕاکێشـاوەو پێـی لێنـاوە، وەك قورئـانی پـیرۆز ئەفـەرمووێت: ﴿ وَإِذۡ أَخَذَ رَبُّكَ مِنۢ بَنِيٓ ءَادَمَ مِن ظُهُورِهِمۡ ذُرِّيَّتَهُمۡ وَأَشۡهَدَهُمۡ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمۡ أَلَسۡتُ بِرَبِّكُمۡۖ قَالُواْ بَلَىٰ شَهِدۡنَآۚ أَن تَقُولُواْ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ إِنَّا كُنَّا عَنۡ هَٰذَا غَٰفِلِينَ ١٧٢ أَوۡ تَقُولُوٓاْ إِنَّمَآ أَشۡرَكَ ءَابَآؤُنَا مِن قَبۡلُ وَكُنَّا ذُرِّيَّةٗ مِّنۢ بَعۡدِهِمۡۖ أَفَتُهۡلِكُنَا بِمَا فَعَلَ ٱلۡمُبۡطِلُونَ ﴾ (الأعراف: ١٧٢ — ١٧٣).

بۆیە لە قیامەتیشدا ڕووی وتەی دەکاتـە تاوانبارەکـان و پێیـان دەفـەرمووێت: ﴿ أَلَمۡ أَعۡهَدۡ إِلَيۡكُمۡ يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ أَن لَّا تَعۡبُدُواْ ٱلشَّيۡطَٰنَۖ إِنَّهُۥ لَكُمۡ عَدُوّٞ مُّبِينٞ ٦٠ وَأَنِ ٱعۡبُدُونِيۚ هَٰذَا صِرَٰطٞ مُّسۡتَقِيمٞ ﴾ (يس: ٦٠ — ٦١). ئەی - کاتی خۆی - پێم نەوتن (شەیتان) مەپەرستن، چـونکە دوژمنتانە، پێم نەوتن: تەنها من بپەرستن، تەنها ئەمە ڕاستە.؟ ئەی بۆچی ئاوا خۆتان سەرشۆڕکرد..؟ کەوابوو ئەگەر بڵـێین: خـاڵی سـەرەکی لـە نـاردنی (پێغەمبـەر)ـەکان بەخەبەرهێنانەوەو ئاگادارکردنـەوەی ئـادەمیزاد بـووەو بـۆ ئـەوەی دوورکەوێتـەوە لـە بتپەرستیی و شتی وا، هیچ جێگـەی سەرسـوڕمان نیـە، دیسـانەوە هـەر هەموویشـیان درووشمیان هەر ئەمە بووە: ﴿ ...فَقَالَ يَٰقَوۡمِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنۡ إِلَٰهٍ غَيۡرُهُۥٓ... ﴾ (الأعراف: ٥٩).

نـووح و، هـوودو، صـالح و، ابـراهیم و، لـووط و، شـووعەیب و، هـەر پێغەمبـەرێك نێـر درابێت بۆ لای گەلێکی بێ بڕوای ملهووڕ، یەکەم قسەیان هـەر ئـەوە بـووە ﴿ ...ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنۡ إِلَٰهٍ غَيۡرُهُۥٓ.... ﴾ (الأعـــــراف: ٦٥). ﴿ وَلَقَدۡ بَعَثۡنَا فِي كُلِّ أُمَّةٖ رَّسُولًا أَنِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ وَٱجۡتَنِبُواْ ٱلطَّٰغُوتَۖ... ﴾ (النحل: ٣٦). ﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ مِن رَّسُولٍ إِلَّا نُوحِيٓ إِلَيۡهِ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ

أَنَا۠ فَٱعۡبُدُونِ ﴾ (الأنبياء: ٢٥) ﴿ إِنَّ هَٰذِهِۦٓ أُمَّتُكُمۡ أُمَّةٗ وَٰحِدَةٗ وَأَنَا۠ رَبُّكُمۡ فَٱعۡبُدُونِ ﴾ (الأنبياء: ٩٢). ﴿ وَإِنَّ هَٰذِهِۦٓ أُمَّتُكُمۡ أُمَّةٗ وَٰحِدَةٗ وَأَنَا۠ رَبُّكُمۡ فَٱتَّقُونِ ﴾ (المؤمنون: ٥٢).

## گشت فرمان پێکراوون بە خواپەرستیی

خوای گەورە فەرمانی داوە بەسەر پێغەمبەردا محمد ﷺ کە هەتا دەگەڕێتەوە خزمەت خوای میهرەبان بەردەوام بێ لەسەر خواپەرستیی و تەنها ساتێك بێ ئاگاو غافلێ نەبێت: ﴿ وَٱعۡبُدۡ رَبَّكَ حَتَّىٰ يَأۡتِيَكَ ٱلۡيَقِينُ ﴾ (الحجر: ٩٩).

بەڵێ خواپەرستی لە کۆڵی مرۆڤ ناکەوێت، هەرچەندە پلەی خواناسیی تەواو بەرز بێتەوەو هەندێ شتیشی بۆ ڕۆشن بێتەوە، چونکە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) هیچ کامێکیان لێیان نەبیسراوە بڵێن: ئیتر ئێمە خواپەرستیی و شتی وامان لەسەر نەماوە.. بۆیە خوای گەورە فەرمووی: تا دەمرن دەوامتان لەسەر خواپەرستی ببێ.

خوای پەروەردگار سەبارەت بە (عیسا) دووردی خوای لەسەر بێت دەفەرموێت: هیچ کات (عیسا) بە عەیب و نەنگی نەزانیووە کە بەندەیەك بێت بۆ خودا، وە هەروەها فریشتە نزیکەکانیش.. ﴿ لَّن يَسۡتَنكِفَ ٱلۡمَسِيحُ أَن يَكُونَ عَبۡدٗا لِّلَّهِ وَلَا ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ ٱلۡمُقَرَّبُونَۚ .. ﴾ (النساء: ١٧٢) .

کەسانێکیش درۆو ناهەقییان هەڵبەستبێت بەدەم هەر پێغەمبەرێکەوە کە گوایە وتبێتی: بم پەرستن، ئەوە لە ڕۆژی قیامەتدا خوای گەورە لێیان دەپرسێتەوەو بە توندوتیژییەوە پرسیارییان لێ دەکات و سەری شۆڕیان پێ دا دەخات، بەتایبەتی شوێنکەوتووەکانی (عیسا) پێغەمبەر (ﷺ).. ﴿ وَإِذۡ قَالَ ٱللَّهُ يَٰعِيسَى ٱبۡنَ مَرۡيَمَ ءَأَنتَ قُلۡتَ لِلنَّاسِ ٱتَّخِذُونِي وَأُمِّيَ إِلَٰهَيۡنِ مِن دُونِ ٱللَّهِۖ قَالَ سُبۡحَٰنَكَ مَا يَكُونُ لِيٓ أَنۡ أَقُولَ مَا لَيۡسَ لِي بِحَقٍّۚ ... ﴾ (المائدة: ١١٦).

کەوابوو تەواوی ئایینەکان بێ جیاوازی فەرمانیان بە خواپەرستیی و یەکتاپەرستی داوە، وە فەرمانیان داوە کە لە (طاغوت)[٥٩] دووربگرن و بەهیچ شێوەیەك گوێڕایەڵیان نەکەن. کەوابوو دەرکەوت لەم بوونەوەرەدا کە ئەرکی سەرشانی مرۆڤ چیە..؟!!

**وسبحانك اللهم وبحمدك، أشهد ان لا اله الا أنت استغفرك وأتوب إليك وآخر دعوانا أن الحمدلله رب العالمين.**

# کۆتایی



(٥٩) بەهەر پەرستراوێك دەڵێن کە لەبری خودا بپەرسترێت، وە بەهەر بەرنامەیەك دەڵێن کە لە غەیری بەرنامەی ئیسلامەوە سەرچاوەی گرتبێت، کەوابوو نابێ دوای هیچ کەسێك بکەون، نەخشەی ژیان لە هیچ ولاتێکەوە وەرگرن.

# پێرست

